سەردەم SARDAM سەردەم SARDAM سەردەم SARDAM سەردەم SARDAM

# سەردەم

سەردەم SARDAM سەردەم SARDAM سەردەم SARDAM سەردەم SARDAM

ژمارە 17
تشرینی یەکەمی 2001
ساڵی سێیەم

# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

ژمارە (17) ت.1 . 2001 - ساڵی سێیەم





ئاونیشان:

سلێمانی - فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 2129839 یان 2130347

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044 162 84 86008 - Fax: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

14665/615 و 14665/616 تاران

# سەردەم

ژمارە (16) ئابی 2001 ساڵی سێیەم

# فیکر و فەلسەفە

- مۆدێرنەی ناتەواو — بابەک ئەحمەدی
- نیچە، هایدگەر و ئێرامان — محەمەد ڕەزا جوزی
- ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتییەکان — هاشم سالح
- هاوولاتیی جیهانی یان ناسنامەی ئەورووپی — یوهان کۆنروت
- پەیوەندیی دانەبڕاوی نێوان دیموکراسی و — عەلی ڕەزا پارسا
- دەربارەی پێناسەی نەتەوەیی — ڕۆس پوول










# مۆدێرنەی ناتەواو

■ بابەك ئەحمەدی

● و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

## بەشی یەكەم

**"تەنها بە كرداری خۆ وێرانكردنە، كە ئیبلیس دەتوانێ لە خوداوەند جیابێتەوە"**

**كارل ئاتۆ ئاپل**

ئەگەر لە یەكەم فەسڵی ئەم كتێبە وردبنەوە، دەبینن كە لە نێوانیدا ئاوازی قسەكان گۆڕانی بەسەردا هاتوە، واتە شێوەی دیدی فەیلەسوفان كە بیروڕاكانیان جێگەی باسكردن بوە، بۆ مۆدێرنە گۆڕاوە. لە كاتێكدا كە دەكرێ كانت و هیگڵ -دیارە بە دوو هۆی جیاواز- بە فەیلەسوفانی مۆدێرنە ناوبەرین و ببینین كە ماركس و فیبەریش لەگەڵ هەموو ڕەخنەو گومانەكانیاندا، دواجار تەسلیمی حوكمی ڕۆژگاری تازە دەبوون، بەڵام لەگەڵ نیچەدا ڕەخنەی ڕادیكاڵ لە مۆدێرنە دەست پێدەكات و ئەم ڕەخنەكاریەش لە لایەنی جیاوازو بەپێی دیدو تێڕوانینی فەلسەفی جیاواز، تا سەدەی هەنوكە (واتە سەدەی بیست) بەردەوام بوەو بیرپارگەلێكی بەرجەستە ڕەخنەی توندیان لە ئاراستە وەرگرتنی مۆدێرن بەرەو زانست، تەكنەلۆژیا، كلتورو كۆمەڵگا، گرتوە. لەم فەسڵەدا باسی بیری فەیلەسوفێك دەكەم كە سەر بە قوتابخانەی فرانكفۆرتەو پێشڕەوی تیۆرەی ڕەخنەگرانەیە، دیدی ئەو بۆ مۆدێرنەو ئاوازی نوسینەكانی خاڵی نیە لە سەرنج و ڕەخنەگرتن، بەڵام لە دوا شیكردنەوەدا بەرگری لە بناغەو بنەماكانی دەكات و دەكرێت بوترێ كە لەم ڕووەوە تا ڕادەیەك لە ماركس دەچێ. ڕەخنەكانی ئەوەندە ناچنە پێشەوە كە بنەمای پێشكەوتنی سەردەمی تازە بخاتە ژێر گومانەوە، بەڵكو خۆشی دەڵێت كە ڕەخنە لە پێناوی لابردنی دژایەتی و ناكۆكی و كەموكوڕی و هۆكارە گرفت خوڵقێنەرەكان پێشكەش دەكات، بۆئەوەی "پرۆژەی ناتەواوی مۆدێرنە" بە ئەنجام بگات.

یۆرگن هابرماس لەو ئاوازە تاڵ و نائومێدەی كە دیالەكتیكی ڕۆشنگەری ئادۆرنۆو هۆركهایمەری لە

بەرهەمە هونەرییەکانی ئەکسپرسیونیسەکان نزیک دەکردەوە، دوورکەوتۆتەوە.. واتە لەو سەدا ئاپۆلۆتیکی (ئاخر زەمانی)ەی کە لە نووسینەکانی مامۆستاکانیدا هاتوە، دوورکەوتۆتەوەو تیۆرەی ڕەخنەگرانە سەرەتا دەگۆڕێت بۆ تێڕوانینێکی ئەبستۆلۆجیانەو پاشان لەو تێڕوانینەوە، مژدەدەری ئەقلی پەیوەندیخواز، دروست دەکات. هابرماس لە ئەقلی پەیوەندیخوازدا ڕێگەی ڕزگاریو چارە دەدۆزێتەوە، بە بڕوای ئەو چیدی قەیرانی ڕۆژگاری نوێ بنبەست یان کارەساتی چارەسەر هەڵنەگر نیە، بەڵکو هەلومەرجێکە کە هەم ئەگەری ڕزگاری دەهێنێتە ئاراوەو هەم ئەگەری گەیشتن بە کۆتایی. بەدەر لەو ڕەخنانەی کە ئەنتۆلۆجیای هایدگەری گرتوەو دوور لەو حوکمە بێ ویژدانیانەیەی لە بارەی "بناغەی فاشیستی" بوونو زەمانەوە هێناویەتیە پێشێ، تا لێرەداو تەنها لەم ڕوانگەیەوە باسەکەی لە چەمکی "چارەنووسی تەکنەلۆژی" کە مارتن هایدگەر هێناویەتیە پێشەوە، نزیک دەبێتەوە.

بیری هابرماس لە بارەی مۆدێرنەوە دەبێت بە جدی وەربگیرێ، چونکە ئەو ئەمڕۆ یەکێکە لە جدیترین ئەو کەسانەی بەرگری لە ڕۆژگاری نوێ دەکاتو هەر لەبەرئەمەش لە بواری بیرو فەلسەفەدا "دژی شەپۆل" مەلە دەکات. فکری هابرماس لە دروستبوونی "لۆژیکی وتوێژ"دا کاریگەرییەکی زۆری هەبوە، چونکە هەم لە بەرهەمەکانیدا باسی گرنگی چالاکیی دوولایەنەو ئەقلی پەیوەندیخوازی کردوەو هەم بە شێوەیەکی بەردەوام وتوێژی لەگەڵ بیریارانو فەیلەسوفاندا کردوە. لەم سێ دەیەیەی ڕابردوودا هابرماس لەگەڵ کارل پۆپەرو هانز ئالبرت لە بارەی پۆزەتیفیزمەوە، لەگەڵ نیکۆلاس لۆهمان لە بارەی "تیۆرەی سیستەمەکان"ەوە، لەگەڵ هانز گێئۆرگ گادامێردا لە بارەی زمانەوە، لەگەڵ کارل ئاتۆ ئاپلدا لە بارەی ئەخلاقەوە، لەگەڵ ژان فرانسوا لیوتاردا لە بارەی بیری پۆستمۆدێرنەوە، وتوێژی کردوەو ڕەخنەگەلێکی گرنگی لەسەر بیریارانی مۆدێرنو فەیلەسوفانی سەردەمی ئێمە نووسیوە: لە هوسرلو پیرسەوە بیگرە تا فیبەرو هایدگەر، باتایو بلانشۆ، فۆکۆو دێریدا.

ئەم خاڵەی دوایی زۆر گرنگە. دەکرێ لە هابرماسەوە گەلێک شت لە بواری بیروڕاکاندا، فێربین، بەڵام یەکێك لە گرنگترین وانەکانی، بە تایبەتی بۆ ڕۆشنبیرانی ئێرانی ئەمڕۆ، ڕەچاوکردنی ئەخلاقی وتوێژو گفتوگۆیە، هابرماس کە لە قووڵترینو جیدیترین حاڵەتدا ڕوانگەی جیاوازی لەوانی دی هەبوو، هەرگیز لە ڕێساکانی لۆژیکی وتوێژ لای نەدا. ناوو ناتۆرەیەکی ناڕەوای نەداو باسەکەی بە لاڕێدا نەبرد. ئەو بەردەوام شەرافەتی ئەخلاقی ڕۆشنبیرانەی ڕەچاودەکرد. تەنانەت حوکمەکەی لە بارەی بوونو زەمان کە بە بڕوای زۆر کەس زۆر توندەو لە دێڕەکانی سەرەوەدا بە بێویژدانانە لە قەڵەمم دا، دەرئەنجامی باسێکی ئیستدلالیو وردبوونەوەیە لە هەندێك لە خاڵەکانی کتێبەکەی فەیلەسوف. ناتوانرێ ڕستەیەکی تیا بدۆزرێتەوە کە دەلالەت لە دژایەتییەکی شەخسی بکات، یان بە مەبەستی سوکایەتیکردنو بەدناو کردنەوەوە نووسرابێت، هابرماس لە توندترین نووسینەکانیدا دژی فەیلەسوفانی پۆستمۆدێرنە، بۆ یەك ساتیش، ئەو وێنانەی دروست نەکرد کە ڕاستی بە تەواوی لای ئەوەو ئەرکی تەنها "کەشفکردنی دەستی بەرامبەر"ە. شێوەی وتوێژی هابرماس ئاشکراکەری پێشکەوتنی فکری فەلسەفەی ڕۆژئاوایە.




## چەمکی ڕەخنەگرتن
## لە بەرهەمەکانی هابرماسدا

هابرماس لە سەرەتای کاری فەلسەفیداو لە وتاری "لە نێوان فەلسەفەو زانستدا: مارکسیزم وەك ڕەخنەگرتن"دا، نووسی: *"ڕەخنەگرتن دەبێ لە نێوان فەلسەفەو زانستدا جێگە بگرێت"*. ئەو ئەم حوکمەی مارکسی قبوڵ نەکرد کە خواستو دەرئەنجامەکانی فەلسەفە تەنها کاتێك دێتە دی کە "فەلسەفە خۆی نەفی بکاتو چیدی وەك فەلسەفە نەمێنێ". بە پێچەوانەوە، بە بڕوای ئەو، ڕەخنەگرتنو زانست، ناتوانن سەربەخۆ بن لە ئەقلی فەلسەفی. ئەمە تاکە بابەتێك نیە کە هابرماس تیایدا پەنجە دەخاتە سەر دووری خۆی لە مارکسەوە، بەلام دەبێ بگوترێ ئەم دوورییە لە بەرامبەر ئەو گرنگیەدا کە بۆ کاری مارکسی دادەنێ ئەوەندە نیە. هابرماس لە زۆرێك لە گرنگترین خاڵو کێشە فەلسەفیەکانی بەرهەمەکانیداو بە تایبەتی لە بواری بیری ڕەخنەگرانەدا، پەیڕەوی مارکسە. ئەو کاری مارکسی بە بەردەوامی لۆژیکیو ئەقڵانیو هوشیارانەی نەریتی کانتو هیگڵ دەناسیو نووسیویێتی کە هەم ڕەخنەگرانی مارکسو هەم زۆربەی لایەنگرانی نەیانتوانیوە لە گرنگی تێڕوانینی ئەو بۆ ئایدیۆلۆژیا یان هۆشیاری درۆزنانە تێبگەن، واتە لە گرنگی ئەو خاڵە تێنەگەیشتوون کە مارکس ئایدۆلۆژیاو ڕەخنەگرتنی بەیەکەوە هێناوەتە پێشێو گوتوێتی کە ئەو هوشیاریەی هەولدەدات لە واقعیەتی لنگەوقوچ تێبگاتو بە تایبەتی ئەو خاڵە بناسێتەوە کە بۆچی خەلك ئەو /واقعیەتە لنگەوقوچە/ بە سەرجەم واقعیەت دەزانن، ڕەخنەگرانەیە.

کاتێك مارکس لە سەرەتای دەیەکانی *1840* واتە لە سەرەتای کاری فکریدا ڕەخنەی لە ئاینی فەلسەفیو فەلسەفی سیاسی هیگڵ گرت، لە ڕاستیدا ڕەخنەی لە دیدێکی ئایدۆلۆژی دەگرت کە واقعیەت بە لنگەوقوچ دەبینێ، دیدگایەك کە لە بیرۆکەی دەولەتەوە دەست پێدەکات، نەك لەو پەیوەندیە واقعیانەی کە دەولەت دروستدەکەن. هەروەها کاتێك مارکس کاری خۆی ناونا "ڕەخنەگرتنی ئابوری سیاسی"، ڕەخنەی لە دیدێك لە ئابوری سیاسی دەگرت کە نەك لە پەیوەندییە ڕاستەقینەکانی بەرهەمهێنانەوە، بەلکو لەو پێشگریمانانەوە دەست پێدەکات کە خۆیان بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە تاووتوێ نەکراون، بەلکو بە پێچەوانەشەوە بە شێوەیەکی دۆگمایی قبولکراون.

ئەم هاوڕێیەتیەی ڕەخنەگرتنو ئایدۆلۆژیا، ڕەگی لە تێگەیشتنی مارکسدا هەیە بۆ واقعیەت. بە بڕوای ئەو، واقعیەت بە تەنهاو بە سادەیی کەڵەکەبوون یان ڕیزبوونی ڕاستیە پەتیەکان نیە، بەلکو لەگەڵ ئەم ڕاستیانەدا "وەسفی ڕاستیەکانیش" هەیە. واتە کۆمەڵێ دراوی بابەتیە لەگەڵ ئیدراکو بەیانی ئەم دراوانەدا. دەقی نوسراو، بڕوا بەیانکراوەکان جیهانبینی یان ئیدراکی وەسفکراو ( بە زمانی ئەمڕۆ ئایدۆلۆژیا) خۆی بەشێکە لە واقع، کە بەشی خۆی فۆرمەلەی پەرەسەندنی دوایی دەکات. لێرەوە بە بڕوای مارکس ڕەخنەگرتنی واقعیو بابەتی هەبوو، لە ڕێگەی ڕەخنەگرتنی دەقەکانو کتێبەکانیشەوە مومکینە. ڕەخنەگرتنی مارکس لە فەلسەفەی سیاسی هیگڵ کە لە ڕاستیدا تاوتوێکردنی چەند

پارچەیەکی کتێبی فەلسەفی هەقی هیگڵە، ڕەخنەیەکە لە پەیوەندیە سیاسیە باڵادەستەکانی ئەڵمانیا لە دەیەکانی *1820* تا *1840*، واتە ڕەخنەگرتنە لە یاسای بنەڕەتی (قانون اساسی)و بنەمای ژیانی سیاسی ئەڵمانیا، هەروەها دۆزینەوەی سەرچاوەی ژیانی مادییە کە بێ پەیوەندی نیە بەوەی لە شکڵی پەیوەندییە یاساییە-سیاسیەکاندا دەردەکەوێت.

بە بڕوای ڕۆشنگەران، ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆژیا هەمان ڕەخنەگرتنی خراپ تێگەیشتن بوو. ئەوان دەیانگوت کە واقعێك هەیە کە بە دروستی دەرك ناکرێ، کەوابوو دروست دەرنابڕێ، کاری ئێمە ئەوەیە کە ئەم تێگەیشتن‌و دەربڕینە نادروستە ڕەخنە بکەین، واتە باش‌و خراپی لە یەك جیابکەینەوەو ڕێگا بۆ تێگەیشتنی دروستی واقع بکەینەوە. بەڵام مارکس ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆژیای ئەوەندە بە سادەیی بە "ڕەخنەگرتنی تێگەیشتنی هەڵە" نەدەزانی. هوشیاری درۆزنانە خۆی بەشێکە لە واقع، ئەم واقعیەتەش نەك هەر دەبێ دەرك بکرێ، بەڵکو دەبێ بشگۆڕدرێ، بە بڕوای هابرماس پێشینان واقعی لنگەوقوچیان بە سەرجەم واقعیەت دەناسی‌و مارکسیش تەنها بە ساتەوەختێکی واقعی دەزانی، ساتەوەختێکی کە دەبێ بگۆڕدرێت. کەوابوو ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆژیا دەبێ جدی‌و رادیکال بێت، واتە بە شێوەیەکی بنەڕەتی هەنگاوێك بێت بە ئاراستەی گۆڕینی واقعی هەبوو. ناوەڕۆکی هوشیاری /ناوەڕۆکی ئایدۆلۆژیا/ وەهم نیە، بەڵکو واقعیەو دەبێ بگۆڕدرێت. ئابوری زانانی کلاسیکیش دەربڕینی خۆیان بۆ ژیانی ئابوری "واتە /دەربڕینی/ خۆیان بۆ هێزەکانی بەرهەمهێنان کە لە قۆناغێکی تایبەتی پەرەسەندنی خۆیاندا، پەیوەندیەکی تایبەتیان پەیداکردوە لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا" بە




شکڵی دروست‌و ئیدراکی ئەو واقیعە دەزانی. لە ڕەخنەگرتنی مارکسدا ئەوە ئاشکرا دەبێت کە لە ڕێگەی تاووتوێکردنی ئەم شکڵەوە، واتە بە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانەی "تیۆرەکانی زێدەبایی" دەکرێ نەك هەر پەیوەندی هێزەکانی بەرهەمهێنان‌و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان بناسرێ، بەڵکو لەوەش گرنگتر ئەو پەیوەندیەی کە ناسراوە، قبوڵنەکرێ.

بۆ مارکس پێوەری سەرەکی ڕەخنەگرتن، پراکتیکی مرۆیی بوو. ئەم تێڕوانینە کە پێوەر لە ڕەخنەگرتندا گرنگترین خاڵە، لە بەرهەمەکانی بونیادنەرانی تیورەی ڕەخنەگرانەدا مایەوەو بوو بە میراتێك بۆ هابرماس. هورکهایمەر لە وتارەکانی دەیەی *1930*دا چەندانجار نووسی کە دەبێ بتوانرێ جیاوازی بکرێ لە نێوان ڕەخنەو گومانکاری (یان نادڵنیایی)دا. پێوەر بۆ هۆرکهایمەریش هەر پراکتیکی مرۆیی بوو. دەبێ لە ڕەخنەگرتنی ئایدۆلۆژیدا ئەوە بکرێ کە هەر بیرێك بگەڕێنرێتەوە بۆ هەلومەرجە مادی -مێژووییەکەی، واتە بۆ هەلومەرجێك کە تیایدا سەریهەڵداوەو بۆ زەمینەی واقعی ئەو بەرژەوەندیانەی لە پشتیەوە شاراوەن.

هیگڵ لە لێکۆڵینەوەی پەیوەستیەکانی هەر شتێکدا، نەیدەگەڕانەوە بۆ "هەقیقەتی ناکۆتایی"، بەڵکو هەموو شتێکی "لەو پەیوەندیەدا دەناسیەوە کە بە سیستەمی هەقیقیەوە وەریدەگرێ". واتە بە بڕوای ئەو ڕەخنەگرتن.. نەفیکردن نەبوو، بەڵکو

بلندەگی – (*Aufhe bung*) بوو. دانانی هەموو شتێك برو لە سیستەمدا. هۆرکهایمەر لەم بناغە سەرەکیەوە دەستی پێکرد، بەڵام ڕەخنەشی لە هیگڵ هەبوو. ئەو لە وتاری "لە بارەی هەقیقەتەوە" نووسی هیگڵ سەرنجی لە لایەنی دیاریکراوو وردی ئەزموون نەدەدا. ئەو هێندە سەرقاڵی سیستەم بوو کە بەرژەوەندیە مادیە زەمانیەکانی ڕەچاو نەدەکرد. هۆرکهایمەر دەیگوت کە مرۆڤەکان بە شێوەیەکی واقعی دەژین، بابەتە مادیەکان هەڵدەبژێرن، کاردەکەن، سوود لە زمان وەردەگرن و پەیوەندی کۆمەڵایەتی دروستدەکەن. هابرماس ئەمەو ئەمانە ناودەنێت "ژیانگا" کە دیارە ڕەگی لە کتێبی قەیرانی هۆسرلدا هەیە. ئەو ژیانگایە کە هەم بابەتەکانی جێی ڕەخنەیەو هەم پێوەری سەرەکی ڕەخنەگرتن دەدات بە دەستەوە: کارو چالاکیی تاکەکان.

لە درێژەی ئەم فەسڵەدا دیسان باسی ژیانگا دەکەم، بەڵام دەبێ لێرەدا بە هاوکاری ڕەخنەگرتنی هابرماس لە پۆزەتڤیزم، چەمکی ڕەخنەگرتن لای ئەو ڕوون بکەینەوە، یەکێك لە دروشمە سەرەکیەکانی ڕۆشنگەری، زانست بوو. ڕزگاری بە هۆی و لە ڕێی زانستەوە مومکین بوو. دانایی بە ڕێگەخۆشکەری ئازادی و خۆشبەختی، چەکێك دژی نەریت و پاشماوە خورافی و فکری و کۆمەڵایەتیەکانی سەدەکانی پێشوو، دەزانرا. زانست هەم دیدێکە بۆ ئایندەو هەم وێنای ئێمە بۆ ڕزگاری فۆرمەلە دەکات. دروشمی زانست و ئەقلباوەڕی و ئەو دەرئەنجامەی کە وەك خوشنودی لە بەردەم مرۆڤ و مێژوودا دایدەنا، لە چاوی بیریارێکی بیر تاڵی وەك ئادۆرنۆدا بە کەڵکی هەڵخەڵەتاندنی منداڵان دەهات و تەنانەت دروشمێکی نائەخلاقی بوو: "پاش ئەو هەموو کارەساتانەو ئەو کارەساتانەی بەڕێوەن.." ئادۆرنۆ تا ئەو جێگایە چوە پێشی کە تەنانەت شاعیرێتیش پاش ئاشڤێتز بە کارێکی نائەخلاقی و نا مومکین بزانێت، بەڵام هابرماس لێرەدا لە هاوڕێ و مامۆستاکەی دوور دەکەوێتەوە. ئەبستمۆلۆجیای ئەو (وەکو مارکس) ڕەگەزێکی ئایندەبینی تێدایە، بەو مانایەی کە بیر لە هەلومەرجێکی دی دەکاتەوەو لەو هەلومەرجەشەوە هەندێك خاڵ بۆ باسکردنی ئەمڕۆ هەڵدەهێنجێنێ. ئەویش وێنایەکی /ئەگەر نەڵێین یۆتۆپیانە، لایەنی کەم وەهم ئامێز/ی لە سەردایە بۆ ئایندەو بۆ تواناکانی مرۆڤ لە "بە مرۆڤیکردنی زانست" "ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان"و "بە ئەنجامگەیاندنی پرۆژەی ناتەواوی ڕۆشنگەری و مۆدێرنە"و دەیەوێت بە پێی خۆی بەشداری بکات لە "ئازادکردنی زانیندا لە دەست بەرژەوەندیەکان". لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕەخنەگرتنی هۆرکهایمەر لە پۆزەتڤیزم و بۆ ئەو حوکمەی کە ڕایدەگەیەنێت کە دەکرێ و دەبێ بە هۆی تیۆرەی ڕەخنەگرانەوە پێشنیارە بنەڕەتیەکانی ئەبستمۆلۆجیای زانستی "بخرێتە ژێر پرسیارەوە"و هیچ مەترسیەکی لەو پێوەرە بەهاییانە نەبێت کە لە هیوم تا کارناپەوە، فەیلەسوفانی ئەزمونگەرو ئەقڵانی و شیکاری، لە سنوری تەسکی بەرژەوەندیەکاندا زیندانی کردوە.

تام مەکارتی وەرگێڕی ئینگلیزیی چەند بەرهەمێکی گرنگی هابرماس کە خۆی کتێبێکی بایەخداری لە بارەی هابرماسەوە نووسیوە، لە سەرەتای ئەو پێشەکیەدا کە بۆ کتێبی پەیوەندی و پەرەسەندنی کۆمەڵگا *1979*، کە کۆمەڵە وتارێکی هابرماسە، نوسیوێتی: دەکرێ ئامانجی هابرماس بەم شێوەیە وەسف بکرێ: هابرماس دەیەوێت تیۆرەیەکی کۆمەڵایەتی دابمەزرێنێ کە ڕەخنەگرانە، ئەزموونگەرانەو زانستی بێت، بێنەوەی کورت بێتەوە بۆ زانستە ئەزمونگەرە –شیکاریەکان، تیۆرەکەی ئەو دەبێ فەلسەفی بە مانای ڕەخنەگرانە بێت، بێنەوەی بگۆڕێت بۆ "فەلسەفەیەکی یەکەمی" ڕەها لە پێش گریمانەو پێشنیارەکان. تیۆرەکەی مێژووییە،

بێنەوەی مێژووگەر بێت، پراکتیکیە، بە مانای ئەوەی ڕووی لە چالاکیی رزگاریخوازە، بێنەوەی ئەم چالاکیە بە مانای چاودێریکردنی تەکنەلۆژی- ئیداری بێت. هابرماس بە میتۆدێك بە دوای ئەم مەبەستەدا گەڕاوە کە هەردەم زیاتر دڵنیای کردوە لە دروستی "لۆژیکی وتوێژ" وتوێژ بە تایبەتی لە قۆناغی دوەمی کاری هابرماسدا (لە بەرهەمەکانی *1980*یدا) کە بە یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی فەلسەفەکەی دادەنرێ.

بناغەی ڕەخنەگرانەی کاری هابرماس لە بارەی پۆزەتیڤیزمەوە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر - هاوشێوەیە لەگەڵ ڕەخنەگرتنیدا لە مامۆستایانی، واتە هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ. ئەو لە ڕەدکردنەوەی دیدی نائومێدانەی دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا، بە سەرسەختیەوە بەرگری لەو تێڕوانینە کردوە کە هەرچەند ناکرێ بە تەواوی تەسلیمی ئەقڵباوەڕی ڕۆشنگەران بین، بەڵام بەکارهێنانی باوەڕهێنانیان بە ئەقڵ هاوکات بوو لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا کە بۆ ئازادی دەیانهێنایە پێشێ‌و ئەم پێکەوەبەستنەی ئەقڵ‌و ئازادیش هێشتا زیندوەو چالاکێتی (فعلیت) هەیە، زانستگەری (کە هابرماس ناوی دەنێ - *Wissenchaftlich Keit*) یان ئەوەی فەیلەسوفانی شیکاری ناویدەنێن- *Scientism*) ئەم پێکەوە گرێدانە فەرامۆش دەکات‌و وا دەزانێ کە ئەقڵی زانستی کە دواجار بەستراوە بە ئەزمونەوە، ڕەها لە بەها کۆمەڵایەتیەکان، بەرژەوەندیە چینایەتیەکان‌و دواجار سەربەخۆ لە تێگەیشتنێك بۆ ڕزگاری‌و خۆشبەختی، مومکینە. لە ئەنجامی ئەم ئاوردبینیەوەیە کە تەکنۆکراسی‌و تەکنیك سالاری *Technicism* سەریهەڵداوەو وەك باوەڕێکی تازە لە بەرامبەر زانستخوازاندا ڕاوەستاوە. هابرماس ئەو زانستخوازانە بە پۆزەتڤیزم دادەنێ کە لە تێگەیشتنی ئەو خاڵەدا کورتیان هێناوە کە نەك هەر زانست، بەڵکو زانستخوازیش دیاردەیەکی مێژوویی‌و بەرهەمی

مۆدێرنەیە. ئەو باوەڕی ئەوان بە ڕەهابوون لە بەهاکان لە کاری زالنستیدا بە "دانانی دەمامکێکی ئایدۆلۆژی بەسەر سیمای واقعدا" دادەنێ. لێرەوە هابرماس چەمکی تازەو تا ڕادەیەك نامۆی "مۆدێرنە وەك کۆمەڵێکی ئایدۆلۆژی" دەهێنێتە پێشێ.

هابرماس لە نێوان ئەقڵباوەڕی ڕۆشنگەریدا کە جارێك مۆدێرن‌و چەندانجار بە ڕەخنەگرانەی ناودەبات‌و لەگەڵ ئەقڵباوەڕی پۆزەتڤیزمی "یان دۆگمایی"دا جیاوازی دەکات. ڕۆشنگەران ئەقڵیان بە هاوڕێی پێشکەوتنی زانست‌و تەکنەلۆژیا دەزانی، بەڵام هیچ باوەڕیان بەوە نەبوو کە هەرکاتێك پێشکەوتنی تەکنیکی لەبەر هەر هۆکارێك بوەستێ خاوبێتەوە، ئەوا کارکردنی ئەقڵیش خاودەبێتەوە. ئەوان بیرۆکەی فەلسەفی ئەقڵیان بە سەرووتر لە کارکردنی زانست‌و تەکنیك دەزانی. هەر لەبەرئەمەش لە ماتریالیزمە دۆگماییەکانی ڕۆژگاری خۆیان زۆر دوور بوون، واتە لەو کەسانەی کە کارکردنی ئەقلیان بە دەرئەنجامی کارکردنی بایەلۆجیانەو میکانیکی، دەناسی. کورتکردنەوەی پۆزتڤیزمی، کە سەرجەم ڕەگەزەکانی بڕیاردان‌و ئەقڵباوەڕی مرۆڤیان ڕەوانەی "کارکردنی میکانیزم" دەکرد، ڕەگی لەم چەشنە تێڕوانینانەدا هەیەو هیچ لە تێگەیشتنی ڕۆشنگەران بۆ ئەقڵ ناچێت. ئەگەر ئایدیالیسمە ئەڵمانیەکان بە تایبەتی کانت‌و فیختە توانیان بیرۆکەی خۆیان بۆ ئەقڵ (کە هابرماس دەڵێ لە هەمان کاتدا "ئیرادەی ئەقڵ"یش بوو) لەگەڵ تێڕوانینی ڕۆشنگەراندا بگونجێنن، بەهۆی هەمان تێگەیتشنی ڕۆسۆ، ڤۆڵتێرو نوسەرانی ئەنسکلۆپیدیا بوو بۆ ئەقڵ کە نەیدەهێشت کۆمەڵێك چۆنایەتی ئەخلاقی، مرۆڤانەو ڕەخنەگرانە بچێتە دەرەوەی بواری باسکردن. رادیکالیەتی ڕۆشنگەری هاوڕێی خەباتکردن بوو لە پێناوی ئازادیەکان‌و مافە کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتیەکاندا، هیچ لێکچونێکی لەگەڵ تێڕوانینە کۆمەڵایەتیەکان بۆ

زانستخوازی میکانیکی‌و پۆزەتیڤیزمیدا نیە. لە نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەدا کە ئەم تێڕوانینانە بالادەست بوون، ئەقڵ وەك کارکردنەکانی خۆی دەرکەوت، بە وتەی نیچە ئەو ڕۆژانە، ڕۆژگاری سەرکەوتنی میتۆدی زانستی بوو بەسەر زانستدا. ڕۆژگارێك بوو کە تیایدا ئەقڵ لە هاوپەیوەستی تەکنیکی -کۆمەلایەتدا "توایەوە"و زانینی "هۆو هۆکاری (علت‌و معلول)" پەیدابوو کە تیایدا ڕەهەندی پۆزەتیڤیزمی زانستی سروشتی‌و بەکارهێنانە تەکنیکیەکان، بوو بە شتێکی غائی. جگە لە چەند پریشکێکی لە ڕەهەندی ڕەخنەگرانەی ئەقڵ نەمایەوە کە بە کەڵکی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دۆگماتیزمدا هات، هەرچەند خۆی هەندێکجار هاوکاری شتێکی کرد کە بە بڕوای هابرماس "دۆگماتیزمی ڕێژەگەری ڕەها"یە. بەهەرحاڵ ئەو "بێلایەنیە بەهاییە" لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا کە پۆزەتیڤیزمەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، لە هەنگاوی یەکەمدا لەسەر بناغەی گوێپێنەدان بەو خاڵە فۆرمەلە دەبوو کە بێلایەنی زانستی خۆی ئایدۆلۆژیایەکە کە یەکێك لە ناوەڕۆکە سەرەکیەکانی وردبونەوەیە: هەر شتێك کە "بە هۆی وردبینی زانستیەوە" قابیلی تاوتوێکردن‌و ڕوونکردنەوە نەبێت، بابەتێکی دۆگماییە.

لە نیچە بەدواوە ئەم جۆرە باوەڕە بە ئەقڵباوەڕی‌و زانستخوازی کەوتە ژێر ڕەخنەگرتن. بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش لە تیۆرەی ڕەخنەگرانەدا هەرچەند سودێکی ئەوتۆیان لە بیرەکانی نیچە وەرنەگرت، بەلام لە بەرامبەر ئەقڵباوەڕی دۆگماییدا ڕاوەستان‌و ناویان نا ئەقلی تەکنیکی یان ئامێری. هۆرکهایمەرو مارکۆزە بە پرۆژەی ڕەخنەگرتن لە ئەقلانیەتی فیبەر ئەو /ئەقلانیەتەیان/ بە ئامێرێك بۆ بەردەوامی دەسەلاتی سەرکوتکەر لەسەر سروشت‌و مرۆڤدا داناو نووسییان کە ئەگەر دەمامکی ئایدۆلۆژی ئەم تێڕوانینە هەلگرین، وەك چۆن هەیە دەیناسین، واتە وەك "ئەقڵباوەڕی ئابووری"، بەلام بە بڕوای هابرماس ئەمجۆرە ڕاکردنە لە ئەقڵئامێری دەبوە هۆی سەرهەلدانی چەمکێکی دی بۆ ئەقڵباوەڕی. هابرماس لە وتوێژکردن لەگەڵ مارکۆزە لە وتاری "تەکنیك‌و زانست وەك ئایدۆلۆژی"دا جیاوازی لە نێوان دوو جۆر /ئەقلباوەڕی/دا دەکات. یەکەمیان -کە نزیکە لە تێگەیشتنی فیبەرەوە بۆ ئەقلانیەت- بریتیە لە باوەڕهێنان بە کارکردنی ئەقڵ لە زانست‌و تەکنەلۆژیادا، واتە لە ئاستی بەکارهێنانی دراوەکان بۆ خزمەتکردنی ئامانجێکی لە پێشەوە دەستنیشانکراو (یان تا ڕادەیەك دیار)، بەلام لە بواری ئابوری‌و دەزگاییدا (چەمکێکی کەم تا زۆر چونیەك لەگەڵ چەمکی "پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان" لای مارکس) بە تێڕوانینێکی تازە بۆ ئەقڵباوەڕی دەگەین: جۆرێك لە "لەناوبردنی سنورەکانی پەیوەندی".


نیچە

هابرماس ئەم چەمکە ناو دەنێ "ئەقڵباوەڕی سیاسی" کە دواتر دەبینین کە لەسەر بناغەی مانایەکی تازە بۆ سیاسەت ڕاوەستاوە: بەکارهێنانی ئەقڵ وەك هێزێك کە بە هۆی پەیوەندیە مرۆییەکانەوە دروست دەبێ. کەوابوو جیاوازی هەیە لە نێوان ئەقڵ وەك ئیرادەی بەرژەوەندی کەوا دێتە

پێشچاو کە ئازادیخوازە، لەگەڵ ئەقڵ وەك بواری پەیوەندیو کۆمەڵایەتی کە زادەی وتوێژو گەڕانە بە دوای چارەسەری گشتیدا، یەکەمیان لە ئاستی تەکنیکدا دێتە پێشێ، واتە لە ئاستی ڕێکخستنی ئەقڵانی هێزەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی لە پێشەوە دیاریکراو، دوەم لە ئاستی پراکتیکدا دێتە پێشێ، واتە چەمکێك کە ئەخلاقیشە.

هیوم کە تاووتوێکردنی دراوە ڕاستەقینەکانو هەڵێنجانی زانستی لەو دراوانەی بە سەربەخۆ لە سیستەمی بەهاکان دەزانی، جیاوازی لە نێوان ئیدراکی زانستیو وەسفکردندا دەکرد. هۆرکهایمەر لە تیۆرەی ڕەخنەگرانەدا دەڵێت کە وەسفکردن ئەگەر بریتی بێت لە ڕێژەی دەرئەنجامی هەڵێنجانێك (ئیستنتاج) لەگەڵ هەمەکیدا، /ئەوا ئەمە/ لە کاری زانستدا ناچاریە[7]. دەبێ ئەوەمان لەبیر بێت کە لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا لافی گەردونیبوون حەشاردراوە، کە دەکەوێتە دژایەتی لەگەڵ ئیستینتاجی بەدەر لە بەهاکان. ڕەخنەکاری بە مانای جێکردنەوەی بەشە لە هەمەکیداو نکوڵیکردنە لە سەربەخۆیی بەش. چالاکیی ڕەخنەگرانە بەو مانایەی هیگڵیش بڕوای پێبوو نکوڵیەکی پەتی نیە، بەڵکو تێگەیشتنی پرۆسەی دیالەکتیکی پەیوەستبوون /و ڕادەی جیابوونەوە یان سەربەخۆیی/ دیاردەکانە.

هۆرکهایمەر هەمان ئەم خاڵەی بۆ میتۆدی هیگڵیش بەکارهێناو دەریخست کە دەکرێ چەمکی میتافیزیکی پەرەسەندنی مێژوو بە دیدێك بگۆڕێن کە تیایدا مێژوو بە پێی ڕێساکانی خۆی جوڵە ناکات، بەڵکو جوڵەی بەسترا بێت بە ئیرادەو خواستو چالاکی ئەو تاکانەوە کە وەك سوبژێکتێك (بە مانای ناسەرو بکەر) کاردەکەن. کەوابوو مێژوو نەك وەك پرۆسەیەکی هەمەکیو تۆتاڵ، یان هەقیقەتێکی لە پێشەوە دیار /و "گریمانکراو"/، بەڵکو وەك "واقعیەتێك لە حاڵەتی دروستبوونو فۆرمەلە بووندا" دێتە پێشەوە. دەرئەنجامی لۆژیکی ئەم خاڵەی دوایی ئەوەیە کە خودی "تیۆرەی ڕەخنەگرانەش" وەك پراکتیکی تاکەکانو "ساتەوەختێکی مێژوویی" فۆرمەلە دەبێتو ڕەنگە لە ڕۆژگارێکیشدا کە هەلومەرجی مادی پێویست بۆ پەیدابوونی /بیری ڕەخنەگرانە/ لە ئارادا بێت، بەهۆی زیهنیو فکریەوە لەدایك نەبێت.

لە لایەکی دیەوە هۆرکهایمەر دەریخست کە هەر واقعێکی کۆمەڵایەتی دوولایەنی هەیە، بۆ نموونە کار لە خۆیدا پێشمەرجی ڕزگاری ئامادە دەکات، بەڵام بەو شێوەیەی کە هەیە شکڵ وەردەگرێو لە حوکمی تێکچوونی پەیوەندی مرۆڤدایە بە سروشتو مرۆڤەکانی دیەوە. هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیو کلتوریش لە خۆیدا لایەنێکی قبوڵکەری تیایە بۆ سیستەمی باوو هەلومەرجو مەرجەکانی پەیدابوونی خۆی، بەڵام لە لایەکی دیەوە لایەنی ناکۆك لەگەڵ ئەویشدا (کە باسی قبوڵنەکردن دەکات) پەروەردە دەکات. هابرماس بە قبوڵکردنی ئەم خاڵە ڕەخنە لە خودی هۆرکهایمەرو مارکوزەش دەگرێت کە ئەوانیش لە ڕەخنەکردنی چەمکی ئەقڵانیەت لە فکری فیبەردا، ئەم دوولایەنیە فەرامۆشدەکەنو نەیانزانیوە کە چەمکی پەرەسەندنو پێشکەوتن کە بناغەی ئەو ڕێکخستنە ئەقڵانیەیە کە مەبەستی فیبەر بوە، دەربڕینی هەلومەرجێکی نائەقڵانیە لە سیستەمی بەرهەمهێنانو کۆمەڵگاشدا، ئەمەش خۆی لایەنێکی پێشکەوتنخوازو گرنگە لە کاری فیبەردا.

تیۆرەی ڕەخنەگرانە سەرەتا لە نێوان دەسەڵاتگرتن بەسەر سروشتی دەرەکی (تەکنەلۆژیاو پیشەسازی و..)و دەسەڵاتگرتن بەسەر سروشتی ناوەکیدا (دەسەڵات، پلەوپایەی کۆمەڵایەتی، نابەرابەریەکان..) جیاکاری نەدەکرد. هابرماس دەریخست کە ئەگەرچی ئەم دوانە پەیوەندیەکی

نزیکیان بە یەکەوە هەیە، بەلام پەیڕەوی لە یەك لۆژیك ناکەن‌و بە دلنیاییەوە یەك شت نین. لۆژیکی ئەقلانیەتی ئامێری لە لێکۆلینەوەی جۆری یەکەمی دەسەلاتەوە /واتە دەسەلات بەسەر سروشتی دەرەکیدا/ بە دەست دێت‌و دەناسرێت. ئەو میتۆدو سیستەمە ئەقلباوەڕیە ئامێرییەی کە لەسەر بناغەی پێوان، هەلێنجان، هۆو هۆکار.. ڕاوەستاوە، لە پانتایی ژیان‌و پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکاندا شێوەیەك لە بەشتبوونی پەیوەندیە مرۆڤایەتیەکان بیشاندەدات. لە لۆژیکی ژیانی کۆمەلایەتیدا پێوەرە (ضابطەهای) کاراکان پەیوەستن بە "سروشتی دەروونیەوە". لۆژیکی وتوێژ ڕێگە نادات هەمان پلەی دەربڕینی وێنەیی کە لە ئەقلباوەڕی ئامێردا حاکمە، دروست ببێ. سوبژێکت، لەبەرئەوەی لە پانتایی سروشتی دەروونیدا بوونی هەیە /و لەبەر ئەوەی بە پێی لۆژیکی ئەقلباوەڕی پەیوەندیخواز دەناسرێ/، مومکین نیە کە خۆی بە دلنیاییەوە بخاتە سەرو (یان دەرەوە)ی مێژووەوەو /لەوێوە/ لە جیهانی ئۆبژێکتەکان وردبێتەوە. سوبژێکت لە سنووری بوونیدا، واتە لە مێژوودا قابیلی ناسینە، کەوابوو بە وردبوونەوە لە زمان‌و پەیوەندی دەکرێ سەرکەوتنە نێوان زیهنیەکان، یان پەیوەندی هۆشیارانەی سۆبژێکتەکان لەگەل یەکدیداو دواجار خودهوشیاریان، بناسینەوەو تێبگەین.

تیۆرەی ڕەخنەگرانەی هابرماس دەبێتە هۆی جیابوونەوە لە بینینی تاکڕەهەندانەی زانستەکان. ئەو جیارکاریەی لە سەدەکانی حەڤدەدا لە نێوان "زانستە وردەکان"و "هونەرەکان"دا دەیانکرد، ڕەگی لە فکری ڕێنسانسدا بوو. فرانسیس بیکۆن بە سەرنجدان لەم ڕەگە میتافزیکیە، هونەرناسی، باسە تیۆلۆژی‌و ئەخلاقیەکانی لە لێکۆلینەوەی سروشت، بە جیا دەزانی. لە کاری زانستی سروشتدا کە بە بڕوای ئەو لەسەر بناغەی هەلێنجان ڕاوەستاوە، حوکمە "نازانستیەکان" بەکار نایەن. تۆماس هۆبز هەولیدا ئەوە بسەلمێنێ کە حوکمە نازانستیەکان لە ئاستی پەیوەندیە مرۆڤایەتیەکان‌و بە تایبەتی لە سیاسەتیشدا، بەکارنابەن. ڕەنگە ئەو یەکەم بیریارێك بێت کە باسی "گۆڕینی سیاسەتی بۆ زانست" کرد. هۆبز لە نزیك کردنەوەی زانستی سروشت‌و زانستی سیاسەتدا، سەودای دەستگەیشتنی هەبوو بە یاساگەل‌و زانستی سیاسەتدا، سەودای دەستگەیشتنی هەبوو بە یاساگەل‌و ئەنجامگەلێك کە بە هەمان "پتەوی یاساکانی زانستی سروشتی" بێت، هەموو ئەمانە هاوکاتبوون لەگەل ئاشکرابوونی دەستکەوتەکانی فیزیا، ماتماتیك‌و ئەستێرەکاندا. لە گالیلۆ بەدواوە بە تایبەتی پاش نیوتن، خەونی زانستیکردنی "تێگەیشتنی ئێمە بۆ پەیوەندیە کۆمەلایەتی‌و کلتوریەکان" پەرەیسەند، بەلام ڤیکۆ یەکێك بوو لەو بیریارە کەمانە کە گومانی لەم بناغە سروشتیەی زانستی مرۆیی کرد. دەستیکرد بە تاووتوێکردنی ڕەخنەگرانەی "جەوهەری ماتماتیکی" تیۆرە تازەکان‌و دواجار دژی بلاوبوونەوەی دامێنی ئەم میتۆدە بۆ سنوری "زانستی مێژوو" قسەیکرد. بە پێی باسەکەی ئەو -کە دژی سوبژێکتی دیکارتیشە- ئەمڕۆ دەکرێ ئەوە بسەلمێنرێ کە یەقینی هەندەسی دەرئەنجامی هاوبیریە لە بارەی پێناسەکانیەوە (قبولکردنی ڕێکەوتنەکان‌و ڕەمزەکانە، نەك "پەرتبوونی بیروڕاکان" بەهۆی باسکردنی ڕەخنەگرانە لە بارەیانەوە)، لێرەوە بە پێچەوانەی بڕوای بالادەستی زانستیەوە، دەبێ بلێین کە ئەو یەقینە ماتماتیکیە بە هیچ شێوەیەك ڕەنگدانەوەی واقعیەتی دەروونی سروشت نیە. ڤیکۆ تا ئەو شوێنە چوە پێشێ کە نووسی ئێمە تەنها شتگەلێك دەناسین کە خۆمان دروستمان کردوە، واتە زانین هەمان دۆزینەوەی ئامانج‌و نیەتەکانە‌و سروشت کە دروستکراوی خوداوەندە بۆ ئێمە ئاشکرا نیە،

چونكه ناتوانین پەی بە نیەتی میعمارەكە ببەین. زانستە سروشتیەكان تەنها دەتوانن چۆنێتیەكان بدۆزێتەوەو ئاشكرا بكات، بەڵام لە بارەی زمان، ئەفسانە، هونەر، خەسڵەتەكانی ژیانی كۆمەڵایەتیو بە یەك وشە لە بارەی داهێنانەكانی مرۆڤەوە، ڕێگەی پرسیارو بۆچیەكان كراوەتەوە. ناكامڵیی شیكردنەوەی زانستی لەوێدا دەزانرێ ئەگەر بمانەوێت بە هۆیەوە یاسا ئەخلاقیەكان بدۆزینەوە.

بۆ بەرگریكردن لە ڤیكۆ –و دژی ڕەفتارخوازان– دەكرێ بوترێ كە بێتوانایی زانستی سروشتی لە كۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا لەم نمونەیەدا دەزانرێ كە ویستیان لە ڕێی ئەناتۆمیكردنی مێشكەوە سازو كاری یادەوەری بزانن، یان نهێنیەكانی فێربوونی زمان بدۆزنەوە. دەكرێ جێبەجێی ئەو جیاكاریەی ڤیكۆ لە نێوان زانستە سروشتیو زانستە مرۆییەكاندا كردی، لە كاری فەیلەسوفێكی وەك هیگڵیشدا بدۆزینەوە كە دروستكەری سیستەمێكی فەلسەفی بوو. هیگڵیش جیاكاری لە نێوان ئەقڵ بە مانای پێكهاتەیی (*vernunft*)و ئەقڵی شیكاری (*Verstand*)دا دەكرد. لە سەدەی نۆزدەدا ڤیلهام دیلتای بە ڕاشكاوی جیاكاریكرد لە نێوان زانستە مرۆییەكانو زانستە سروشتیەكانداو ئەم كارەشی ڕەگی لە تێڕوانینی ڤیكۆدا بوو، هەروەها پێچەوانەی باوەڕە باڵادەستەكانی سەردەمەكەی بوو. پاش دیلتای، هینریش ریكرت، جیاكاریكرد لە نێوان "زانستە مەعنەویو ڕوحانیەكان"و "زانستە مرۆیەكانو زانستە سروشتیەكان"دا. زانستی یەكەمیان سەرنج لە چالاكیە مەبەستدارە كۆمەڵایەتیەكانو بەها بە دەزگابوەكان دەداتو دوەمیان سەرنج لە دیاردە یەكسەر ڕەها لە بەهاكان دەدات. ئەو جیاكاریەی دیلتای لە نێوان زانستە مرۆییو سروشتیەكاندا كردی، كاریگەریەكی زۆری كردە سەر لۆكاچ. ئەو لە مێژوو و هوشیاری چینایەتیدا دژی تێڕوانینی ڕەسمیو باڵادەستی ماركسیزم شتی نووسی كە بە پێی نەریتی ئەنگلز ئەو "یاسا"یانەی بە قابیلی بەكارهێنان لە بواری زانستە مرۆییو مێژووییەكاندا، دەزانی كە لە زانستە سروشتیەكانەوە بەدەست هاتوون. بەدحاڵیبوونێك كە ماركس خۆشی دەستی تێدا هەبوو.

ئەمڕۆ فەلسەفەی زانست ئەم "تێزەی جیابوونەوەی زانینەكان" ڕەد دەكاتەوە. دەزانین كە كارل پۆپەر لە ڕێگەی "بابەتەكانی دەرەوەی زانست"و "تێزی ڕەهابوون لە بەهاكان وەگ بەهایەك" بە جیاكردنەوەی زانینەكان نەگەیشت، بەڵكو ڕێگەیەكی دۆزیەوە بۆ بینینی كۆو تێگەیشتن لە پەیوەندی دەروونی زانستەكان. لە دەیەكانی ڕابردوودا تامس كۆهنو ئیمرە لاكاتۆشو پۆل فیرابەند دیوارو بەربەستی "هەردوو دەستە زانستەكەیان" شكانو ئەم خاڵە كەمتازۆر لە بواری فەلسەفەی زانستدا قبوڵكراوە كە زانست، واقعیەتەكان لەسەر بناغەی دراوەكان ڕاڤە دەكات، ڕاڤەكردنێك كە بە هەر شێوەیەك بێت، تا ڕادەیەك بە "زمانی تیۆری ڕابردووەوە" پێشكەش دەكرێو هەموو زمانێكی زانستی بە پێی ڕێساگەلێكی نمونەیی فۆرمەلە دەبێت كە "خۆی لە خۆیدا قابیلی گۆڕانە".

هابرماس لە بەرهەمە سەرەتاییەكانیدا لە بارەی ڕەخنەكاری پۆزەتڤیزمەوەو هەروەها لە بەرهەمەكانی دواییدا، بڕوای بە جیاكاریەكی تەواو لە نێوان زانستە مرۆییو زانستە سروشتیەكاندا هەبوو. بە بڕوای ئەو ئەم زانستانە بە هۆی بەرژەوەندی ئەبەستمۆلۆجی جیاوازیی خۆیانەوە، پێویستیان بە میتۆدی جیاواز هەیەو /ئەو میتۆدانەش/ فۆرمەلەیان دەكەن. زانستە مرۆییەكان بە پێچەوانەی زانستە سروشتیەكانەوە لە بواری هێرمۆنتیكدا جێگە دەگرنو دراوەكان ڕاڤە دەكەن. باسە بنەڕەتیەكانی

لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆجیانە لەو جێگەیەدا دەناسرێ کە ئێمە "چالاکی کۆمەڵایەتی" بناسین. چەمکە بنەڕەتیەکانی چالاکی کۆمەڵایەتیو میتۆدۆلۆجی زانستە مرۆییەکان، هەریەك شتن. مانای چالاکی بەهۆی ڕاڤەکردنی ڕاڤەکەرەوە دەناسرێت کە بەستراوە بە ئیدراکی ئەقڵانی ڕاڤەکەرەوە بۆ ئاراستەی چالاکی. ئەقڵانیەتی هەر چالاکیەك بەستراوە بە پەیوەندی چالاکیکەرو ڕاڤەکەرەوە، یان بە دەربڕینێکی باشتر بەستراوە بە تێگەیشتنی ئەقڵانی ئەوان بۆ ئەم پەیوەندیە. ئەگەر ئەم تێگەیتشنە ئەقڵانیە لەبەر هەر هۆیەك ڕوونەدات (/بۆ نمونە/ چالاکیکەرو ڕاڤەکەر سەر بە دوو کلتوری جیاواز بن کە جێگەی لێك تێگەیشتنو پێکەوە قسەکردنی -لایەنی کەم لە سەرەتادا- تیا نەبێتەوە) یان ناکرێ مانا لە قاڵبی بونیادێکی ماناییدا دابنرێ، یان دەبێ ڕوو بکرێتە بونیادێکی مانایی تازە، واتە مانایەکی کاملتر یان فراوانتر بۆ ئەقڵ بهێنرێتە پێشێ (مانایەکی تازە بۆ پلەکانی بەکارهێنانی توانای تێگەیشتن، قۆناغەکانی پەروەردە، هەلومەرجە زماننانسیەکانی پەروەردەو..) ئەمە کارێکە کە مرۆڤناسانو ئەنتۆلۆگەکان بە ناچاری ئەنجامی دەدەنو هەوڵی ئەوان بۆ دۆزینەوەی "زمانێکی لۆژیکیو ئەقڵانی هاوبەش"ە. بە دەربڕینێکی تر ئامانجی ئەوان بەشداریکردنە لە پەیوەندی یان چالاکی پەیوەندیدا. هابرماس تا ئێرە هاوڕێی گادامێرو ریکۆرو گەورە بیریارانی هێرمۆنتیکی مۆدێرنەو باسەکانیان قبوڵدەکات. دەزانین کە وتوێژی دوو ئاسۆیی دەلالەتی مانایی جیاواز، خاڵی ناوەندی کتێبەکەی گادامێر.. واتە هەقیقەتو میتۆدە، کتێبێك کە بە ڕێخۆشکەری هێرمۆنتیکی مۆدێرن دەژمێرێت، بەڵام جیاوازی هابرماس لەگەڵ گادامێردا لە چەمکی تەقلیدیەکانو ئەو پێشداوەریەوە دەستپێدەکات کە گادامێر بەکاریهێناوەو من لە کتێبێکی دیدا باسی جیاوازیو وتوێژی فکری ئەم دوو بیریارەم کردوە. لە لایەکی دیەوە هابرماس بە سەنجدان لە پێشینەی باسی جیاوازی زانستە مرۆییەکان لە زانستە سروشتیەکان، دەرککردنی پەیوەندیە نێوان زیهنیو مەبەستدارەکان کە لە چالاکیە دوولایەنیەکاندا دروستدەبن /و بەستراون بە بەرژەوەندیو سوودو بەهاکانەوە/ بە بەرهەمی میتۆدێك دەزانێ کە توانای تەرجومەکردنی بەرژەوەندیەکانی بۆ زمانی خۆی هەبێت. ئەڵبەتە ئەم تەرجومەکرنەش (یان ڕاڤەکردنە) خۆی لە بەهاو بەرژەوەندیەکان ڕەها نیە. بە بڕوای هابرماس لە باسەکەی گادامێرو هێرمۆنتیکی مۆدێرندا ئەم خاڵە گرنگە فەرامۆشکراوە. زمان بەدەر لە سەرجەم بەکارهێنانە پەیوندیخوازو مەعریفیەکانی، ئەوەشە کە وەك هۆکار دەسەڵاتو سەرکوتکردن کاردەکات.

هابرماس لە پێشەکیەکدا بۆ چوارەم چاپی کتێبی تیۆرەو چالاکی لە ساڵی *1971*دا گەڕایەوە بۆ پۆلێنکردنی زانست. ئەمجارە ئەو باسی دوو جۆر زانستی کرد: زانستی ئەزموونی- شیکاری کە "بە شێوەی لێکۆڵینەوەی هۆو دەرئەنجام دەزانرێو لە ڕاڤەکردنی کۆمەڵە نەریتە ماناییەکاندا" هەنو لە خۆیاندا شکڵێکی ڕەخنەکاری پەروەردە دەکەن کە "بەرژەوەندی ڕزگاری دژی بەرژەوەندیە پراکتیکیو تەکنیکیەکانی زانین، پەرە پێدەدات"و هەر لەم ڕەخنەیەدایە کە بیرکردنەوە لە خۆو خودهوشیاری مومکین دەبێت. هەم ئەم جیاکردنەوەیەو هەم بناغەی تێگەیشتنی هابرماس بۆ ئەزموونو زانست، بە ناچاری چەمکی ژیانگا دەهێنێتە پێشێ کە نزیکە لە باسەکەی هوسرلەوە. بە بڕوای هابرماس میتۆدی شیکاری -ئەزموونی بەکارهێنانی زۆر سنورداری لە دەرەوەی بواری زانستە فیزیکیو سروشتیەکان هەیە. تاقیکردنەوە لە زانستە سروشتیەکاندا بە پێی

هەلومەرجێکی وردو ڕاستەوخۆ چاودێریکراو ئەنجام دەدرێ‌و ئەو زانینەش کە پشتی پێبەستوە لەسەر بناغەی تەعمیمێکی تیۆریەوە پەرەدەسێنێ، بەلام لە زانستە مرۆییەکاندا نە ئەو ئەزموونە حسابکراوو تاقیکردنەوەو وردو نمونەییانە مومکینە، نە ئەگەری دووبارە بوونەوەی تاقیکردنەوەکان لە ئارادایە. لێرەدا جۆرێك "سنووردارێتی ئەزموون" لە ئارادایە کە خەسلەتێکی نا ورد بە هەموو جۆرە تەعمیمێکی تیۆری دەبەخشێ. "کۆمەلە ئەزموونی کەلەکەبووی پێش زانستی" کە لە ژیانگاوە سەرچاوە دەگرن، لە ڕێگەی شیکاری ئەزمونیەوە نازانرێن‌و تەرجومە ناکرێن بۆ "زمانی وێنەیی پەیوەندیە تیۆری‌و ئیستقرائیەکان". لەم حالەتەدا زانین لە بارەی ژیانگاوە بە ناچاری شکلی هێرمۆنتیکی بەخۆیەوە دەگرێت. واتە هەم پەیرەندی تیۆرە بە ئۆبژێکتەوە (واتە پەیوەندی ڕاڤەکانی تیۆریزەن بۆ جیهانی ئۆبژێکت بە ئۆبژێکتەوە) هێرمۆنتیکیەو هەم پەیوەندی تیۆرە بە ئەزمونەوە. ئەم پەیوەندیەی ژیانگا بە ڕاڤەکردنەوە، لە بیری هابرماسدا زۆر گرنگە. لە هەولداندا بۆ بەکارهێنانی میتۆدە شیکارییەکان، ئەوەی فەرامۆش دەکرێت هەر ئەم ژیانگایەیە، لە دەرئەنجامیشدا پەیوەندیە واقعیەکانی نێوان تاکەکان، بەو شێوەیەی کە مارکسیش گوتوێتی وەك پەیوەندی نێوان شتەکان دەردەکەوێت.

## *زانست‌و تەکنیك*

هۆرکهایمەر لە "تیۆرەی کلاسیکی‌و تیۆرەی ڕەخنەگرانەدا" باسی "نەریتی دیکارت" دەکات کە تیۆرەی ڕەخنەگرانە لە بەرامبەریدا ڕادەوەستێ‌و لەسەر بناغەی ڕەخنەگرتنی، بە پێوەری هلسەنگاندن دەگات، بەلام هابرماس مانایەکی تر بۆ تیۆرەی کلاسیکی دەهێنێتە ئاراوە، مانایەکی فراوانترو کۆنتر کە پێشینەکەی بە تیۆرەی ئەفلاتون دەگات. ئەم تیۆرەیە پشت ئەستورە بە تێڕوانینێکی تەکنیکی، واتە مەبەستدارەو بۆ گەیشتن بە دەرئەنجامێکی دیاریکراو دروستبوە. لە کاتێکدا /پاش/* ئەفلاتون چەمکێکی پراکتیکی بۆ تیۆرەو چالاکی لە ئارادا بوو کە لە چالاکی دوولایەنەوە دەستی پێدەکرد. دەکرێ خالی لێکچووی ئەو تێڕوانینە تەکنیکیە لە فەلسەفەی مۆدێرندا بدۆزرێتەوە. هابرماس باسی گرنگترین سیماکانی ئەم تێڕوانینە تەکنیکیە دەکات: دیکارت‌و هوسرل کە "بۆ ئەو تیۆرە بە شێوەیەکی کامڵ ناپراکتیکی بوو". بە بڕوای هابرماس فەلسەفەی مۆدێرن لەم فۆرمەلە کردنی تیۆرەیەدا "واتە تیۆرەی کلاسیکی" جێ پێهەلگری تێڕوانینی ئەفلاتونە بۆ پەیوەندی نێوان چالاکی‌و تیۆرە. تیۆرەی کلاسیکی ئەو خالە لەبەرچاو ناگرێت کە "تیۆرەی پەتی" لە ڕاستیدا لە زەمینەیەکی تایبەت‌و دیاریکراو لە پراکتیکی کۆمەلایەتی بە مانای هەمەکیدا هەیەو بێ ئاگاییشی لە جێگەی خۆی‌و ئەو ڕۆلە قبولیدەکات، هیچ گۆڕانێك لە واقعیەتدا ناکات. لەم ڕوەوە تیۆرەی ڕەخنەگرانە سەرنج لە پراکتیك دەدات. پیاچوونەوەیەك سەرقالی چالاکیە کە لە "ڕەخنەکردنی ئایدۆلۆژیا" نزیك دەبێتەوەو مل بۆ "وەهمی ئۆبژێکتیڤ لە زانستدا" نادات، بەلام ڕێك لەبەر ئەم مانایە دەکرێت کتێبەکەی هوسرل واتە *قەیران* بە "ڕەخنەگرانە" ناو ببرێ، نەك هەر لەبەرئەوەی زۆرێك لە خەیالە زانستیەکان ڕەد دەکاتەوەو هەروەها نەك لەبەرئەوەی کە باسی "خەیالی کۆتایی هاتنی فەلسەفە وەك زانستێکی ورد" دەکات، بەلکو لەو ڕوەوە کە ژیانگا بە بنەمای دانایی دەناسێ‌و سەرچاوەی تیۆرەی ڕەخنەگران بە سەرقالی بە چالاکیەوە دەژمێرێت.

بۆ هابرماس پابەندبوون بە (یان سەرقاڵبوون بە) چالاکیەوە کە هابرماس ناوی دەنێ چالاکی دوولایەنە، زۆر گرنگە، هەر ئەم چالاکیە دوولایەنەیەیە کە لە جیاوازی نێوان تەکنیکو پراکتیکدا خاڵی ناوەندی پێکدەهێنێ، چالاکییەك کە لە دیدی تەکنیکیدا گرنگ نیەو لە دیدی پراکتیکیدا، زۆر گرنگە. ئەم چالاکیە لە پەیوەندی زانستو تەکنەلۆژیاشدا دیسانەوە دێتە پێشەوە. پەیوەندی دوولایەنی زانستو تەکنەلۆژیا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەریەکەیان تەنها لەو پەیوەندیەدا مانا پەیدا بکەن. کاردانەوە واتە سەقامگیری هەریەکێکیان لە بناغەو بونیادی پراکتیکیدا. کەوابوو نابێ هیچ یەك لە زانستو تەکنیك کورت بکرێتەوە بۆ سنوری کار. کار لە باسی هابرماسدا ئەو چالاکیە ئەقڵانیەیە کە پەیوەندی هەیە بە مەبەست یان ئامانجێکەوە. رێك وەك باسەکەی فیبەر، ئەم ئەقڵانیەتەی ئاراستەی بەرەو مەبەستێکە (*Zweck rational*)، لە رۆژگاری نوێدا بەهێز بوە، بەڵام رەگی لەناو تیۆرەی کلاسیکی ئەفلاتۆندا هەیە. لێرەدا هەموو شتێك کورت دەبێتەوە بۆ رێسا تەکنیکیەکانی بەکارهێنانی زانینی ئەزمونیو زانستی ئەزمون بە بناغەی سەرەکی دانایی دادەنرێتو بەمشێوەیەش هۆشیاری بە مەبەستداو دواجار بە سوودمەند، دەزانرێت. بەڵام پراکتیك پشت ئەستورە بە چالاکیو کاردانەوە، بە ژیانی راستەقینەی مرۆڤەکان لە ژیانگاداو خۆشی /واتە پراکتیك/ تەنها لە رێگەی پەیوەندی دوولایەنەی کارتێکردنی لەسەر تیۆرەو کارتێکردنی تیۆرە لە سەری، دیسان دەناسرێتەوە. بە دەربڕینێکی تر /پراکتیك/ جۆرێك پەیوەندی کۆمەڵایەتیە کە گەر لەم لۆژیکەی خۆیدا بناسرێتەوە، تەنانەت زیاتر لە مانای پراکسیس لە بیری مارکسدا، دەڕوات. بە یەك رستە، پراکتیك "چالاکیەکی ئامانجخوازو ئامێری" نیە، بەڵکو "چالاکیەکی دوولایەنەی پەیوەندی مرۆییە".

کەوابوو گەر تەکنەلۆژیاو پەیوەندی بە زانستەوە لە ئاستی ئامێریدا بهێنینە پێشێ، لە راستیدا پەیوەندیە نێوان زیهنیەکانو نێوان مرۆڤەکانمان تا ئاستی پەیوەندیە ئۆبژێکتەکان، نزیك کردۆتەوە. لە کاتێکدا چالاکی دوولایەنە یان پراکسیسی کۆمەڵایەتی بەو مانایەی کە هابرماس هێناویەتە پێشەوە، لە هەمان پەیوەندیە وێنەییو دیارەکاندا حەشاردراوە، واتە دەکرێ لە ناویاندا نیشانەی پەیوەندیە نێوان زیهنیەکانو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بدۆزرێتەوە. لێرەدا هابرماس لە کانت دوور دەکەوێتەوە. چونکە ئەو بیری لە "هاوئاهەنگی لە پێشەوە دیاریکراو و تەنانەت دەکرێ بوترێ پێش ئەزمونی بنەما ئەخلاقیەکان"، دەکردەوە کە لە کرداردا (واتە لە رووی عەمەلیەوە) تیۆرەو چالاکی سیاسیو کۆمەڵایەتی لە ئاستی دیدێکی ئامێریو ئامانجخواز /تەکنیکی/دا، دادەنا.. لە کاتێکدا هیگڵ سەرنجی لە مەیدانی پراکتیکی ئەخلاق دەدا، واتە لە چالاکیو کاردانەوەی زیندوو، ورد دەبۆوە کە لە راستیدا لە سازوکاری زمانو بەکارهێنانی زمان وەك هۆکارێکی پەیوەندی، نزیك دەبێتەوە. هیگڵ وازی لە یاساو رێسای بەکارهێنانی تەکنیکی دەهێناو کاری بەو شێوەیەی کە هەیە، وەك چالاکیو کاردانەوەی پەیوەندیخواز (واتە چالاکی دوولایەنە)، دەهێنایە پێشێ.

هابرماس لە یەکێك لە وتارەکانی سەرەتای کاری فکری خۆیدا بەناوی "کارو چالاکی دوولایەنە: ئاماژەگەلێك بۆ فەلسەفەی رۆحی هیگڵ کە لە ڤێنا نوسراوە" *1967* باسی جیاوازی چەمکەکانی کارو چالاکی پەیوەندیخوازی لە یاداشتەکانو پەرەگرافەکاندا کردوە کە هیگڵ لە ڤێنا نوسیوێتیو پاشتریش بە کەڵکی "فینۆمۆلۆژیای رۆح" هاتبوون. بە پێی تەفسیرەکەی هابرماس هیگڵ باسی "دیالەکتیکی کاری" کردوە کە لە چوارچێوەی

پەیوەندی ئامێری نێوان مرۆڤو سروشتدا دروست دەبێو مانا پەیدادەکات. لەم دیالەکتیکەوە "هوشیاری تەکنیکی" لەدایك دەبێ کە لە ڕوانگەی چەمکسازیو زانینەوە دەرئەنجامەکەی "زانستی سروشتە"، بەلام "دیالەکتیکی چالاکی دوولایەنە" لە چوارچێوەی پەیوەندیە سوبژێکتەکاندا یان بە زمانی هیگڵ لە "پەیوەندیە ئەخلاقیەکاندا" دادەنرێ. پەیوەندیەکی کۆمەلایەتی نێوان تاکەکان کە تیایدا چەمکەکانی خێزانو کۆمەلگای مەدەنی دەورێکی سەرەکی تیا دەبینن.

بەدەر لەمە، بە بڕوای هیگڵ دیالەکتیکێکی دیو دوا دیالەکتیك "دیالەکتیکی پیشاندانەوە"یە. ئەمەیان لە چوارچێوەی خودی پەیوەندیەکانی /نێوان مرۆڤو سروشت، نێوان تاکەکانی مرۆڤ/ مانا پەیدادەکاتو تا ڕادەیەك لەو چەمکە دەچێ کە ئەرنست کاسیرەر ناوی ناوە "چالاکی ڕەمزی". جۆرێك پەیوەندی سوبژێکتە لەگەڵ خودی خۆیدا، پەیوەندیەك کە تەنها لە ڕێگەی چالاکیەکانی ئەو لە جیهانداو لە پەیوەندیەکانیدا بەوانی دیەوە، دروست دەبێت. تێگەیشتنێکی ئەزموون یان هوشیاریەکە کە لە قالبی زمانو ڕەمزەکاندا، دەردەبڕێ. "هوشیاری تیۆری"و "تیۆرەی ڕەخنەگرانە" لەم دوا دیالەکتیکەدا، لەدایك دەبن. پیشاندانەوە لێرەدا مانایەکی ڕاستەوخۆ هیگڵیانەی هەیە: ئاشکرابوون بۆ خود، ناسران بۆ خود.

چەندان ساڵ دوای ئەمە هابرماس لە باسکردنی ڕەخنەکەی مارکوزەدا لە فیبەر گەڕایەوە بۆ ئەم خاڵە (باسی ئەم ڕەخنەیەم لە فەسلی پێشوودا کرد). هابرماس لە کتێبەکەی خۆیدا: تیۆرەی چالاکی پەیوەندیخواز *1981* دەریخست کە لێکۆڵینەوەکەی مارکۆزە، بۆ چەمکی ئەقلانیەتی مەبەستدار ***Zweckrationalw*** ی فیبەر، ورد نیە. باسەکەی فیبەر لە بارەی مەبەستی پرۆسەی ئەقلانیەتەوە بە ناچاری

کورت نابێتەوە بۆ ئەقڵئامێری، بەڵکو دەشێ هەر لەو باسەوە دەست پێبکرێو بە ئەقڵی پەیوەندیخواز یان چەمکی چالاکی دوولایەنەش بگەین. واتە بە جۆرێك لە ئەقلانیەت /بگەین/ کە لەسەر بناغەی "هەوڵی بەردەوام بۆ تێگەیشتن لە یەکدی" دامەزرابێ. هابرماس درێژە بە باسەکە دەداو بیر لە بەکارهێنانی زمان دەکاتەوە، هەرچەندە ئەو مانایەی ئەو بۆ پەیوەندی هەیەتی، لە زمان زیاتر دەڕوا. دەرئەنجامی ئەم ئەقلانیەتە /واتە ئەقلانیەتی پەیوەندیخواز/ نەك پێشکەوتنی خۆویستی فەردی، بەڵکو "چالاکی تێگەیشتنی دوولایەنەیە". لێرەدا چالاکی بە ئاراستەی "بەرژەوەندی دوولایەنەو هەموانە". لەم حاڵەتەدا (کە لە ڕاستیدا بناغەی دیموکراسیەتە) ژمارەیەك پرۆسەی تەکنیکی وەك تەکنەلۆژیا، حاڵەتو ناوەڕۆکێکی تازە وەردەگرن، واتە دەگۆڕێن بۆ چالاکی پەیوەندیخواز. مارکۆزە لە ئەنجامی ڕەخنەگرتنیدا لە ئەقلانیەتی ئامێری، بەو دەرئەنجامە دەگەیشت کە "زانستو تەکنیك ئەمڕۆ ڕەوایەتی بە دەسەلات دەبەخشن". دەبێ گۆڕانکاریەکی چۆنایەتی لە "ئەقڵباوەڕی زانستیو تەکنەلۆژیدا" ڕووبداتو پرۆژە بنەڕەتیەکەیان کە "کۆمەلگای بەر خۆرە"، بگۆڕێت. زانستێکی تازەو تەکنەلۆژیایەکی تازە پێویستە کە سروشت بە ئۆبژێکتی دەسەلاتی تەکنیکی نەزانێو پەیوەندیەك لە نێوان پەیوەندیە کۆمەلایەتیو سروشتیەکاندا بدۆزێتەوە کە تازەو ڕاست بێت. هابرماس ئەم دەرئەنجامە بە سروشتگەریەکی نهێنی ئامێز دەزانێو قبوڵی ناکات. ئەو دەریدەخات کە نەخشەکەی مارکۆزە، خۆی لەسەر بناغەی بە یەك شت زانینی تەکنیكو پراکتیك، دامەزراوە. لە ڕاستیدا نەك زانستێکی تازە، بەڵکو هەلومەرجێکی تازە بۆ بەکارهێنانی زانست پێویستەو ئەم هەلومەرجەش شتێکی مومکینە. حاڵەتی تازە دەبێ بەو شێوەیە

بێت کە پراکتیك کورت نەکرێتەوە بۆ تەکنیك. تەنانەت لە ژیانی ئەمڕۆشدا دەکرێ ئەوە پیشان بدرێت کە جۆرێك "گونجانی دینامیکی" لە نێوان مرۆڤو هەلومەرجی بوونیدا هەیە کە لە چالاکی دوولایەنەدا دەردەکەوێتو سروشت دەگۆڕێت. لە بەرامبەر ئەمەدا ئەو جۆرە "گونجانە وەستاوە" هەیە کە لە دەسەلاتی ئەقلباوەڕی ئامێری، زانستی، تەکنیکیدا، فۆرمەلە دەبێتو دەبێتە هۆی پێکەوەگرێدانی تەکنیکی، ئابوری، سیاسی کە ڕەوایەتی بە دەسلاتخوازی دەدات. کەوابوو دەبێ لە لایەك لە نێوان زانینی خودو هێزی تەکنەلۆژیدا هاوسەنگیەك دروست بکەینو لە لایەکی دیش زانین لەگەڵ خواستە پراکتیکیەکاندا (کە لە ژیانگەوە دێن) هاوسەنگ بکەین. بەمشێوەیە "دەستنیشانی دەکەین کە لە چالاکیدا /بە شێوەیەکی پراکتیکی/ بۆ چ لایەكو تا کوێ دەچینە پێشێ، واتە زانینی پراکتیکی خۆمان پەرە پێدەدەین". کاتێك هابرماس دەنووسێ: "دەستنیشانی دەکەین" واتە هەموان بەشداری لە وتوێژدا دەکەینو ئەمەش زامنی هوشیاریەکی سیاسیو کۆمەلایەتی تازە دەبێت. لەم "نمونە پراکتیکیەدا" دراوە زانیاریەکان توانای ئەوەمان دەدەنێ چاودێری هێزی تەکنەلۆژیا بکەین. بەمشێوەیە بە بڕوای زۆر کەس هابرماس بە "ئەقلباوەڕی پشت ئەستور بە چالاکی دوولایەنەو پەیوەندیخواز" دەچێتە جەنگەوە لەگەڵ دیدی ئانومێدانەی ئادۆرنۆو هۆرکهایمەردا.

هابرماس بیر لە خەسلەتی پەرەسەندنی زانست دەکاتەوە. پەرەسەندنی زانستی تەکنیکی ئەوەندە لە ڕۆژگاری مۆدێرندا گرنگی پەیدا کردوە کە دەتوانین بلێین لە گوتاری مۆدێرنەدا گۆڕاوە بە خوازەیەکی پەرەسەندن لە هەر بوارێکی تردا. بە بڕوای هابرماس هەنوکە دەبێ بتوانرێ تیۆرەیەکی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی بدۆزرێتەوە کە درێژە پێدەری ئەم تێڕوانینە نەبێت. بەلام ئاشکرایە هیچ تیۆرەیەك لە بارەی پەرەسەندنی چالاکی مرۆییو پەیوەندی نێوان تاکەکان، ناتوانێ پەرەسەندنی زانستی تەکنیکی لە بەرچاو نەگرێت. خالی گرنگ ئەوەیە کە تیۆرە دەبێ لایەنی ئایدۆلۆژی ئەم پەرەسەندنە تێبگات. دۆزینەوەی سنورێکی نێوەندی کە نە لەگەڵ گوتاری ئیرادەگەرداو نە لەگەڵ گوتاری قەدەرگەریانەی تەکنەلۆژیادا بکەوێتە ململانێوە، کارێکی زۆر ئەستەمە. لە سەدەی هەژدەیەمدا پەرەسەندنی زانست مژدەی ڕزگاربوونی ئەخلاقیو سیاسی دەدا، لە سەدەی نۆزدەدا کۆمەلگای مەدەنی بە پابەندی "پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان" دەزانراو بە بڕوای زۆرێك لە بیریارانی شۆڕگێڕ، هەر ئەم پەرەسەندنە زانستیو تەکنیکیە، بنەمای ئازادی زۆرینەی کۆمەلگا دەستەبەر دەکات، بەلام لە سەدەی بیستەمدا بە تەواوی ئەوە زانرا کە ئەم پەرەسەندنە نەك هەر ڕزگاری یان نەگەری ڕزگاری لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە، بەلکو بۆتە هۆی کارەساتگەلێکی چارەسەر هەلنەگریش.

هابرماس وەك سەرەتای باس، پێشنیار دەکات کە پەرەسەندنی زانست لە گەشەکردنی تەکنیك جیابکەینەوەو نەهێلین پەیوەندی ئەم دوانە بە شێوەیەکی نادروست وەك چونیەکیەك، دەرکەوێت. زانست لە سەردەمی گالیلۆ بە دواوە، بە پێکەوە گرێدراوی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا زانرا. ئەم پێکەوە گرێدانە بە تایبەتی پاش شۆڕشی پیشەسازیو گەشانەوەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی لە سەدەی نۆزدەیەمدا، چەندانجار زیادی کرد. تا ئەو جێگەیەی کە لە ڕۆژگاری ئێمەدا لێکۆلینەوەی زاستی بەستراوە بە (تا ڕادەیەك بەستراوە بە) مانای هونەری وردبونەوەو وردبونەوە لە هونەردا. ئەم تەکنیکی بوونە (لایەنی قولی تەکنەلۆژیا) هەمان "وەك زانست دەرکەوتنە" -*Verwissens chattlichung*ی هەموو

شێوەیەکی داناییە. بە دەربڕینێکی تر فۆرمەلەبوونی دیاردە کلتورییەکان کە تەنانەت تا ڕۆژگاری فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانیا هێشتا یەك شت نەبوو لەگەڵ ئەزموونی تەکنەلۆژیدا، لە ڕۆژگاری ئێمەدا تەنانەت بۆ ساتەوەختێکیش بە جیا لەو، وێنا ناکرێت. دەکرێ بە ئاسانی ئەوە پیشان بدرێت کە گۆڕانکاری لە دەزگاکانو شێوەکانی لێکۆڵینەوەو پەروەردەکردن لە سیستەمی زانکۆییشدا، پێ بە پێی ئەم گۆڕانکاریانە شێوەیان گۆڕا.

پێکەوەگرێدانی زانستو تەکنەلۆژیا "کە دیسان دووبارەی دەکەمەوە کە هابرماس خواستاری جیابونەوەیانە" دەبێتە هۆی بایەخو پارسەنگی گرانی "بەرهەمهێنانی پیشەسازی"، بەلام لە ناوەڕۆکی خۆیدا ئەگەری دەرکەوتن "بە چەند لایەنێکی پەیوەندی" دەدات. شێوازەکانی پەیداکردنی بازاڕ، فرۆشتنو پروپاگەندە، ڕێکخستنی ڕۆژەکانی پشوودان، پەرەسەندنی بەشە تایبەتیەکان لەو بەشەداو.. ئاماژە بۆ گرنگی پەیوەندی لە ڕۆژگاری نوێدا دەکات. کلتوری ڕابردوو دەگۆڕێتو "لە ڕەگەزەکانی کلتوری یەکێتیە گەورەکانی بەرهەمهێناندا دەتوێتەوە". تێکەڵبوونی زانستو تەکنەلۆژی بە هۆی دەستێوەردانی دەوڵەت لە ژیانی ئابوریدا، زیاد دەکات. دەوڵەتیش لایەنێکی زانستی بە "دروستبوونی دەزگا سیاسیو حقوقیەکانی خۆی" دەدات، زانستێك کە دەبێ لە یەکەم هەنگاودا وەلامی یەکەم خواستە "سەربازی- پیشەسازیەکان" بداتەوە. دەرئەنجامی لۆژیکی هەموو ئەمانەش، هاتنە ئارای زانستو تەکنەلۆژیایە وەك هێزە بنەڕەتیەکانی بەرهەمهێنان. سەرەتا وا دەردەکەوێت کە کاری فکری بوە بە بناغەیەکی چالاکی ئابوری (کە ئەم خاڵە پێویستی پیاچوونەوەی بە تیۆرەی نرخی کار لە سەرمایەدا، کردوە بە شتێکی ناچاری)، لە لایەکی دیەوە بەهۆی بایەخی ڕووکەشی کاری فکریو بەرهەمی زانستیەوە، سیستەمو دەزگا زانکۆییەکان لە ژیانی "چالاك"و ئابوریدا دەتوێنەوەو /بەمشێوەیە/ پەروەردە لایەنێکی ئامێریانە وەردەگرێ. ئەم گۆڕانکاریە لە ماهیەتی پەروەردەدا مانایەکی تازە بە "ڕیفۆرمە زانکۆییەکان" دەبەخشێ.

لە بارەی پێکەوە گرێدراوی زانستو تەکنەلۆژیادا، تێڕوانینێك هەیە کە واز لەوە ناهێنێ بەردەوام باسی "کابوسی سیبرنتیك" یان کارەساتە ئینفۆرماتیەکان" بکات. بەپێی ئەم تێڕوانینە دەڵێن کە "شۆڕشی ئەلەکترۆنیکی دەیەکانی 1980" هەلگری خەسڵەتێکی مرۆڤ داماڵینە لە ژیانی بەرهەمهێنانداو پەیامی ڕۆشنبیریش دەبێ ئاشکراکردنی ئەم لایەنە بێت. بەلام ئەم ڕەخنەیە بەردەوام کالترو بێ بایەختر بوە. بە تایبەتی کە لایەنگرانی شۆڕشی ئەلەکترۆنیك پیشانیان داوە کە "چاودێریکردنی مەکینەکان" ئەستەم نیەو تەنانەت هەلومەرجی هەنوکەییان بە "سەرکەوتنی ئەقلباوەری" ناساندوە. تێڕوانینێکی کۆنەپارێز هەیە کە ئەگەری چاودێریکردن بەسەر مەکینەکانەوە بە شتێکی ئەوتۆ نازانێتو بە توندی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە پێشکەوتنی زانستی ئەم دوو دەیەیە، دروستکەری "کارەسات" بوە. بە بڕوای هابرماس، ئەرنۆلد گلن کە باسی "تێکەڵبوونی پەرەسەندنی تەکنەلۆژی بە بنەمای ژیانی کۆمەلایەتی" دەکردو لێی دەترسا، یەکێکە لە وتەبێژە جدیەکانی ئەم ئاراستەیە. ئەو باسی کۆمەڵەیەکی تێکەڵبووی زانستی، تەکنیکی، پیشەسازی، بەڕێوەبەرایەتی، سەربازی دەکاتو تا ئەو شوێنە دەچێتە پێشێ کە ڕایگەیەنێت تەکنیك "وەك سروشتی دوەمی مرۆڤ، وێرانکەری "خەسڵەتی مرۆیی ژیانو بەرهەمهێنانە"و یەکێکە لە سەرەتاترین ئەو کێشانەی دەیهێنێتە

پێشی، هاتنە سەر کاری دەوڵەتێکی موتەمەرکزو بەهێزە. تەنانەت نووسەرێکی ڕادیکاڵی وەك هوبرت مارکوزە کە ئاراستە تۆتالیتارەکانی لە پەرەسەندنی تەکنەلۆژی مۆدێرنەوە بەدەست دەهێناو دەیگەڕانەوە بۆ "دەوڵەتە لیبراڵەکان"و کۆمەڵگای تاك ڕەهەند، تا ڕادەیەك لەو دەرئەنجامە کۆنەپارێزانەوە نزیك بوو کە گڵن دەیهێنایە پێشێ.

هابرماس لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینە توندڕەوەدا ڕادەوەستێو ڕایدەگەیەنێ کە "نمونەی تەکنۆکراسی" بە هیچ شێوەیەك تاکە شێوازێکی بیرکردنەوە نیە لە پەیوەندی نێوان تەعمیمە سیاسیەکانو زانستی تەکنیکی. ئەو باسی شێوازو نمونەگەلێکی دیکە دەکات: "نمونەی بڕیاردان"، مۆدێلێك کە تا ڕادەیەك ڕەگی لەناو باسەکەی ماکس فیبەردا هەیە لە جیاوازی نێوان زانینو سیاسەت. بەپێی ئەم باسە "زانستی کردنی سیاسەت" بە شێوەیەکی کامڵ، مومکین نیە: "لە بڕیارە پراکتیکیەکاندا مومکین نیە لە هەر هەلومەرجێکی تایبەتدا، ڕەوایەتیەکی کامڵو پێویست لەسەر بناغەی ئەقڵ بەدەست بێت". لە سەرنجی یەکەمدا ئەم نمونەیە لە بەردەم "نمونەی تەکنۆکراتیدا" بێبایەخ دەردەکەوێت، چونکە پێکەوە گرێدراوی زانستو تەکنەلۆژیا، "ئایدۆلۆژیای زانستیکردنی هەموو شتێکی" دروست کردوە. بەڵام هابرماس دەڵی کە "ماکس فیبەر ڕەوتی ئەقڵبارەڕی ڕوو لە پەرەسەندنی کۆمەڵگای مۆدێرنی" بە باشی ناسیبوو. هابرماس بۆ وردتر پیشاندانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە تازەکان، نمونەی بڕیاردانی بەکارهێنا. هەنوکە کە چەندان ساڵ بەسەر باسەکەی هابرماسدا تێدەپەڕێ، بە پێی ئەزمونەکان دەیەی *1980*و بەهۆی قەیرانە ئەکۆلۆژیەکانەوە، وردتر دەتوانرێ بەرگری لە دروستی نمونەی بڕیاردان، بکرێ. ئەمە نمونەیەکە گرنگی بە "ڕەگەزی مرۆییانەی سیاسەت" دەدات، بەڵام بالاتربوونی ڕەگەزی مرۆیی بەسەر ڕەگەزی سروشتیدا، قبوڵناکات.

نمونەیەکی دی کە هابرماس هێناویەتیە پێشێ "مودێلی پراگماتیکی"یە. لەم نمونەیەدا لایەنە ئائەقلیەکانی تەعمیمەکان لە بەرامبەر لایەنە ئەقلانیەکانی تەکنەلۆژیدا ڕاناوەستێ. بە بڕوای هابرماس لە پرۆسەی دینامیکیدا هەمیشە ئەگەری ڕاستکردنەوەی بڕیارەکان هەیە. سیاسەت جێگەی پەیوەندی بەها ئەقلیدیەکان لەگەڵ توانا تازە /و تەکنەلۆژیەکاندا/. وەك چۆن پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی دی لە جەوهەری خۆیاندا لە حوکمی "پەیوەندی نێوان تاکەکانێ" هەروەاش سیاسەت دەگۆڕێت بۆ "دیالەکتیکی پەیوەندی هاوڵاتیان" بۆئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە چۆن دوو پەیوەندی "دیالەکتیکی زانینو دەسەڵات"و "دیالەکتیکی دەسەڵاتو ئیرادە" جێ دەگۆڕنەوە. ئەم نمونە پراگماتیکیە وەڵامی دوو مەسەلەی گرنگ دەداتەوە:

*1*-بە دوالیزمی ئەقڵو ئیرادە.

*2*-بە مەسەلەی پەیوەندیەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مۆدێرندا.

ئەم نمونەیە -و بە گشتی باسەکەی هابرماس لە بارەی پێشکەوتنی زانستو تەکنەلۆژی کە ئەگەرو زەمینەی چالاکیی پەیوەندیخواز دروستدەکات- ڕیخۆشکەری باسێکی دیە کە هەر لەم فەسڵەدا باسی دەکەم: سیاسەت وەك چالاکیی پەیوەندی.

## چالاکی پەیوەندیو کار

پێشتر باسی وتارەکەی هابرماس "کارو چالاکی دوولایەنە"م کردو نوسیم کە لەم وتارەدا هابرماس سەرچاوەی جیاکاری لە نێوان کارو چالاکی دوولایەنەدا، لە بەرهەمەکانی لاویی هیگڵدا دۆزیوەتەوە. لە تەفسیرەکەی هابرماسدا بۆ ئەم جیاکاریە هیگڵیە، باسەکە لەو هێڵە نزیك دەبێتەوە

که هانا ئارنێت لە نێوان کارو چالاکیدا کردوویەتی. ئارنێت لە کتێبی "هەلومەرجی مرۆییدا" *1985* دوو جۆر کار لە یەك جیا دەکاتەوە: کار یان *labot*، چالاکیەکە کە پەیوەستە بە پرۆسەی بایەلۆجیانەی لەشی مرۆڤەوە. واتە ئەم چالاکیە بە مەبەستی جێبەجێکردنی پێداویستیە جەستەییەکانەو هەلومەرج یان مەرجی مرۆیی ئەم چالاکیەش خودی ژیانە. لە بەرامبەر ئەمەدا هەوڵ یان *Work*، چالاکیەکە کە پەیوەندی بە لایەنی "ناسروشتی" بوونی مرۆڤەوە هەیە. ئەم چالاکیە بە مانای بەرهەمهێنانو دروستکردنەو هەلومەرج یان مەرجی مرۆیی ئەم چالاکیە "بوونە لە جیهاندا". خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ئەم دوانە هەردووکیان جیاوازن لە چالاکی یان – *action* کە پەیوەندی بە پەیوەندی نێوان تاکەکانی مرۆڤ، واتە بە پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوە هەیە. هەلومەرج یان مەرجی مرۆیی چالاکی بریتیە لە "بوون لەگەڵ ئەوانی دیدا"و مەرجی براوەی ژیانی سیاسیش، هەر ئەم چالاکیەیە: "لێرەوە لە زەمانی رۆمیەکاندا –کە سیاسیترین بونەوەرانێکن کە ناسیومانە– "ژیانکردن" لەگەڵ "بوون لەناو ئەوانی دیدا" هەر یەك شتە، وەك چۆن "مردن" لەگەڵ "نەبوون لەگەڵ ئەوانی دیدا" هەریەك مانای هەیە". ئەو جیاکاریەی هابرماس لە نێوان کارو چالاکی دوولایەنەدا دەیکات، وەك جیاکاریەکەی هانا ئارنێتە. کار لە ڕوانگەی هابرماسەوە هەم لە ئاستی بوونی ڕۆژانەی مرۆڤدا جێگە دەگرێتو هەم وتەزایەکی ئەبستمۆلۆجیە. دەکرێ بوترێ "کە لە یەك زەمەندا هەردووکیانە"، بەلام مرۆڤ لە "ژیانگادا" دەژی، لە دنیایەکی پێش زانستی کە تیایدا دەژیو ئەزموون دەکات. ئەم جێگە ڕاستەقینەیەی ژیانی چالاکی مرۆڤ، چەمکێکی جیاواز بۆ دروستکردنو کارکردن دەهێنێتە پێش: "ڕەگەزی مرۆڤ بەهۆی بونیادی نەگۆڕی سروشتی یان تراسندنتالیەوە پێناس ناکرێت، بەلکو بەهۆی پرۆسەی مرۆڤبوونەوە (*menschwerdung*) پێناس دەکرێت". مرۆڤبوونیش واتە وەرگرتنی ڕەهەندێکی مێژوویی و دەرگیری پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانو ژیان /لەگەڵ تاکەکانی دی مرۆڤدا/.

دەربڕینی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانو چالاکی دوولایەنە تەنها کورت نابێتەوە بۆ تێکستە تیۆریەکەی هیگڵ لە "فەلسەفەی ڕۆحی ڤێنا"دا. نمونەی باشی ئەم دەربڕینە دەتوانین لە دیالەکتیکی ئاغاو کۆیلە لە *فینمۆلۆژیای ڕۆح*دا ببینین. گرنگی ئەم تێکستە لەو کاریگەریەدایە کە کردیە سەر "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی" سەدەی نۆزدە. مارکس بە پرۆژەی "پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان" ئەگەری "تاووتوێکردنی چوارچێوەی دەزگایی کۆمەڵگای" ئامادەکرد. زاراوەی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان ئەگەرچی لە بەرهەمەکانی سەرەتای مارکسدا نەهاتوە، بەلام چەمکی بنەڕەتی ئەم زاراوەیە لەو کاریگەریەدا دەدۆزینەوە کە دیالەکتیکی ئاغاو کۆیلە کردوویەتیە سەری. مارکس، بە هێنانە ئارای ئەم چەمکە، بونیادی چالاکیە دوولایەنیە ڕەمزیەکانو "نەریتە کلتوریەکانی"، هاوکات لەگەڵ چەمکی پراکسیسدا هێنایە ئاراوە. نەریتی کلتوری وەك هابرماس دەڵێت؛ بناغەیەکە کە بونیادی دەسەڵاتو هەروەها ئایدۆلۆژی بە هۆیەوە دەناسرێنەوە. ڕەخنەکردنی ئایدۆلۆژیا بەستراوە بەم چەمکەی پراکسیسەوەو ڕەخنەکاری هەرگیز لە تێگەیشتنی "چالاکی دوولایەنە" (چالاکی پەیوەندیخواز یان پارکسیس) جیا نیە. مارکس کە لە بەشی "بت ئاسایی کاڵاکاندا" لە بەرگی یەکەمی سەرمایەدا کە نمونەکەی فویرباخ لە بارەی هەڵگەڕانەوەی دنیای ڕاستەقینەو دنیای تەماوی عیرفانی– دینی، دووبارە دەکردەوە، لەبەرئەوەی هەمان بونیادی چالاکی دوولایەنە یان پراکسیسی لەبەرچاو گرتبوو،

باسەکەی بە ئاقارێکی تازەدا برد: ڕەخنەکردنی ئایدۆلۆژیا.

بەڵام مارکس لە لێکۆڵینەوە ئابوریەکانیدا /و تەنانەت لە گرۆندریسەدا/ چالاکی هەستپێکراوی مرۆڤی ناونا "کار"و تاوتوێی جێگەکەی لە بەرهەمهێنانی مادی کۆمەڵگادا، کرد. تێڕوانینی ئەو بۆ کار بەسترابوو بە بنەمایەکی تەکنیکیەوە، دروست بە هەمان ئەو مانایەی کە هابرماس بۆ تەکنیك دەیهێنایە پێشێ. ئەمەش لە چەمکی پراکسی خاڵێکە لە ئاستی پراکتیکدا، جیایە. بە دەربڕینێکی تر کار لە ئاستی ئەقڵئامێریدا دێتە پێشەوەو تەنانەت چەمکی "کار بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی پێویست" ناتوانێ دوور لە ئەقڵئامێریو تەکنیکی، سوودی لێوەربگیرێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەش مارکس لە گرۆندریسەدا دەنووسێ کە "بۆ شیکردنەوەی چۆنێتی گەشەکردنی سەرمایە، نابێ لە کارەوە دەست پێبکەین، بەڵکو دەبێ لە نرخ یان وردتر بڵێم لە نرخی ئاڵوگۆڕی گەشەکردووەوە لە کاتی سوڕاندا، دەست پێبکەین. گواستنەوەی ڕاستەوخۆ لە کارەوە بۆ سەرمایە بە هەمان ئەندازە نامومکینە کە بمانەوێت لە نەژادە جۆراوجۆرەکانەوە بگەین بە بانقدار، یان لە سروشتەوە بگەین بە مەکینەی بوخاری". لە ڕوانگەی مارکسدا سەرمایە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتیەو کاریش قابیلی بەراوردکردنە بە سروشت. سەرمایە مانای خۆی لە ئاستی پەیوەندی نێوان تاکەکاندا پەیدا دەکات، بەڵام کار مانایەکی ڕاستەوخۆ سروشتی (یان وەك هابرماس دەڵێ: تەکنیکی) هەیە. بە پێی چەمکی کار لە نووسینەکانی مارکسدا (کە هێندە جیاواز نیە لە چەمکی کار لە بەرهەمەکانی ئابوریزانانی کلاسیکدا) تەنانەت دووبارە بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار: "لە ڕاستیدا کرێکار توانای کارکردنی خۆی بە شێوەیەکی کاتی دەفرۆشێ، چونکە هەر ئەوەندەی کەرەسە پێویستیەکانی بۆ بەرهەمهێناوەی هێزی زیندوویی خۆی دەستەبەر کرد، جارێکی دی ئامادە دەبێت بۆ ئاڵوگۆڕ". خودی مارکس لە دوەم پەرەگرافی یەکەم فەسڵی سەرمایەدا دەڵێت کە یەکەم کەسە دوو ماهیەتی جیاوازی لەکاردا دۆزیوەتەوە: کاری بەرجەستە (یان سادە)و کاری تەجریدی، یەکێکیان دروستکەری نرخی مەسرەفەو ئەویدیان دروستکەری نرخی ئاڵوگۆڕ. لە لایەکەوە هەمووکارەکان بە مانای بەکارهێنانی هێزی کاری مرۆڤە بە شێوەیەکی تایبەتو بە مەبەستێکی تایبەت، لەم سروشتی بەرجەستەبوونەی سوودمەندی کارەدایە کە نرخی مەسرەف دروست دەبێت. لە دابەشکردنەکانی تری کاردا بۆ کاری سادەو کاری ئاڵۆز، یان لە باسی کاری دەستە جەمعیدا (*Gesamtarfeiter*) چەمکی وەك "سوودمەندی"، "بەکارهێنانی هێزی کار"، "هێزی کار بە مانا فیزیۆلۆژیەکەی"، "مەبەستێکی تایبەت"،... فەرمانڕەوان. بۆ مارکس کار بە مانای ئەنتۆلۆژیای وشەکە "چالاکیەکی تەکنیکیە"و کلتور هیچ نیە جگە لە لایەنی تەکنیکی بەرهەمهێنانی مادی. بەپێی ئەم چەمکە دەکرێ هەموو شتێك کورت بکرێتەوە بۆ هەلومەرجی مادی بەرهەمهێنانی ژیانو بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی.

لە بەرامبەر تێڕوانینێکی لەم چەشنەدا دەکرێ بڵێین کە چالاکی مرۆڤ دابەش دەبێ بۆ دوو شتی جیاواز: چالاکی ئامێری یان مەبەستدارو چالاکی پەیوەندیخواز یان دوولایەنە. ناتوانرێ بە سەرنجدان لە چالاکی ئامێری، پەرەسەندنی ڕەگەزی مرۆڤ لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتی- مێژووییەوە، بناسرێتەوە دواجار دەبێ کورتی بکەینەوە بۆ چەمکی "پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان"، بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی چالاکی پەیوەندیخواز (یان بە سەرنجدان لە پراکسیس) دەکرێ بوترێ کە چەمکێکی میتۆدۆلۆجیایانەی تایبەت بە زانستی

مرۆییمان لەبەردەستدایە، چەمکێك كە لەسەر بناغەی نمونەی زانستی سروشتی دروست نەکراوە. تەنیا بە هێنانە ئارای پراکسیسە کە رزگاری مرۆڤ لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنیکی (مادیو تەکنەلۆژیدا) بە یەك شت نازانین. بە بڕوای هابرماس تیۆرانینی نائومێدانەی دوو بیریاری بەرجەستەی قوتابخانەی فرانکفۆرت، واتە ئادۆرنۆو هۆرکهایمەرو هەروەها رەخنەی مارکۆزە لە "ئەقڵباوەڕی لە دیدی ماکس فیبەردا" کە دەبێتە هۆی رەخنەکردنی ئەقڵی تەکنیکی، رەگی لە هەڵەیەکی تیۆریدایە، هەر سێ بیریارەکە جیاوازیان لە نێوان چالاکی ئامێری (کە بە هۆی رێسا تەکنیکیەکانەوە دەستنیشان دەکرێتو لەسەر بناغەی زانینی ئەزموونی راوەستاوە)و چالاکی پەیوەندیخواز یان چالاکی دوولایەنەدا بکەین کە لە راستیدا بەستراوە بە مافی یەکسانو تەواوی هەردوو لای وتوێژەکە.

هابرماس لە فەسڵی دوەمی زانینو بەرژەوەندیدا (1968) دەنووسێ کە چالاکی دوولایەنە سنوورێکی کۆمەڵایەتیە کە تیایدا خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکان، فەرمانڕەوان. ئەم خەسڵەتانە بە پێچەوانەی رێسا تەکنیکیەکانەوە بەردەوام بەستراون بە پەیوەندیو وتوێژی مرۆڤەکانەوە. مارکس وەك مێژوونووسێکی کۆمەڵایەتی (لەو فەسڵەدا کە پەیوەندی بە ماشینیزمەوە هەیە لە سەرمایەدا) سەرنجی لە رەهەندی پەیوەندیخوازو پەیوەندیەکانی نێوان مرۆڤەکان یان چالاکیە دوولایەنیەکاندا، بەڵام وەك فەیلەسوفو تیۆریزەنێکی کۆمەڵایەتی گرنگی پێنەدا. ئەو باسی رزگاری مرۆڤی تەنها لە پەیوەندیدا بە پانتایی کارو زانینی تەکنیکیدا کردو بەمشێوەیە کەوتە ناو دەهلیزی "گوتاری سروشتخوازەوە"و دیالەکتیکی چالاکی دوولایەنەی کە لە پەیوەندی رەمزیدا دەناسرێتەوە، وەلاوە نا: "شیکردنەوەی بەشی یەکەمی ئایدۆلۆژیای ئەڵمانیی پێشانیدەدا کە مارکس لە راستیدا پەیوەندیە دەروونیەکانی نێوان چالاکی دوولایەنەو کاری روون نەکردۆتەوە، بەڵکو لەژێر ناونیشانی رووناکی پراکسیسی کۆمەڵایەتیدا، چالاکی دوولایەنەی کورت کردۆتەوە بۆ کار، واتە چالاکی پەیوەندیخوازی تا ئاستی چالاکی ئامێری، دابەزاندوە". هابرماس نەك لە دوالیزمی هێزەکانی بەرهەمهێنانو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناوە، بەڵکو لە دوالیزمی کارو چالاکی دوولایەنەوە دەستی پێکردوە. زانستو زانینی تەکنیکی بەردەوام وەك کار هاتوونەتە ئاراوە، لە کاتێکدا ئەمڕۆ لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان ناتوانێ لە "رەخنەگرتن لە ئابوری سیاسیەوە" دەستپێبکات، بەڵکو دەبێ لە رێگەی "فۆرمەلە بوونی پەیوەندیە دوولایەنیەکانەوە" بچێتە پێشێ.

مارکس لە یەکەم تێزدا لە رەخنەگرتنی فویرباخدا هەوڵیدا تا هەم لە ماتریالیزمی تەقلیدی، یان وەك بەناوبانگ لە "تیۆرانینی میکانیکی بۆ ماتریالیزم" سەرووتر بڕوات، هەم سەرووتر لە ئایدیالیزم /یان وەك چۆن لە سەردەمی ئەودا لە ئارادا بوو: ئایدیالیزمی هیگڵی/:

*کەموکووڕی هەموو ماتریالیزمەکانی پێشوو (لەوانە ماتریالیزمی فویرباخ) لەوەدایە کە ئۆبژێکتی تێگەیشتنی هەستپێکراو تەنها لە شێوەی ئۆبژێکتی تێگەیشتنی هەستیدا، دێتە ئاراوە، نەك وەك چالاکی مرۆیی هەستپێکراوو پراکتیكو ناسوبژەکتیڤ. لێرەوە لە بەرامبەر بە ماتریالیزمدا، ئایدیالیزم رەهەندی چالاکی پەرەپێدا، بەڵام تەنها بە شێوەیەکی تەجریدی ئەمەی ئەنجام دا، چونکە ئایدیالیزم بە حوکمی سروشتی خۆی بابەتی چالاك ناناسێ، واتە چالاکی هەستپێکراو وەك چۆن هەیە، ناناسێ.*

لەم هەڵوێستە تایبەتیەدا کە رەخنەی لە ئایدیالیزمو ماتریالیزمی پێشوو هەیە، دەبێ چالاکی

مرۆیی (ئەگەر وەک چالاکیەکی هەستپێکراو لەبەرچاو بگیرێ) بێتە ئاراو باسکردنی کامڵ بکرێ. مارکس خۆی وایکردو لە درێژەی کارەکەیدا، چالاکی هەستپێکراو یان پراکتیکی ناونا کار: بەرهەمهێنانی مادی. لێرەوە کار بوو بە خاڵی بنەڕەتی لە شیکردنەوە چوارچێوەکانی ژیانی کۆمەلایەتی مرۆڤدا.

بەلام تێڕوانینی خۆی بۆ کار بەسترابوو بە تەکنیکەوە، واتە ئەو کاری بە مانایەکی سۆبژێکتیڤیەوە نەبەستەوە. مارکس زیاتر نزیک بوو لە ماتریالیزمە تەقلیدیەکانەوەو پەیوەندییەکی لە نێوان کارو پراکسیسدا دروست نەدەکرد. هابرماس پیشانیداوە کە لە نێوان ئەم دیدە کورتکەرەوەیەو میتۆدی دیالەکتیکیو کۆبینینی لێکۆلینەوەی بەرجەستەی دیاردە کۆمەلایەتیەکاندا کە مارکس پەیرەوی دەکرد، دژایەتیەک هەیە. بەر لە هابرماس ئەم باسە بە شێوەیەکی دیکەش کرابوو. لۆکاچ لە مێژووو هۆشیاری چینایەتدا لە رەخنەگرتنی دیالەکتیکی سروشتدا تا رادەیەکو بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ بیوە هۆی ئەو فکرەی کە زانستە سروشتیەکانو میتۆدی پۆزەتیڤیزمی وەک نمونەیەک لە بەردەم نووسەری سەرمایەدا راوەستابوون. میتۆدی زانستی سروشت، نمونەیەکی ورد بوو کە مارکس لە رەخنەگرتنی ئابوری سیاسی کلاسیکدا، پەیرەوی دەکرد. خودی مارکس لە پاشکۆیەکدا بۆ چاپی دووهەمی ئەلمانی سەرمایە، قسەیەکی بلاوکراوەی "پیک ئەوروپا" بۆ سەلماندنی ئاشکرای "ئاشکراکردنی میتۆدەکەی خۆی" دەهێنێتەوە کە تیایدا هاتوە: "مارکس بزاوتی کۆمەلایەتی وەک پرۆسەی مێژووی سروشتی تەماشا دەکات..". لە لایەکی دیەوە هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆش پیشانیان دابوو کە رەخنەگرتن لە ئەقلئامێریو بەکارهێنانی لە زانستە سروشتی- فیزیکیەکاندا "ئەو پۆلە لە زانستەکان کە لەسەر بناغەی زانستی سروشتی دروستبوون"، بێبایەخ دەکات. کەوابوو "رەخنەگرتن لە ئەقلئامێری" پەیامی بنەڕەتی بیری رەخنەگرانەیە: بیرۆکەی دەسەلات بەسەر سروشتدا، توانای راستەقینەی بزاوتی کۆمەلایەتی بەرەو ئازادی مرۆڤ، راوەستاندوە. ئادۆرنۆ جارێک بە تالیەوە گوتی کە مارکس دەیویست "کۆمەلگا بکات بەکارخانەیەکی دێو ئاسا"و هۆرکهایمەریش باسی ئایدۆلۆژیایەکی کرد کە لە بری توانەوەی کار، دەیکات بە وەزایەکی تراسندنتال لە چالاکی مرۆیی.

هابرماس دەریخست کە ئەو چالاکیە هەستپێکراوەی مارکس ئاماژەی بۆ دەکرد، خۆی بوە بە دوو بەشەوە: چالاکی ئامێریو چالاکی پەیوەندیخواز. تەنها بە هاتنە ئارای پراکسیس وەک چالاکی پەیوەندیخواز دەتوانرێ پەرەسەندنی رەگەزی مرۆڤ لە هەردوو روانگەی کۆمەلایەتی- مێژوویو تەکنەلۆژیەوە، بناسرێتەوە. پراکسیس چەمکێکە سەر بە زانستی مرۆیی کە ناتوانرێ لەسەر بناغەی نمونەی زانستی سروشتی، دروست ببێ. بە هاتنە ئارای پراکسیس، رزگاری مرۆڤ لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنیکیدا، بەیەک شت نازانین. ئەقلباوەری لە پانتایی ئەقلئامێریدا بە مانای پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانو گەشەکردنی چاودێری تەکنەلۆژیی بەسەر سروشتو دواجار گەشەکردنی شێوەکانی چاودێرییە بەسەر ژیانی کۆمەلایەتیدا. ئەقلباوەی لە پانتایی چالاکی پەیوەندیخوازدا، واتە پەیوەندی مرۆیی کە ئەو پەیوەندیانە بەجێدەهێلێ کە لەسەر بناغەی دەسەلاتن. هابرماس -وەک تامس مەک کارتی دەلێ- ئەم جیاکاریەی لە لایەکی جۆراوجۆرەوە پەرەپێدا. لە دیدێکی تراسندنتالیەوە تیۆرەی بەرژەوەندیەکانو قازانجە شەخسیەکانی هێنایە

پێشێ کە تیایدا لە نێوان بەرژەوەندیە تەکنیکیەکان‌و پێشبینی‌و چاودێریکردنی پرۆسەی بەرهەمهێنان‌و بەرژەوەندیە پراکتیکیەکان واتە پەیوەندی ئازادانەدا، جیاوازی هەیە. لە دیدی میتۆدۆلۆجیانەوە لە نێوان زانستە ئەزموونی -شیکاریەکان‌و زانستە مێژوویی- هیرمۆنتیکیەکاندا، جیاوازی هەیە. لە ئاستی کۆمەڵناسیدا. ئەو دەریخست کە وردە سیستەمەکانی چالاکی مەبەستدارو ئەقڵانی جیان لەو چوارچێوە دەزگاییەی کە تیایدا جێگیرن. دواجار لە دیدی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیەوە سەلماندی کە پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان‌و چادێریکردنی تەکنەلۆژیانە لە گەشەکردنی پەیوەندی ئازادانەو رەها لە دەسەڵات، جیاوازە.

هابرماس بە ئاسانی بەسەر چەمکی "پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان"دا تێناپەڕێ. ئەو لە کتێبی زانین‌و بەرژەوەندیدا نوسیوێتی:

*"لە پاڵ هێزەکانی بەرهەمهێناندا کە تیایدا چالاکیە ئامێریەکان هەن، تیۆرەی کۆمەڵایەتی مارکس دەگات بە لێکۆڵینەوەی چوارچێوەیەکی دەزگایی، واتە پەیوەندیەکی بەرهەمهێنان. ئەم چەمکە، بونیادی چالاکیە دوولایەنیە ڕەمزیەکان‌و دەوری نەریتی کلتوری لە پراکسیس دوورناخاتەوە. نەریتی کلتوریی تاکە بناغەیەکە کە تیایدا دەسەڵات‌و ئایدۆلۆژیا دەرک دەکرێن"*.

چالاکیە مرۆییەکان هەمیشە لە چالاکیە ئامێریەکان سەرووتر دەڕۆن. ئێمە ناتوانین کاریکەین‌و بێهودە بین بەرامبەر بە چوارچێوەی دەزگایی یان ئەوەی پێی دەگوترێت نەریتەکان‌و ڕافەکردنە ڕەمزیەکان. کاتێك کاردەکەین لە سنورێکی ڕێکەوتننامەییدا کاردەکەین. کەوابوو پراکسیس کورت نابێتەوە بۆ کاری تەکنیکی. پراکسیس هاوڕێ یان لەناو ئەو چوارچێوە دەزگاییەدایە.

** لە ڕاستیدا لەکتێبەکەدا هاتوە؛ {پاش} ئەفلاتون، بەڵام من هەست ئەکەم {پێش} ئەفلاتون بێت‌و ئەمە هەڵەی چاپ بێت. (و.ك)*

# نیچە، هایدگەرو تێڕامان

■ نووسینی: محمد رەزا جوزی

● و. لە فارسییەوە: رێکەوت حەمە

هایدگەر دەڵێت: لە رۆژئاوادا قسەو باسێکی زۆر سەیر لەبارەی نیچەوە دەکرێت. هەندێك بە شێت و شەیداییەوە ستایشی دەکەن و هەندێکی تر بە تاوانبارو نازناوی ناشرین سوکایەتی پێدەکەن و هەندێکی تریش کە تەنها زانیاری گشتیان لە فەلسەفەی نیچەدا هەیەو بێئەوەی کە قوڵ ببنەوەو بێ جیاوازی کردن وەکو رێبوارێك بە کەناریدا تێدەپەڕن. بەڵام قسەی ئەم سێ جۆرە، بە باش و خراپەوە پەیوەندیان بە نیچەوە نییە. هەروەها نیچەش پێشوەخت چارەنووسێکی وەهای بینیوەتەوە کاتێك کە لە زمانی زەردەشتەوە دەنووسێت: "ئەوان هەموو دەربارەی من قسەدەکەن، بەڵام کەسێ بیر لە من ناکاتەوە". چۆن بیر لەو بکەنەوە هەروەکو هایدگەر دەڵێت: "بێ بیری ئەمڕۆ کە دیدەنیکەرێکی نەناس و نادیارە، لە هەموو جێگایەکدا دێت و دەچێت و لە پشت ژووری هەموو قەڵەم بەدەستان و قسەکەرانەوە بە چاوەڕوانییەوە وەستاوە".

نووسینەکانی هایدگەر گەواهی دەرن لەسەر لایەنگری زۆر لەم ماوڵاتییە تەنهایەی خۆی، درێژترین و گەورەترین کتێبی خۆی کە لە چوار بەرگدا کۆکراوەتەوە، بۆ لێکدانەوەو راڤەکردنی بیروڕاکانی نیچە تایبەت کردووەو ساڵانێکیش لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا نیچەی وتووەتەوە.

ئەگەر وشەی (خۆشەویستی) بەکاربهێنم و بڵێم هایدگەر خۆشەویستی بۆ نیچە هەبووە، ئەمە بەو مانایە نییە کە هایدگەر خواست و مەبەستی خۆی لە نیچەوە هێنابێت، یان راڤەکەرو لاسایی کەرەوەی پەیڕەوی نیچە بووە، چونکە نیچە هۆگرە بە جیهانی میتافیزیکەوەو مەبەستی بوو لەم جیهانەدا نیشتە بێت، بەڵام هایدگەر لەم جێگە باوەدا دوو هەزار ساڵە دوورکەوتوەتەوەو قیبلەگای تری هەیە کە لێرەدا جێگای باسکردنی نابێتەوە.

خۆشەویستی ئەو بۆ نیچە بەهۆی قووڵبونەوەی ئەوەوەیە لە مێژووی رۆژئاوادا. لە بنەڕەتدا خۆشەویستی بیریارە گەورەکان بە یەکترییەوە بەوە

دانانرێت کە ئەوان لە بابەتدا (یەك گوتاری) بووبێتن، بەڵکو ئەم خۆشەویستیە دەگەڕێتەوە بۆ هاوگوتاریی و جدیی بوونیان. لە مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوادا کەسانێکی روکەش و بیرورا شێواویش هەبوون کە وەکو مۆمێکی نیوە گیان، بەڵام وەك (پلیتە) پڕ دوکەڵ کە بیریان نە راستێتی ڕۆشنکردوەتەوەو نە بوونەتە مایەی هۆشیاری بە رابوردو و ئایندە.

نیچە ناوی ئەم چەشنە کەسانە بە "رواڵەت قووڵ" دەبات کە جیاوازیان لەگەڵ بیریارانی قووڵدا لەوەدایە کە قووڵ ڕۆچوانی راستەقینە "خۆیان دەزانن کە قووڵن و بۆ ئاشکرایی و ڕۆشنی هەوڵدەدەن، بەڵام ئەوان کە دەخوازن خۆیان بۆ خەڵکی سادە (عەوام) قووڵ نیشان بدەن، هەوڵیان بۆ تاریکی و نادیارییە، چونکە خەڵکی سادە بڕوایان وایە ئەگەر نەتوانن بە بناغەی شت بگەن، کە ئەو شتە بۆ خۆی قووڵە. ئەم جۆرە کەسانە زۆر لاوازو ترسنۆکن و لە چوونە ناو قووڵاییەکان هەڵدێن".*

لە روانگەی هایدگەرەوە نیچە بیریارێکی قووڵە، کە بە چاکی دەزانێت فەلسەفە مانای چیەو زانینێکی زۆر دەگمەن و بەنرخی هەبووە، هەروەکو نیچە خۆیشی دەڵێت: "فەیلەسوف روەکێکی دەگمەن و ناوازەیە".

هەر بیریارێکی گەورە تەنها "یەك بیر"ی هەیەو هەمیشە بەهەمان یەك بیرییەوە تێدەفکرێت. مەبەست لە "هەمان" ئەوە نییە کە ئەوان یەك شت دەڵێنەوە، بەڵکو یەك پرسیاریان هەیە کە بریتیە لەوەی "مەوجود چیە؟" ئەم پرسیارە، پرسیارێکی جێگیرو هەمیشەیی میتافیزیکە، میتافیزیك هەمیشە ئەم پرسیارە لە مەوجود دەپرسێ. واتە لە مەوجودی رەها یان گشتی دەپرسێ و لەهەمان کاتدا پرسیاری لەم جۆرە دەوڵەمەندو فراوان کە کۆن و خامۆش نابێت لەلایەن بیریارانی گەورەوە کە ژمارەیان هەمیشە کەمە کراوەو وەڵامیان داوەتەوە. نیچەش یەکێکە لەم بیریارانەو لەبارەی بنەڕەتێتی خودو راستێتی مەوجودەوە پرسیاری کردووەو وەڵامی داوەتەوە. وەڵامەکەشی بریتیە لەوەی کە مەوجود "ئیرادەی هێز"ە. ئیرادەی هێز ناونیشانی دوایین کتێبی نیچەیە کە گرنگترین بابەتی بیرکردنەوەی تێدایە.

(ئیرادەی هێز) سەرنجی تایبەتی نیچە نیە، بەڵکو بە وتەی هایدگەر (بڕیاردانە بەسەر مێژووی ڕۆژئاوادا) کە لە زمانی نیچەوە خراوەتەڕوو. هەروەکو دەزانین ئەم کتێبە تایبەتە بە بیری هەشت ساڵەی کۆتایی نیچەوە، بەڵام نیچە وەکو تەواوکردن نەیتوانی تەواوی بکات. ئەوەی کە بەناوی "ئیرادەی هێز"ەوە لەبەردەستدایە، تەنها سەردێرو پێشنیارە گشتییەکانە، بەڵام ئەم کتێبە ناونیشانێکی تریشی هەیە کە لاوەکییە، ئەویش "هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنەوەی نوێی هەموو بەهاکان"ە.

پێشنیاری ریشەیی و بنەمایی لە کتێبی "ئیرادەی هێز"دا، هەروەکو نیچە خۆی نووسیویەتی بەم شێوەیەیە:

## *ئیرادەی هێز*

هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنەوەی نوێی هەموو بەهاکان

**کتێبی یەکەم:** هیچگەرایی ئەورووپایی

**کتێبی دووەم:** رەخنە لە بەها بەرزە کۆنەکان

**کتێبی سێهەم:** بنەمای بەها نوێیەکان

**کتێبی چوارەم:** رێکخستن و چاککردنی بنەچە

مەبەستی نیچە لە "بنەمای بەها نوێیەکان" بریتیە لە داڕشتنەوەی بنچینەی بونیادی بەهاکان. لە روانگەی نیچەوە کارێکی لەم جۆرە بە فەلسەفە نەبێت ناکرێت. فەلسەفە بۆ نیچە بنەمای جۆرە بەها گوزارییەکە، واتە فەلسەفە دامەزرێنەری بەرزترین بەهایە کە دەرخەرو لێکۆڵەری مەوجودەو هەموو




مەوجودەکان پێویستیان بە بناغەی ئەم هەڵسەنگاندنە هەیە. بەرزترین بەها بریتیە لەو بەهایەی کە بناغەی بوونی بوونەوەرەکان پێکدەهێنێت. لەلایەکی ترەوە مەبەستی نیچە لە "بەهاگەلی نوێ" دانانی بەهاگەلی نوێیە کە نەك هەر جیاوازو پێچەوانەی بەهاگەلە کۆنەکانە، بەڵکو نەیاریشیانەو دەبێتە دەستنیشانکەری "ئاینده"ی مرۆڤ. لێرەشەوە نیچە باسی رەخنە لە بەها بەرزە کۆنەکان دەخاتە قۆناغی دووەمەوە. ئەو بەها کۆن و بەسەرچووانەی کە نیچە مەبەستی رەخنە لێگرتنیانە بریتین لە: دین‌و فەلسەفەو رەوشتی مەسیحیەت. شێوازی نووسین و تێروانینی نیچە بەزۆری نادیارو گومراکەرە، چونکە دین و فەلسەفەو رەوشت خۆی لەخۆیدا بە بەهای بەرز دانانرێت، بەڵکو شێوازو رێگاکانی دانانی بەهاکان و بەتایبەتیش دەرخستنی کارەکان و چەسپاندنی بەهاکانیان هەیە. تەنها بەم مانایەش بە بەهای بەرز دادەنرێن.

مەبەستی نیچە لە رەخنە لە بەها بەرزەکان تەنها نەرێ کردو رەتکردنەوەیان یاخود راگەیاندنی بێ نرخییان نییە، بەڵکو مەبەستی لێکۆڵینەوەی ریشەیی‌و پیشاندانی سەرچاوەی بەها کۆنەکانە وەکو کاروباری بارکراو کە پێویستە لەگەڵ بەها نوێیەکاندا مانای هەبێت. بەم پێیە "رەخنە لە بەها بەرزە کۆنەکان" بە دیاریکراوی بریتیە لە روونکردنەوەی سەرچاوەی گومان لێکراو و ناجێگیری ئەم بەهایانە. بەشێوەیەکی گشتی سەلماندنی ئەم خاڵە ئەوە دەگەیەنێت کە تەواوی بەها کۆنەکان جێگەی پرسیار لێکردن بن.

بەر لەم باسە، نیچە لە کتێبی یەکەمدا کە بەناوی "هیچگەرایی ئەورووپایی -رۆژئاو-" وە پێشکەشی کردووەو لەگەڵ سەرنجدان لەم ناونیشانە، دەتوانین بڵێین نیچە بەشێوەیەکی گشتی تێروانینێکی هەمەلایەنەو هەمەگیری هەیە دەربارەی رەوتی پێگەیشتنی مێژووی خۆرئاواو نیشانی دەدات کە چۆن هیچگەرایی لە مێژووی رۆژئاوادا بەهێزو بەرفراوان بووە. لە روانگەی نیچەوە هیچگەرایی تیۆرێك یان (جیهانبینی)یەك نییە کە لە کات و شوێنێکی تایبەتیدا پەیدا بووبێت، بەڵکو هیچگەرایی (سیفەتی زاتی) مێژووی رۆژئاوایە. بە کورتی مەبەست لە هیچگەرایی ئەوەیە کە چۆن باڵاترین و بەرزترین بەهاکانی تاکگەرایی وەك "بێ بەهابوونی بەرزترین بەهاگەلی کۆن) دەرخەری ئەو راستیەیە کە نە تەنها بڕیارو یاساکان و دەستوری مەسیحیەت، بەڵکو ئاکاری سەردەمانی هیلینی و فەلسەفەی ئەفلاتونی و.. هتد کە هێزی کاریگەری و پەیوەندی بوونی خۆیان لەدەستداوەو هۆی یەکێتی و بەشداری مرۆڤ نین، هێزیان لە داهێناندا روو لە لێکەوتن و ئاوابوونە.

لە روانگەی نیچەوە نابێت هیچگەرایی وەك جۆرێك لە پەرەسەندنی مێژوویی ببینرێتەوە لە سەردەمی نیچەدا یان ماوەیەك کە تەنها پەیوەندی بە سەدەی نۆزدەهەمەوە هەبێت، بەڵکو هیچگەرایی پێش مەسیحیەت دەستیپێکردووەو لەگەڵ گەیشتنی سەدەی بیستەمیش بەردەوام بووەو لە دیدی هایدگەرەوە تاوەکو سەردەمانی مۆدێرنێتەو پۆست مۆدێرنیتەشی خستووەتە ژێر هەژموونی خۆیەوە.

هیچگەرایی تەواوی سەردەم و قۆناغەکانی مێژووی رۆژئاوای داگیرکردووە. جێگەی سەرنجە کە هیچگەرایی لە روانگەی نیچەوە تەواوی دارِژان و روخاندن و فەسادی بەهاکان نییە، بەڵکو وەسفی بزوتنەوەیەکی مێژووییە کە نە تەنها توانای ئەو ناتەواو نییە، بەڵکو هەمیشە روو لە زیادبوونیشە.

فەسادو دارِمان "هۆکار"ی هیچگەرایی نییە، بەڵکو دەرئەنجام و کاریگەری ئەوە. بەم پێیە و بە بێلایەنکردنی پەیوەندییەکانی فەسادو دارِمان ناتوانین بەسەر هیچگەرایدا زاڵ ببین، بەڵکو هەنگاونانێکی لەمجۆرە تەنها گەشەکردنی کەمێك دوادەخات.

هایدگەر دەڵێت: بۆئەوەی لە مەبەستی نیچە لە هیچگەرایی تێبگەین، پێویستیمان بە ئاگاییەکی قووڵ و جدی فیکر هەیە، سەرنجدان لە پێویستی خودی هیچگەرایی بۆ مێژووی رۆژئاواو زەروربوونی رەخنەگرتن لە بەها کۆنەکان و دانانی بەهاگەلی نوێ ناچاری هەڵسەنگاندنەوەی بەهاکانمان دەکەن.

بەم پێیە ناونیشانی لاوەکی کتێبی "ئیرادەی هێز" واتە —هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنەوەی نوێی هەموو بەهاکان— لە قۆناغی کۆتایی فەلسەفەی نیچەدا گۆڕاوە بۆ ناونیشانی سەرەکی کە بە وتەی خودی نیچە "دژە شالاو"ە لەسەر هیچگەرایی.

ئەم دژە شالاوە لەڕاستیدا خۆی لەخۆیدا بزوتنەوەیەکی مێژووییە، بەڵام هیچ بزوتنەوەیەکی مێژوویی ناتوانێت لە دەرەوەی دەقی مێژووییەوە سەرهەڵبدات و رەخنە بە ئازادکراوی لە دەرەوەی بزوتنەوەیەکی مێژووییەوە بهێنێتە ناوەوە.

بزوتنەوەیەکی مێژوویی کاتێك مێژوویی دەبێت کە بتوانێت بە شێوەیەکی ریشەیی و هەمەلایەنە بڕوات کە ئەو رابوردوەی لەدوایەوەیەتی بەسەریا سەرکەوتن پەیدابکات و شێوەی نوێ دروستبکات.



بەهاگەلی نوێ ئەگەر نەتوانێت مەیلی تیۆری و کارەکی نوێ بهێنێتە ئاراوەو بیری گونجاو بۆ خۆی دابمەزرێنێت، ئەوا هیچ کاریگەری نابێت.

هەر جۆرە بەهاگوزارییەکی نوێ و دامەزراندنی بەهاگەلی نوێ، نە تەنها پێویستە (ئیمکانات)ی تایبەتی بە تێگەیشتنی خۆی ئامادە بکات، بەڵکو پێویستیشە نەوەیەکی نوێ لە مرۆڤ پەروەردە بکات کە خاوەنی مەیلی کاری نوێ بن و سەبارەت بە بەهاگەلی نوێ پەیوەندیدار بن و بتوانن ئایندە بەپێی ئەم بەهاگەلە بنەخشێنن و نەوەی ئایندە رێنمایی بکەن. بۆ هێنانەدی ئەم کارە پێویستە هەلومەرجی پێویستی نوێ ئامادە بکرێت و ئەم بزوتنەوە مێژووییە نوێیە بەزۆری زۆرترین کاتی قەومێك یان میللەتێك داگیربکات. سەردەمە گەورەکانی مێژوو بە دیاریکراوی بە بەڵگەی ئەوەی کە گەورەو گرنگ بن زۆر دەگمەن و ناوازەیە. تەواو هەروەکو ئەوەیە کە ساتی گەورە لە ژیانی تایبەتی مرۆڤدا لە ساتێك زیاتر نییەو زۆر ناوازەیە.

هەر بەها گوزارییەکی نوێ پێویستی بە داهێنانی هەندێ هەلومەرجی نوێو جێگیر هەیەو ئەم هەلومەرجەش پێویستی بە بەهاگەلی نوێی گونجاو و هاوتا هەیە. هەر لێرەشەوەیە کە کتێبی "ئیرادەی

هێز"ی نیچه بە کتێبی چوارەم کۆتایی پێدێت کە ناونیشانەکەی "رێکخستن و چاککردنی بنەچە"یە.

لە روانگەی نیچەوە دانانی بەهاگەلی بەرزی نوێ بەهەنگاوێك و لە بزوتنەوەیەکی کوتوپڕدا نایەتە دی، بەڵکو پێویستی بە تەقەلای درێژخایەن هەیە.

داهێنەرانی بەهاگەلی نوێ ئەو فەیلەسوف و هونەرمەندانەن کە لە ریزی پێشەوەی سەنگەری بیرکردنەوەدان. لە روانگەی نیچەوە فەیلەسوف و هونەرمەندان تاقیکەرەوان و ئەزموندارانی گەورەی مێژوون. ئەوان پێویستە رێگای بەردەڵان ببڕن و توانای ژیانیان لە قەڵای ساردو سەهۆڵبەنداندا هەبێت.

وەکو پێشتر وتم دانانی بەهاگەلی نوێ پێویستی بە بیرکردنەوەی بیری فەلسەفی بەتوانا هەیەو هەر بیرێکی فەلسەفی پێویستە بنەماو پایەی نوێی هەبێت، ئەم پایەو بنەمایە بە دیاریکراوی هەمان ئەو شتانەیە کە بیریارانی پێشوو لێی بێئاگا بوون. لەڕاستیدا وتەکانی ئەوان ئەوەیە کە پێشینان نەیانووتوە.

نیچە باوەڕی وایە کە لە سەردەمی "مەترسی گەورە"دا، فەیلەسوفەکان سەرهەڵدەدەن. هایدگەر ئەم قسەیەی نیچە بەو شێوەیە لێکدەداتەوە کە پرسیاری سەرەکی فەلسەفە، پرسیارێکی مەترسیدارە، چونکە وەڵامی ئەم پرسیارە دیاریکەری مێژووی ئایندەی قەوم و میللەتێکەو هەنگاوی خستنەڕووی پرسیارێکی لەم جۆرە کە فەیلەسوف دەکەوێتە نێوان دووڕیانی "بوون" و "مەوجود"ەوەو مەترسی لەم هەڵبژاردنەدایە. فەیلەسوف لێرەوە فەیلەسوفە کە هەمیشە بپرسێت "مەوجود چیە؟" بەڵام ئایا لە جێگای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا مەوجود لەبەر تیشکی وجود "بوون"دا دەبینرێتەوەو بونیادی مەوجود بە بوون دیاری دەکات؟، یان دووبارە مەوجودێکی تر وەك بنەماو ئەسڵی مەوجودەکان هەڵدەبژێررێت.

نیچەی بیریار بە جدیەتەوە هەرچی زووتر دەستدەکات بە هەڵبژاردنی دووەم و لەگەڵ وتەی "ئیرادەی هێز"دا دەربارەی مێژووی میتافیزیك تەواوی دەکات. مەبەست لە تەواوکردن لێرەدا لاوازبوونی میتافیزیك یان زیاتر بوونی قۆناغێك نییە بەسەر قۆناغێکی تردا لە مێژووی میتافیزیکدا، بەڵکو مەبەست لە تەواوکردن دەسەڵاتی تەواو و بێ چەندو چوونی مەوجودەو بێئاگایی تەواوە لە راستێتی بوون. جیاوازی هیچگەرایی نیچەو هایدگەر ئەمەیە، کە لە روانگەی هایدگەردا هیچگەرایی بریتیە لە تێنەگەیشتن و لەبەرچاو نەگرتنی بوون، کە نیچەش لەم روانگەیەوە دوایین و گەورەترین هیچگەرایی مێژووی رۆژئاوایە.

هایدگەر باوەڕی وایە کە ئێمە هێشتا ئامادەی روبەڕووبوونەوە نین لەگەڵ نیچەدا تاوەکو پێی ئاشنابین، رەنگە هۆی ئەمەش ئەوە بێت کە نیچە بۆ ئێمە زۆر هاوچەرخەو هێشتا بە ئەندازەی پێویست و تەواو زۆری لێ دوور نەکەوتوینەتەوە تاوەکو بتوانین بیناسین. بۆ ناسینی نیچە پێویستە بیر لە هەمان ئەو رێیە بکەینەوە کە نیچە دەیبڕێ تاوەکو بزانین چۆن و بە چ جۆرێك ئەو (نیچە) حەقیقەتی بوونەوەرەکانی بە "ئیرادەی هێز" زانیوە..

## پەراوێز

*نیچه، دانش مسرت بخش، ترجمه انگلیسی: والتر کافمن، صفحه *201*، بند *173*.

## سەرچاوە

ئەم نووسینە لە گۆڤاری (ادبیات و فلسفه)وە وەرگیراوە، ژماره (*35*) شهریور *1379*، صفحه *26-27*.

# ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتیەکان

■ ن: هاشم ساڵح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

*I*

هەرچەندە لێرەدا تێرمێکی تازەی وەك ئارکیۆلۆژیامان بەکارهێناوە، بەڵام ئەمە لەبەرئەوە نیە کە حەزمان بە شوێنکەوتنی مۆدێلە باوەکان بێت وەکی هەندێك لە فەرەنسیەکان و رەنگە عەرەبەکانیش پێیان وابێت، بەڵکو بەکارهێنانی ئەم تێرمە بەو مەبەستەیە کە ئێمە دەمانەوێت بە تەواوەتی مەبەستی خۆمان ئاشکرا بکەین..

زانستە مرۆڤایەتیەکان بەرهەمی ئەمڕۆکە نیە، یاخود وەکی هەندێك پێیان وایە تەنیا لە شەستەکان و لەگەڵ قۆناغی بونیادگەریدا دروست بوە، بەڵکو مێژوویەکی درێژتری هەیەو سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم (واتە لە دوای شۆڕشی فەرەنسی و شۆڕشی پیشەسازی). پاشان لە نیوەی دوەمی هەمان سەدەدا شوێنی خۆی کردەوە. ئەمەش (کۆمەڵناسی، ئابووریناسی، مێژووناسی، دەروونناسی و تەنانەت بایەلۆژیاش دەگرێتەوە).

زانستە مرۆڤایەتیەکان تەنها لە پێناو مەعریفەدا دروست نەبوون، بەڵکو بۆ فەراهەمکردنی چەند پێداویستییەکی عەمەلی دیاریکراو بوو لە کۆمەڵگا ئەوروپیەکاندا. مەعریفە وەکی هەندێکجار بە شێوەیەکی کاڵفامانە تێیدەگەین، لە پێداویستیەکان جیانابێتەوە، بەڵکو ئەویش بۆ خۆی بە شێوەی ڕاستەوخۆ بە هەلومەرجی مادی بوونەوە گرێدراوە. لەبەرئەوەی مەعریفە لە تەواوی کۆمەڵگاکاندا وەکو یەك ڕێپێدراو نیە، ئەوا چەند جۆرێکی مەعریفە لە هەندێك کۆمەڵگای دیاریکراودا بە تەواوەتی ڕەتدەکرێتەوە، ئەویش لەبەر هۆکاری (تیۆلۆژی و سیاسی و ئایدیۆلۆژی و.. هتد).

هەندێکجار مەعریفەیەك زۆر لە سەروو گەشەی کۆمەڵگاکەوەیە، بۆیە ئەو کۆمەڵگایە گەر ئەو مەعریفەیەی پێگەیشت، ئەوا وەك شتێکی نامۆو بێماناو نەسرۆ لێی دەڕوانێت، هۆکەشی ئەوەیە کە زەمینەی لەو کۆمەڵگایانەدا نیەو پشت بە فۆرم و مەرجەعیەتێکی دیاریکراو نابەستێت. بۆ ئەمە با

نموونە بە تێرمی ئەبستمۆلۆژیا (واتە تیۆری زانین) بێنینەوە. ئەم تێرمە بۆ کۆمەڵگە عەرەبیو ئیسلامیەکانی ئێمەو لە ساتەوەختی ئێستا چی دەگەیەنێت؟

بێگومان مانایەکی ئەوتۆی نیە، بگرە تا ئەوپەڕی، وەك تێرمێکی نامۆو نەسرۆ دێتە پێشچاو. هۆکەشی ئەوەیە لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا کلتورێکی زانستی وەها نیە کە ئەم چەمکە بگرێتە خۆی، یاخود ئەو بتوانێت پشتی پێببەستێت. لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا نە لابوری زانستی هەیە نە گۆڤاری تایبەت، تا تیۆریو ئاکامو دۆزینەوەی ئەپستمۆلۆژیامان لە بوارەکانی ((فیزیاو کیمیاو گەردونناسیو ماتماتیكو بایەلۆژیاو.. هتد))، بۆ ورد بکاتەوە. کلتوری زانستیش، وەکی پێویست لە ژینگەی ئێمەدا، ئەوەندە ڕەگ داکوتراو نەبوە تا لە تیۆریاکانی فەلسەفەی زانست تێبگەین، یاخود بتوانین پەی بە گرنگیی بەرین، بەڵام بۆ نموونە سەرنجی کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی فەرەنسی بدەین، دەبینین شتەکە بە پێچەوانەوەیە. تێرمی ئەبستمۆلۆژیا لەویێ لانی کەم لە ناوەندە زانستیو ڕۆشنبیریەکاندا نە هیچ نارەزاییەك دروستدەکاتو نە جێی سەرسوڕمانیشە. هەر لەبەرئەمەشە تەواوی ئەو تیۆرانەی لە ئەورووپاوە دەگوازرێنەوە وڵاتانی ئێمە /سوریالیانە/ یان ناواقیعیانە دێتە پێشچاو، وەك ئەوەی لە بۆشاییەوە ڕسکابنو هیچ بنەمایەکیان نەبێت. مەترسی گواستنەوەی ئەو تیۆرانەش بێ هیچ ئامادەکاریو زەمینەسازییەك لێرەدایە.

کاتێك ئەم قسانەش دەکەم بەردەوام وا هەست دەکەم کە هەنگاو لە بۆشاییدا هەڵدێنم، یاخود بەناو کێڵگەیەکی مینڕدا ڕێدەکەم. بۆیە پێویستە لەسەر ئەم مەسەلەیە کۆك بین، ئەویش ئەوەیە: مادامەکی زانست بە شێوەیەکی دروست لە زانکۆو پەیمانگا باڵاکانی ئێمەدا دانەمەزراوە، ئەوا نابێت چاوەڕوانی شتی زۆر بکەین کاتێك بە زانستی ئەورووپی (واتە بە زانستی مۆدێرن) تێکەڵ دەبین. پێویستە ئەم زانستانە بە زمانی عەرەبی دابمەزرێنرێت، نەك بە زمانە بیانیەکانی خۆیان بگوزارێنەوەو وەکی خۆشیان لە وڵاتەکانی ئێمەدا بخوێنرێن. ئەوەتا فیزیا بە زمانی ئینگلیزی یاخود بە فەرەنسی دەخوێنرێت، ماتماتیكو زیندەوەرزانیو کیمیاو تەنانەت پزیشکییش (تەنها زانکۆی دیمەشق نەبێت وەکی بزانم)، هەر بەو جۆرەیە. کەواتە چیمان بۆ دەمێنێتەوە؟ تەنانەت زانستە مرۆڤایەتیەکانیش لە ڕێی زمانو تێرمە بیانیەکانەوە بەردەوامی پێدەبەخشرێتو ئیدامە دەدرێت. بۆیە ترس هەیە لەوەی زمانەکەمان تەنها ببێتە زمانی شیعرو ئەدەب.

ئەگەرچی لە ماوەی بیست یان سی ساڵی ڕابردوودا هەندێك هەنگاوی ئیجابی نراوە، وەك کردنەوەی زانکۆی نوێو تاقیگەو کلینیکی پزیشکی. بەڵام نابێت ئەمانە دەستمان بگرن لەوەی باس لە کەمو کووڕیەکان نەکەینو قسە لەو دواکەوتووییە گەورەیە نەکەین لە زۆر بواردا. دواکەوتویی ئێمە تەنها لە بواری زانستە سروشتیەکاندا نیە، بەڵکو بواری زانستە مرۆڤایەتیەکانیش دەگرێتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ ناتوانین لە زانستە مرۆڤایەتیەکانو تەنانەت لە ژیاری خۆرئاواش بە گشتی- تێبگەین گەر دەست نەکەین بە تاوتوێکردنی ئەم زانستانە بە شێوەیەکی بابەتیو بە بەراوردکردنیان بە زانستە سروشتیەکانو بەرەنجامەکانی (یاخود پراکتیزە کردنە تەکنۆلۆژیەکانی)، چونکە مرۆڤ تەنها ئەو کاتە توانی پرکێشی بکاتو خۆی بکاتە بابەتی زانستو زانین، کە سەرکەوتنی مەزنی لە بواری زانستی سروشتیو فیزیاو ئەزموونگەریدا بەدەستهێنا.

فاتیکاندا گیانی لەدەستیدات. هەرچی "جۆردا نۆ برۆنۆ"شە نەیتوانی سەری خۆی لە ڕق و تووڕەیی پیاوانی کڵێسا قوتاربکات، ئەوەبووساڵی *1600* بە زیندووی لە شاری ڕۆمادا سوتێنرا. ئەمەش سزادانی بوو لەسەر ئەو بیروبۆچوونە فەلسەفی و زانستیە پێشوەختانەی.

کەواتە مرۆڤ لە دوای ئەو سەرکەوتنانەی لە بواری دۆزینەوەی گەردوونناسی و فیزیا و سروشتەوە بەدەستی هێنا، پرکێشی ئەوەی کرد خۆی بکاتە مادەیەک بۆ توێژینەوەی زانستی. دوای ئەوەی مرۆڤی ئەورووپی کۆنترۆڵی سروشتی کردو سەرکەوتنی تەکنۆلۆژی زۆر گەورەی تۆمارکرد، متمانەی بە خۆی پەیداکردو لە لێکۆڵینەوەی مادەوە بایدایە سەر لێکۆڵینەوە کردن لەسەر خودی مرۆڤ خۆی. هەروەها هۆکاری دیکە هەن کە ڕۆڵیان لە دروستکردنی زانستە مۆڤایەتیەکاندا هەبوە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا. لەوانە ترسی بورژوازیەتی تازە پێگەیشتوو لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکان.. لە دوای شۆڕشی فەرەنسیەوە کەلکەڵەی شۆڕشگێڕی لە فەڕەنسادا تەواو نەبووبوو، بەڵکو وەک تارماییەک بە دوای چینی فەرمانڕەواوە بوو. لە واقیعدا سەدەی نۆزدە سەدەیەک بوو پڕ لە شۆڕش، پاشان ئەم شۆڕشانە بە زەبری ئاگرو ئاسن سەرکوتران و ئاسایش و ئارامی گەڕایەوە. بەرقەرارکردنی ئاسایش و ئارامی، مەسەلەیەک بوو "ئۆگست کۆنت"ی فەیلەسوفی فەرەنسی و دامەزرێنەری فەلسەفەی پۆزەتڤستی بە خۆیەوە سەرقاڵکردبوو. لەبەرئەوە داوای دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیای کردو، یەکەم کەس بوو کە لە ساڵی *1830*دا ئەو زاراوەیەی بەکارهێنا. لە پشت ئەمەوە "کۆنت" دەیویست لە کۆمەڵگاو ڕێساکانی تێبگات، بۆ ئەوەی دەسگیرۆی دەوڵەت بکات تا پەی بە سەرچاوەی هەڕەشەو مەترسیەکانی بەرێت. پاشان



وەک دەزانین ئەم زانستانە بە درێژایی گەشەی مێژوویی خۆیان هەر لە سەدەی شانزەوە تا سەدەی نۆزدە، ڕووبەڕووی بیروبۆچوونە باوەکان بوونەوە - ئیتر سەرچاوەیان میتافیزیکی بوبێت یاخود تیۆلۆژی مەسیحی-. دوای ئەوە مەسەلەکان بە تەواوەتی لە بەرژەوەندی ڕۆحی زانستی نوێ لە دژی ئەقلیەتی پێشوو (ئەقلیەتی دۆگمای ئاینی) شکایەوە. کتێبەکانی مێژووی ئەورووپا پڕن لە ململانێی توندی نێوان کڵێساو زانست، لەم ململانێیەشدا دوای خەباتێکی دوورو درێژ و ململانێیەکی خوێناوی، تیۆریە زانستیەکان توانیان بەسەر ئەو بیروبۆچوونە باوانەی لە ئەقڵی خەڵکدا ڕەگیان داکوتابوو سەربکەون.

دەکرێت لەم بارەیەوە نمونەی "کۆپەرنیکۆس" بهێنینەوەو بزانین دووچاری چی هات، کاتێک تیۆریا گەردوونناسیەکەی دەربارەی سوڕاندنەوەی زەوی بە دەوری خۆردا ڕاگەیاند. "کۆپەر نیکۆس" ناچاربوو نامەیەک بۆ پاپا بنووسێت و تیایدا داوای سۆزو بەزەیی لێبکات، لەو نامەیدا نووسی بووی: *"دۆزینەوەکەی ئەو لەگەڵ جەوهەری کتێبی پیرۆزدا ناکۆک نیە"*، ئەمە لە دەوروبەری ساڵی *1540*دا بوو. پاش سەدەیەکی تەواو لەو ڕووداوە "گالیلۆ" ناچاربوو هەمان شت بکاتەوە، دوای ئەوەی خەریکبوو لە دادگایکردنە بەناوبانگەکەی لە بەردەم

هەر لەو ماوەیەدا یاخود دواتر بۆ هەمان مەبەست دەروونناسی کۆمەڵایەتی دامەزراو، لەسەر دەستی "گۆستاف لۆبۆن" گەیشتە ترۆپك.

دوای ئەوەی "لۆبۆن" ساڵی *1895* کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی *سایکۆلۆژیای جەماوەری ی* بڵاوکردوە، ئەمە لەو کاتەدا بوو کە کەفو کوڵی جەماوەر، دوای کۆمۆنەی پاریسو سەرەتای دەرکەوتنی ئایدیای سۆسیالیزم لە فەرەنسادا تاوی سەندبوو. ئەم ئایدیایەش هەڕەشەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی لە چینی بۆرژوازیەت دەکرد، چون ئەو شۆڕشەی بەر لە سەدەیەك (واتە سەروەختی شۆڕشی هەرەسی) چینی ئۆرستۆکراتی ڕامالّی.

لەم سەروبەندەدا "گۆستاف لۆبۆن" هاتە مەیدان بۆ بەرگری کردن لە چینی بۆرژوازی باڵادەست (کە بە چینی خۆیی دەزانی)و "لۆبۆن" هەوڵی دا بە شێوەیەکی زانستی لە جەماوەر بکۆڵێتەوە تا بتوانیت پەنجە بخاتە سەر ئەو ڕێسایانەی جڵەو گیری دەکەن، ئەمەش بەو مەبەستەی تا کاری کۆنترۆڵکردنیان ئاسان بێت. لەم پێناوەشدا دەستی بە بەکارهێنانی ئەو زاراوانە کرد کە لە زانستە سروشتیەکانەوە وەرگیرابوون، بە تایبەت لە بواری کیمیاو بایەلۆژیادا.

"لۆبۆن" پێی وابوو جەماوەر هەڵدەچێتو پاشان هێور دەبێتەوەو بڵاوەی لێدەکەن، ئەمەش بە پێی یاسایەکی تایبەتی کە پەیوەندی بە کارەکتەری سەرکردەو هێزو توانای ئەوەوە هەیە بۆ مۆبێلیزە کردنی جەماوەر. لەم مسەلەیەشەدا جۆری ڕەگەز ڕۆڵی خۆی دەبینێ. بۆ نمونە ڕەگەزی لاتینی (واتە فەرەنسیو ئیتاڵی) خوێنگەرمن، بە پێچەوانەی ڕەگەزی ئینگلیزی یاخود دانیشتوانی باکوری ئەوروپاوە کە ساردو سڕن. "لۆبۆن"و شوێنکەوتوانی زیادەڕۆیی زۆریان لە ڕۆڵی ڕەگەزو کاریگەری لەسەر ڕەفتاری گروپو تاکەکەس کردوە.

ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئایدیای ڕەگەزپەرستی زاڵبوو بەسەر بیرکردنەوەی زۆربەی خەڵکدا، بگرە تەنانەت بەسەر زۆربەی بیریارانیشدا، بەڵام بە ئاستی جیاجیا (تەنانەت مارکس- یشی لێبەدەر نەبوو).

لەو قۆناغەدا ڕەیسیزم وەك شتێکی سروشتی دەهاتە پێشچاو، لەبەرئەوەی پشتی بە پرانسیپەکانی (بایەلۆژیاو ئەنسرۆپۆلۆژیا) بەستبوو. وەك دەشزانرێت تیۆری ڕەیسیزم تەنها لە دوای جەنگی دوەمی جیهانیەوە پاشەکشەی کردو فیکری ئەوروپی دەستبەرداری بوو، دوای ئەوەی مرۆڤی ئەوروپی لە بەرامبەر سەرکێشیو سەرەڕۆییەکانی فاشیزمو نازیزمدا باجێکی زۆری دا، بەڵام تا ئێستاش ڕاسترەوە توندڕەوەکانی ئەوروپا لە ژێر کاریگەری تیۆری ڕەگەزپەرستی،دانو پێیان وایە کە ڕەگەزی ئەوروپی (سپی یان زەرد) شارستانییەو، ڕەگەزەکانی دیکە شارستانی نین. بەڵکو دەبێت بە زەبری هێز /شارستانی بکرێن/، وەك چۆن لە ڕۆژگاری کۆلۆنیالیەتدا ڕووی دا. ئەم تێزەیە تا ئێستاش بەردەوامە، ئەگەرچی بایەلۆژیای نوێ ئەو بنەمایانەی پووچەڵکردەوە کە تێزەکانی ڕەیسیزمی لەسەر دامەزرابوو. هاوکات ئەنسرۆپۆلۆژیای نوێ کەوتە ڕەخنەکردنی ئەنسرۆپۆلۆژیای تەقلیدی (کە بە پێی شێوەی کەللەسەر یاخود ڕەنگی قژو پێستو دەموچاو، جیاوازی لە نێوان خەڵکدا دەکردو پێی وابوو ئەم شتانە تایبەتمەندی کلتوریو ڕادەی زیرەکی نێوان ڕەگەزەکان یەکلایی دەکاتەوە). بەمجۆرە ئەنسرۆپۆلۆژیای تەقلیدی مەشروعیەتێکی زانستی بە تێزە ڕەگەزپەرستیەکان دەبەخشێ. لەوکاتەدا -واتە لە سەدەی نۆزدەدا- ئابووریناسی لەسەر دەستی "ڕیکاردۆ" *1823-1772*و دوای ئەویش لە لایەن "کارل مارکس"ەوە دامەزرا. ئەم کایە تازەیەش بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگای ئەوروپی هاتە ئارا، چونکە ئەو کۆمەڵگایە

چوو بوە قۆناغی پیشەسازی‌و بونیادە تەقلیدیەکەی (کە لە بنەمادا بونیادێکی کشتوکاڵی گوندنشینی بوو) هەڵتەکاندبوو. داهێنراوە تەکنۆلۆژیە تازەکانیش لەم پرۆسەی گواستنەوەیەدا ڕێخۆشکەر بوون، دواتر فیلۆلۆژیا لەسەر بنەمایەکی پتەوو لەسەر دەستی زانای ئەڵمانی "فرانز بۆپ" *1791–1867* دامەزرا. ئەم زانستە مەزنە تەواوی سەدەی نۆزدەو نیوەی یەکەمی سەدەی ڕابردووی گرتەوە، واتە تا ساتەوەختی هاتنە ئارای زمانەوانی نوێ بەردەوام بوو. فیلۆلۆژیا بە تەنها لێکدانەوەی زمان ناگرێتەوە، بەڵکو لێکۆڵینەوەی هەموو ئەو دیکۆمێنتە نووسراوانەش دەگرێتەوە (واتە کتێبە ئەدەبی‌و مێژوویی‌و ئاینیەکان) کە لە شارستانیە کۆنەکان جێماون..

ئەوکات ئەو ڕاستیە ئاشکرابوو کە: زمان لەگەڵ کاتدا گەشەدەکات‌و گۆڕانی بەسەردا دێت. لەمەوە فیلۆلۆژیای مێژوویی دروستبوو. لێکۆڵینەوەی بنەچەی زمانەکانی ئێستاش دەستپێکرد. لەم ڕێگایەشەوە پەیوەندی لێکچوونی نێوان زمانی سانسکریتی (واتە زمانی پیرۆزی هندی کۆن)، لەگەڵ زۆربەی زۆری زمانە ئەوروپیە کۆن‌و نوێکاندا دۆزرایەوە. زانایانی ئەو سەردەمە گەیشتنە ئەو ڕایەی کە هەموو ئەو زمانانە گەشەیەکی سروشتیانەی یەك زمانن، بەڵام سەرچاوەکەی دیار نیە، لەبەرئەوەی ئێجگار کۆنە. ئەم زمانەشیان ناونا زمانی هیندۆ–ئەورووپی.

هەرچۆنێك بێت لەو ماوەیەدا فیلۆلۆژیای مێژوویی گەشەیەکی زۆری کردو سوودی لە تیۆریی گەشەسەندن لای هەریەك لە "لامارك‌و داروین" بینی، بۆئەوەی پەی بە ڕەچەڵەکی وشەو زمانەکان ببات، وەك چۆن ئەمان لە بواری زیندەوەرزانیدا پەییان بە ڕەچەڵەکی مرۆڤ برد. لێکۆڵینەوەی فیلۆلۆژیای – مێژوویی بە زۆری لە ئەڵمانیادا گەشەی سەند، بە جۆرێك قوتابخانەی فیلۆلۆژی ئەڵمانی بوە نمونەیەك کە لە تەواوی دونیادا شوێن پێیان هەڵدەگرت. بەمجۆرە دەستکرا بە لێکۆڵینەوەی تەواوی تێکستە کۆنەکان (واتە تێکستەکانی یۆنان‌و ڕۆمان‌و سەرەتای مەسیحیەت)، ئەمەش لەسەر بنەمایەکی زانستی تۆکمە بوو دوای بەراوردکردنێکی ورد لە نێوان ژمارەیەك دەسنووسی هەمان کتێبدا. لێرەوە مێژووناسی پۆزەتیفیستی دروست بوو، بە سوود وەرگرتن لەو قەڵەمبازە گەورانەی فیلۆلۆژیادا هەبیوو. هاوکات ئەمە جۆرێك لە توێژەری قاڵبوونی ناو زانستی دروستکرد کە کۆنترۆڵی تەواوی زانکۆکانی ئەوروپایان کرد.

ڕاستە مێژووناسی کۆنترین لقی زانستە مرۆڤایەتیەکانە، بەڵام تەنها لە سەدەی نۆزدەدا نەبێت نەیتوانی خۆی لەو گریمانە میتافیزیکی‌و تیۆلۆژیانە قوتار بکات، کە لە سەدەکانی کۆن‌و ناوەڕاستدا کۆنترۆڵیان کردبوو. مێژووناسی لە سەدەی نۆزدەوە توانی بە تەواوەتی خەسڵەتێکی زانستیانە وەرگرێت‌و پشت بە هەندێ ڕێساو بنەمای توندوتۆڵ ببەستی، ئیتر ئەمە لە ساغکردنەوەی تێکستە کۆنەکاندا بێت یاخود لە دۆزینەوەی ڕەچەڵەکی وشەو مانەکاندا بێ، یان لە دەستنیشانکردنی وردی مێژووی بەسەرهات‌و ڕووداوەکاندا بێت، یاخود پەردەهەڵماڵین بێت لە ڕووی ئەو شێواندن‌و دەسکاریکردنەی لە هەواڵ‌و بەسەرهات‌و تێکستەکان و.. هتد، کراوە.. ئەمە ئەو مێژوە پۆزەتیفیستیەیە کە لە شەستەکاندا قوتابخانەی بڵاوکراوەی ساڵانە لە دژی وەستایەوە، دوای ئەوەی ((مێژووی پۆزەتفستی)) ڕۆڵی خۆی گێڕاو ئەرکی خۆی لە ساغکردنەوەی سەرجەم کەلەپووری خۆرئاوادا جێبەجێکرد. ڕێبەرانی قوتابخانەی بڵاوکراوەی ساڵانە هەرگیز نکوڵیان لە گرنگی هەموو یاساو ڕێساکانی مێژووی پۆزەتفستی نەکرد، بەڵام بەو مەرجەی تەنها وەك سەرەتایەك

سەیر بکرێت و مێژوونووس هەر بەوە ئیکتیفا نەکات. پاشان ئەوروپییەکان کەمترین پێویستیان بەم میتۆدە هەبوو، لەبەرئەوەی وەک پێشتر باسمانکرد بە درێژایی سەدەی نۆزدەو تا ناوەڕاستی سەدەی بیست زۆربەی زۆری کەلەپووری خۆرئاوا (گەر نەشڵێین هەمووی) بە شێوەیەکی زانستی ساغ کرابۆوە. هەروەها سەرجەم دەستنووسە کۆنەکان چاپی جۆراو جۆر کرابوون و لە کتێبخانەکاندا خرابوونە بەردەست. ئەمەش تەواو بە پێچەوانەی حاڵەتی کەلەپووری عەرەبی ئیسلامیەوەیە، چونکە لەم ڕووەوە بە بەراورد بە کەلەپووری ئەوروپی، زۆر لە دواوەوەیە.

تا ئێستاش بەشێکی گەورەی دەستنووسەکانمان لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکان تۆزیان لێ نیشتوە، نە ساغ کراونەتەوەو نە بڵاویش کراونەتەوە. تەنانەت گەر ئێستاش هەندێکی لێ بڵاوکرابێتەوە ئەوا پێویستی بە سەرلەنوێ بڵاوکردنەوە هەیە، چونکە بە شێوەیەکی زانستی ساغنەکراوەتەوە. "ئەندرێ مایکل"ی بەڕێوەبەری کتێبخانەی نیشتمانی لە پاریس جارێکیان پێی وتم: تەنها لەم کتێبخانەیەدا حەوت هەزار دەستنووسی عەرەبی هەیە!

لە سەدەی نۆزدەدا خۆرهەڵاتناسی لەسەر بنەمای میتۆدی پۆزەتفستی یان فیلۆلۆژی یاخود مێژوویی دامەزراو ئەوروپییەکان بۆ بوژاندنەوەی کەلەپووری تایبەتی خۆیان بەکاریان هێنا. سەردەستەی خۆرهەڵاتناسەکان کەوتنە پشکنینی زۆر لە تێکستە کۆنەکان، داوی ساغکردنەوەیان کەوتنە چاپکردن و بڵاوکردنەوەیان. ئەمە لە کاتێکدا ئێمە تا هەنووکەش لەو مەیدانە بەدوورین، یاخود نوقمی خەوێکی قوڵین. ئەڵبەتە لە پاڵ ئەو خۆرهەڵاتناسیەشدا خۆرهەڵاتناسیەکی بە سیاسی کراو و پەڕپووتیش هەیە کە ئامانجی خزمەتکردنی مەبەستی دیکەیە (بێجگە لە زانست و توێژینەوە)، ئەمەیان پێویستە سەرکۆنە بکرێت و پەردەی لە ڕوو هەڵبماڵرێت.

بەڵام خۆرهەڵاتناسیەکی جدیش هەیە کە خزمەتی زۆری بە کەلەپووری عەرەبی ئیسلامی کردوە. تەنانەت زۆرێک لە دەرەنجام و تێزەکانیشی بێئەوەی بە خۆمان بزانین هاتۆتە ناو کایەی ڕۆشنبیری عەرەبییەوە. بۆیە چەند ڕۆشنبیرانێک تەنانەت ئەوانەشیان کە ڕەخنە لە خۆرهەڵاتناسی دەگرن، هەندێک جار هەمان میتۆدی خۆرهەڵاتناسی بەکاردێنن و سوودی لێوەردەگرن، بەڵام بێئەوەی بە ئاشکرا باس لەوە بکەن. هەرچۆنێک بێت مەنهەجیەتی زانستی یەک مەنهەجیەتە و بۆ تاوتوێکردنی سەرجەم کەلەپووری مرۆڤایەتی دەگونجێت، بە مەرجێک بتوانین بە باشی پراکتیزەی بکەین و بەکاری بهێنین.

مەنهەجیەتی خۆرهەڵاتناسیش بەشێکە لە مەنهەجیەتی مێژوویی و فیلۆلۆژی ئەوروپی کە لە سەدەی نۆزدەدا دامەزراو گەشەیکرد، بە تایبەتیش لە ئەڵمانیادا. بەم پێیە جێی سەرسوڕمان نیە کە گرنگترین خۆرهەڵاتناسی هاوچەرخ بە ڕەچەڵەک ئەڵمانی بێت ئەویش "جۆزیف ڤان ئێس"ە.

*II*

باسمان لەوە کرد کە زانستە مرۆڤایەتیەکان، وەک ((ئابووریناسی، کۆمەڵناسی، دەروونناسی، زمانناسی، مێژووناسی و ڕەگەزناسی.. هتد))، لە سەدەی نۆزدەهەم و بۆ بە ئەنجامگەیاندنی هەندێک خواستی دیاریکراو هاتە ئارا. بەڵام ئایا ئەمە مانای وایە کە ئەم زانستانە لەوەوبەر لە ئارەدا نەبوون؟ مانای ئەوەیە کە ئارکیۆلۆژیای ئەو زانستانە -واتە لێکۆڵینەوە لە ڕەچەڵەک و سەرەتای دروستبوونیان- تەنها لە سنوورەکانی ئەو سەدەیەدا ڕادەوەستێت؟

ئەوەی ڕاست بێت هەندێک لە مێژوونووسانی زانستەکان لەسەر ئەو دیاریکردنە مێژووییە ڕازی

نینو سەرەتای دروستبوونی ئەو زانستانە دەگێڕنەوە بۆ کۆتاییەکانی چاخی ڕێنیسانس، یان بە دیاریکراوی دەیبەنەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەم. هەندێکیان دەیگێڕنەوە بۆ "جۆن لوک *1637-1704*" کە لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا فەلسەفەی ئینگلیزی کۆنترۆڵ کردبوو، هەندێکی تر دەیگێڕینەوە سەر "فرانسیس بیکۆن" ئەو پیاوەی ساڵی *1605* واتە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەدا کتێبێکی دەربارەی ((پێشکەوتنی زانین)) بڵاوکردەوە.

هەرچەندە سەرەتای ئەو مێژوە لەوە کۆنترە، بەڵام مرۆڤ بۆ یەکەمجار تەنها لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە یەک کاتدا بوە خودێکی لێکۆڵیارو بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە. دەبێت هۆی چی بێت کە زانستی مادە بەر لە زانستی مرۆڤ کەوتبێت، یاخود مادەناسی بەر لە مرۆڤناسی دەستی پێکردبێت؟

هۆکەی ئاسانە: لەبەرئەوەی مرۆڤ کاتێك تاوتوێی مادەیەك دەکات (زیندوو بێت یان مردوو) ئەوا شتێك تاوتوێ دەکات کە لە دەرەوەی خۆیەتیو لە خۆی جیا بۆتەوە، بەڵام ئەوکاتەی دەست بە لێکۆڵینەوەی خودی خۆی دەکات ئەوا لە شتێك دەکۆڵێتەوە کە تەواو بە خۆیەوە پەیوەستە: کێشەو مەترسیی ئەم لێکۆڵینەوەیەش لێرەدایە. چونکە تۆ کاتێك دەکەویتە لێکۆڵینەوەی ڕووەك یان ئاژەڵ یاخود شتێکی بێگیان، زۆر بە ئاسایی دەتوانیت مەسافەیەکی بابەتی تەواو لەگەڵ کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەتدا وەرگریتو هەستو سۆزی خۆتی نەدەیت بەسەردا. بەڵام کاتێك دەست بە تاوتوێکردنی خۆت یان هاوڕەگەزەکانی خۆت دەکەیت، ناتوانیت ئەم ڕەهەندە بابەتیە دروست بکەیت، تەنها دوای هەوڵێکی تاقەت پڕوکێن نەبێت. چونکە مەوزوعیەتی تەواو لەم بوارەدا ئەستەمە، هەرچەندە کێشو قەوارەی ئەو توێژەرە یان ئەو زانایە گەورەو گرانیش بێت.

لەبەر ئەم هۆکارە هەندێك، زانستە مرۆڤایەتیەکان، بە زانست نازانن، چونکە بەردەوام ئەگەری ئەوە هەیە کە لە لایەن ئایدۆلۆژیاو ئارەزوە شەخسیەکانەوە دەستکاری بکرێت. بۆیە ئەبستمۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتیەکان لە ئەبستمۆلۆژیای زانستە سروشتیەکان ناچێت.

زۆرجار زانایانی بواری فیزیاو کیمیا بە چاوێکی سوك سەیری پسپۆڕانی بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەکەن. ئەوان پێیان وایە ئەوانە مشەخۆرن بەسەر زانستەوە. بەم دواییەو لەسەر ئەم مەسەلەیە لە سەنتەری نەتەوەیی فەرەنسی بۆ توێژینەوەی زانستی قەیرانێك دروستبوو، کاتێك ژمارەیەك بیرمەند داوای جیاکردنەوەی زانستە مرۆڤایەتیەکانیان لە زانستە سروشتیەکان کردو پێشنیاریان کرد تا پەیمانگایەکی تایبەت بە زانستە مرۆڤایەتیەکان لە دەرەوەی سەنتەری نەتەوەیی دروستبکرێت. تەنانەت دەوڵەتیش میزانیەی خۆی بۆ ئەو توێژەرانە تەرخان دەکات کە لە بواری وزەی ئەتۆمیو گەردوونناسی، یان توێژینەوەی بایەلۆژیو پزیشکیەکاندا کاردەکەن، کەمەکەمیش بۆ توێژەرەوەکانی بواری زانستە مرۆڤایەتیەکان تەرخان دەکات. ئەمەش مانای وایە کە پێشکەوتنی زانستو تەکنۆلۆژی لە ڕیزی پێشەوەی ئەو مەسەلانەدایە کە لە وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتوەکاندا گرنگی پێدەدرێت. لەبەرئەوەی بەهێزی ئەم وڵاتانە پەیوەستە بە زانستو تەکنۆلۆژیاوەو، هەر ئەمانەشن کە پێشکەوتنو باڵادەستیان بەسەر وڵاتانی تردا بۆ دەستەبەر دەکەن.

ئەوانەی خاوەن لابوری زانستی نین، هێزو توانایان نیە. ڕەنگە ئەم لابورانە تایبەت بن بە پیشەسازی سەربازی یاخود مەدەنی، بەڵام ئەمە گرنگ نیە. گرنگ ئەوەیە بەر لە کەسانی تر بگەینە دۆزینەوەی زانستی تازە، بۆئەوەی لە مەیدانی

کێبڕکێی تەکنۆلۆژی‌و سیاسی‌و ئابوریدا بۆڕیان بدەینەوە، (بۆ نمونە بڕوانە ئەو کێبڕکێیەی لە نێوان پەیمانگای باستۆر لە پاریس‌و پەیمانگاکانی ئەمریکادا هەیە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ نەخۆشی ئایدز، ئەم قسەیەش بۆ بواری ئەتۆمی یان فەزای دەرەوەو.. هتد، ڕاستە). بۆ نمونە کاتێك فەرەنسا لە بواری فیزیادا خەلاتی نۆبڵ بەدەستدێنێ، ئەو وڵاتە هەست بە فەخرو شانازیەکی زۆر دەکات‌و خاوەنەکەشی لە پڕێکدا دەبێتە پیاوێکی بەناوبانگی کۆمەڵگاکەی.

بەلام ئاخۆ ئەمە مانای ئەوەیە کە زانستە مرۆڤایەتیەکان گرنگیان نیە؟ ئەڵبەتە نەخێر. دەکرێت بڵێین لە ڕووی گرنگیەوە زانستە مرۆڤایەتیەکان بە پلەی دوەم دێن. زۆرجار فەرەنسیەکان شانازی بەوەوە دەکەن کەوا فەیلەسوف‌و بیرمەندان‌و سۆسیۆلۆژیستەکانیان بوونەتە ئەستێرەیەکی ناودار لە وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا. هەرچەندە "میشێل فۆکۆ" لەبەر هۆکارگەلێك دەسەلاتدارنی وڵاتەکەی چارەیان نەدەویست، بەلام فەرەنسا شانازی پێوە دەکرد. ئەویش بەهۆی ئەو سەرکەوتنانەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لە ئەمریکاو یابان‌و سەرتاسەری ئەوروپادا بە دەستی هێنابوو. هۆکارەکەش ئەوەیە کە کارەکەی "فۆکۆ" نێوبانگێکی جیهانی بۆ فەرەنسا پەیدا دەکەن‌و زمان‌و فیکری فەرەنسیش بە تەواوی دنیا دەگەیەنێت. وەك دەشزانرێت هەندێك جار وڵاتانی پێشکەوتوو پارە دەدەن تا کتێبەکانیان وەربگێڕرێنە سەر زمانەکانی تر.

بەهەرحاڵ زانستە مرۆڤایەتیەکان لە وڵاتێکی وەك فەرەنسادا نابێت گلەیی زۆر لە بەختی خۆی بکات، لەبەرئەوەی وەکی پێویست ڕێزی لێ دەگیرێت‌و سەنگ‌و قورسایی دەزانرێت. ئەوەتا ئەمساڵ سەنتەری توێژینەوەی نەتەوەیی مەدالیای زێڕی بەخشییە توێژەرێك لە بواری زانستە کۆمەلایەتیەکاندا. سەرۆکایەتی سەنتەری نەتەوەیی هەموانی تووشی سەرسوڕمان کرد، کاتێك ئەو مەدالیایەی (کە گەورەترین خەلاتی ئەو ناوەندەیە) بەخشی بە جێنشینی "ئەمیل دۆرکهایم"و سۆسیۆلۆژی مەزن "پیر بۆردیۆ".

ئەم خەلاتە تەنها بەو کەسانە دەدرێت کە لە بواری زانستە سروشتیەکان یان تەکنۆلۆژیادا داهێنانی تازە دەکەن،بەلام بە هەڵەدا چووین گەر وا بزانین زانستە مرۆڤایەتیەکان لە سەدەی نۆزدەدا تەنها بۆ گێڕانی ڕۆڵێکی سلبی دروستبوون، کە ئەویش: پەیبردنە بە یاساکانی کۆمەڵگاو ئاشنابوونە بە ڕەفتارو مەڵسوکەوتی تاکەکەس‌و گروپەکان، لە پێناو کۆنترۆڵکردنیان بە چاکترین شێوەو ڕێگرتن لە شۆڕش‌و پشێوی.

ئەوەی ڕاستی بێت زانستە مرۆڤایەتیەکان لە پێناو گێڕانی ڕۆڵی ئیجابیدا دروست بوون. ئایدیۆلۆژیستەکان‌و دواتریش بە تایبەتی کەسێکی وەك "سان سیمۆن" کە هەموویان خەونی پێشکەوتن‌و ڕۆشنگەری‌و بونیادنانی کۆمەڵگایەکی نوێیان هەبوو، باسیان لەم ڕۆڵە ئیجابییەی زانستە مرۆڤایەتیەکان کردوە.

وەك دەزانرێت "سان سیمۆن" لە تەمەنی چل ساڵیدا نیگای بۆ هات، دوای ئەوە وازی لە ژیانی پڕ سەرکێشی ڕابردووی خۆی هێناو تەنانەت حاشای لە بنەماڵەکەشی کرد (خۆی بە بنەچە دەرەبەگێکی گەورە بوو)، ئاواتەخواز بوو بنەماڵەکەیی‌و لەگەڵیدا تەواوی سستەمی دەرەبەگایەتی تەفرو تونا بکات. پاشان خۆی بۆ ژیانێکی نوێ تەرخانکرد: ژیانی زانست‌و فکرێکی سیاسی ڕۆشنگەرانە. پڕبەدڵ ئاواتەخوازی هاتنەئارای سەردەمی (سستەمی پیشەسازی)و دارمانی کۆمەڵگای کۆن بوو.

"سان سیمۆن" پێی وابوو شۆڕشی فەرەنسی هەموو ئەرکەکانی سەرشانی تەواو نەکردوەو پێویستە سەدەی نۆزدە بە تەواوکردنی ئەو ئەرکانە هەستێت. ئەوەتا تا ئێستاش پاشماوەی سستمی دەرەبەگایەتی ماوەو چینی خانەدانەکان پاڵیان لێداوەتەوەو خاوەن دەسەلاتی مەزنی خۆشیانن، بۆیە پێوستە ئەمانە رابماڵرێن بۆئەوەی سستمێکی نوێ دابمەزرێت. سیستمێك کە تەنها بە رووناکی زانست ئاوەدان و رۆشن بێت.

دەکرێت هەمان شتیش دەرهەق بەو گروپە بڵێین کە نازناوی ئایدۆلۆژیستەکانیان لە خۆیان نابوو (ئەڵبەتە لێرەدا مەبەستمان مانا ئیجابیەکەی چەمکی ئایدۆلۆژیایە، نەك بەو مانا سلبیەی ئەمڕۆ کە لە ئارەدایە). ئایدیۆلۆژیستەکانی ئەو سەردەمە کۆمەڵێك زانا بوون و هەریەکەیان پسپۆڕ بوون لە بواری پزیشکی و ماتماتیك و ئەندازەو مێژوو و فەلسەفەدا.

ڕەنگە لەبەرئەوەش بە ئایدیۆلۆژیستەکان ناوبرابن، چونکە دەیانویست زانستێك بۆ ئایدیاکان دابمەزرێنن. وەك دەشزانین چەمکی ئایدیاو ئایدیۆلۆژیا لە زمانی فەرەنسیدا یەك سەرچاوەیان هەیە. ئەوان دەیانویست زانستێکی وا دابمەزرێنن تا جێگای میتافیزیکای تەقلیدی بگرێتەوە. هەرچەندە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەوان گرنگیان بە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ دەدا، بەلام لە پاڵ ئەوەشدا زانستە سروشتی و بایەلۆژییەکانیشیان فەرامۆش نەکردبوو.

دەکرێت بڵێین ئەقڵیەتی ئەوان بوو توانی دواتر فەرەنسای نوێ بونیاد بنێت: واتە ئەو فەرەنسایەی لەسەر زانست و پێشکەوتن و ئازادی و ئایدیای دیموکراسیەت دامەزراوە. ئەمانە بەردەوام لە ململانێی و کێشمەکێشدا بوون لەگەڵ ئەو بەرەیەی دیکەی ناو ئەقڵیەتی فەرەنسی: واتە بەرەی کۆنسێرڤاتیڤەکان. بەرەیەك کە رقی لە رۆحی سەردەمی نوێ دەبوەو، حەزی بە گەڕانەوە دەکرد بۆ رابردوو، گەڕانەوە بۆ ئەو سستمە کۆنەی شۆڕشی فەرەنسی رایماڵی: تا ئێستاش ئەم بەرەیە ئامادەگی لەناو کۆمەڵگەی فەرەنسیدا هەیە، هەرچەندە بە بەراورد بە سەدەی نۆزدەهەم بچووك بۆتەوەو پاشەکشەی کردوە (ئەمە ئەو ئاقارەیە کە هەنووکە بەرەی راستڕەوە توندڕەوەکان بەسەرکردایەتی لۆبان تەعبیری لێدەکەن).

دوای ئایدۆلۆژیستەکان و "سان سیمۆن" کەسێکی دی دێت کە دەبێتە گرنگترین فەیلەسوفی فەرەنسی لە سەدەی نۆزدەدا: ئەو کەسەش "ئۆگست کۆنت"ە. ئەم پیاوە بە دامەزرێنەری فەلسەفەی پۆزەتڤیزم دادەنرێت، ئەو فەلسەفەیەی لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ (ئەگەرچی بە شێوەو شکڵی جیاوازیش بێت) کۆنترۆڵی ئەقڵیەتی فەرەنسی و سستمی فەرەنسی کردوە. "کۆنت" لە یەك کاتدا دوو شتی دژ بەیەکی لە خۆیدا کۆکردبۆوە، زانستێکی ماتماتیکی ساردو سڕو خەونێکی یۆتۆبیش. واتە ئەو بلیمەتی زانستە سروشتیەکان و بلیمەتی زانستە مرۆڤایەتیەکانی پێکەوە تێکەڵ کردبوو.

ئەو لە یەك کاتدا مامۆستای فیزیاو ماتماتیك و دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژیا بوو.. دەیویست هاوسەنگی بۆ کۆمەڵگەی فەرەنسی بگێڕێتەوە (دوای ئەوەی شۆڕشی پیشەسازی بونیادی ئەو کۆمەڵگایەی سەرەو ژێر کرد). ئەمە لە کاتێکدا ئەو خۆی لە ژیانی شەخسیدا هەموو جۆرە هاوسەنگی و دڵنیاییەکی لەدەست دابوو! لەبەرئەوەی داواکاریەکەی لە هەریەك لە قوتابخانەی (بۆلتیکنیك و کۆلێژ دی فرانس) رەتکرایەوە، بڕیاری دا لە ماڵەکەی خۆیدا وانەکانی بە هەندێك لە شوێنکەوتوان و خوێندکارە دڵسۆزەکانی بڵێتەوە. لە نێوان خوێندکارەکانیدا کەسانی وەك زانای بواری فیزیا کارنۆو زانای بواری




فیلۆلۆژیا ممبۆلت و زانای بواری ماتماتیك *بوانسۆو* پاشان گەورەپیاوی بواری بانکەکان *ئیشتاڵو* بیریارێکی وەك *ئەمیل لیتری* خاوەنی فەرهەنگی *لیتری* بەناوبانگ بە زمانی فەرەنسی، لەگەڵ *جۆن ستیوارت میلی* فەیلەسوفی ئینگلیزی، بەڵام کۆنت تەنها سێ دانیشتن بڕی کردو ئیتر دووچاری خەمۆکیو تێکشکانی دەروونی بوو. دواتر گواستیانەوە بۆ یەکێك لە نەخۆشخانەکان بۆئەوەی هاوسەنگی خۆی بەدەست بێنێتەوە. دوای ئەوە سەرلەنوێ گەڕایەوە سەر وتنەوەی وانەکانی لەژێر ناونیشانی: (چەند وانەیەك دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم) کە دواتر نێوبانگێکی باشی پەیداکرد. ڕەنگە یەکێك بپرسێتو بڵێت: چۆن دەکرێت مرۆڤێك لە ڕووی دەروونیەوە تا ئەو ڕادەیە پەشێوو ماندوو بێت، کەچی بشبێتە مامۆستای فیکرێکی مەنهەجی، نەك تەنها لە فەرەنسا بگرە لە تەواوی ئەوروپادا؟ چۆن دەکرێت ئەقڵ لە گونگوڵی دێوانەییو ڕووناکی لە ئامێزی تاریکیدا لە دایکبێتو سەر دەربێنێ؟ دەرهەق بەم پرسیارانە ئەمێستا ناتوانین وەڵامیان بدەینەوە، وەڵامیش نادەینەوە، بەڵکو بە کراوەیی جێی دێڵین بۆ ئایندە.. چونکە ڕەنگە لە لێکۆڵینەوەکانی داهاتوودا ناڕاستەوخۆ، ئەو وەڵامانە ببینینەوە.

لێرەدا تەنها ئەوە دەڵێم کە بەرلەوەی دەست بە خوێندنەوەی شتە شاراوەو نادیارەکانی ژیانی ئۆگست کۆنت بکەم، پێموابوو پیاوێکی ئەقڵانی توندوتۆڵەو کەلێن لە ژیانی شەخسی ئەودا نیە.

ئەی گوایە پۆزەتڤیزم ترۆپکی ئەقڵو ئەقڵانیەت نیە؟ ئایا پۆزەتڤیزم بە جۆرێك لە جۆرەکان، نەبوە مایەی بەرهەمهێنانی ژیاری تەکنەلۆژی خۆرئاوا؟ پێموابوو ئەو دوورترین کەسێکە لە دڵەخورپێو بۆنو بەرامەی ویژدانو ڕاچڵەکینی دڵو دەروون. پێم وانەبوو بۆ تەنها ساتێکیش ئەو لە لۆژیکی ماتماتیکی، یان بیرکردنەوەی ماتماتیکی ورد بێتە دەرێ. کەچی ڕووبەڕووی کارەکتەرێك بوومەوە جیاواز لەوەی وێنام کردبوو.

کۆنت بە درێژای ژیانی خۆی بەدەست کێشەی مادیەوە گیرۆدە بوو. ماوەیەك لەسەر یارمەتی خوێندکارە دەوڵەمەندەکانی دەژیا، بە تایبەت *جۆن ستیوارت میلو ئەمیل لیتری*. ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لەو دۆخە ناهەموارو پڕ نیگەرانیەدا، ئەو بەرهەمە تۆکمەو دانسقانەی پێشکەشکردو داهێنانی زانستی لەوپەڕیدا بوو.

هەرچۆنێك بێت وانەکانی "کۆنت" بە مەبەستو دوابەدوای یەك، باسی لە هەریەك لەم زانستانە کردبوو: ((ماتماتیك، گەردووnناسی، فیزیا، کیمیا، بایەلۆژیاو سۆسیۆلۆژیا)). وەك دەبینین زانستە مرۆڤایەتیەکان (کە بە سۆسیۆلۆژیادا) دیارە، لە دوا ڕیزبەندی ئەو پۆلێنکردنەدایە پاش زانستە سروشتیو ئەمبیریەکان. "کۆنت" سەرەتاو بەرلەوەی چەمکی /سۆسیۆلۆژیا/ دابهێنێت /سۆسیۆلۆژیا/ی بە /فیزیاناسی کۆمەڵایەتی/ ناودەبرد. *سان سیمۆنی* مامۆستاش بە (فیزیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی) ناوی دەبرد. زاراوەی یەکەم وەك دیارە لە زانستی فیزیا

وەرگیراوەو هەرچی دوەمیانە لە زانستی پزیشکی یاخود لە بایەلۆژیاوە خواستراوە. بە درێژایی لێکۆڵینەوەکانی دیکەمان دەبێت ئەم خاڵە لەبەرچاو بگرین، بە تایبەت کە دێینە سەر باسی زانستە مرۆڤایەتیەکان لە قۆناغی بونیادگەریدا. لە ڕاستیدا بونیادگەری چ نەبوو جگە لە جۆرێك لە پۆزەتیڤیزمی نوێ کە بە زانست سەرسام بوو. کاتێك کۆنت دەڵێت: *(فیزیای کۆمەڵایەتی)* مەبەستی لەوەیە کە چۆن زانایەکی بواری فیزیا لە مادە دەکوڵێتەوە، ئاوهاش دەکرێت تاوتوێی کۆمەڵگا بکەین.

وەك چۆن مادە لە گەردیلە پێکدێت، بەوجۆرەش کۆمەڵگا لە تاکەکەس دروستدەبێت. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا ئەرکی زانا لێکۆڵینەوەیە لە پەیوەندیەکانی نێوانیان. کاتێکیش *سان سیمۆن* دەڵێت: *(فیزیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی)* ئەوا دەیەوێت کۆمەڵگا وەك بونیادێکی ئۆرگانی تاوتوێ بکات، هاوشێوەی ئەو بوونەوەرە زیندوانەی زانایەکی بایەلۆژی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکات: دواتر سەرجەم زانستە مرۆڤایەتیەکان ((دەروونناسی زمانناسی، مێژووناسی، ئابووری ناسیو ڕەگەزناسی)) لاسایی زانستە سروشتیەکان دەکەنەوەو تەنها نمونەیەکی زانست کە ئەویش فەلسەفەی پۆزەتڤیزمە کۆنترۆڵی تەواوی خەڵکانی سەدەی نۆزدە (و تەنانەت تا ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووش) دەکات. ئەوە پۆزەتڤیزمە کە مۆدێرنێتەی کلاسیکی خۆرئاوا دروستدەکات، ئەو مۆدێرنێتەیەی لە دوای جەنگی دوەمی جیهانیەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند بۆتەوە.

لێرەدا ویستمان کەم تا کورتێك ئێستێك لە بەردەم ئارکیۆلۆژیای مۆدێرنیتەدا بکەین. واتە بەرلەوەی باس لەو ڕەخنەیە بکەین کە لەسەر دەستی میتۆدە تازەکانو فەلسەفەی نوێ ئاراستەی کراوە، دەبێت باس لە ڕەگو ڕیشەو بنجو بناوانی مۆدێرنیتە بکەین. بەمجۆرە دەتوانین بڵێین ئێمە لە میانەی دوو قۆناغی سەرەکیەوە: قۆناغی دروستبوونو گەشەکردن لە سەدەی نۆزدەوە، قۆناغی دەسپێکی نوێ لە نیوەی دوەمی سەدەی بیستەوە، باسمان لە زانستە مرۆڤایەتیەکان کردوە. چونکە ناتوانین لەوەی دواتر حاڵی بین گەر بێتو لەوەی پێشتر نەگەیشتبین. بەڵام دواجار دەبێ بپرسین ئاخۆ پۆزەتڤیزم یانی چی؟ پێویستە بزانین کە ئەم وشەیە لە تیرمی ((سیاسەتی پۆزەتڤیزم))ەوە وەرگیراوە کە کۆنت بۆ یەکەمجار لە ساڵی *1824*دا بەکاری هێناوە. ئەو بەم کارەی دەیویست جیاوازی لە نێوان بیروباوەڕی زانستی خۆیو تەواوی ئەو گەلە بیروباوەڕانەی دیکەدا بکات کە بە گەڕان لە جەوهەری شتەکانەوە سەرقاڵ بوون، چونکە بە بڕوای ئەو ((بیروباوەڕە تیۆلۆژیو میتافیزیکیەکان شایستەی ئەوە نین مرۆڤ زۆر لە ئاستیاندا بوەستێت)). لێرەدا تیۆریاکەی دەربارەی ئەو سێ قۆناغەی فیکری مرۆڤایەتی پێدا تێپەڕیوە دەرکسێت.

ئەو سێ قۆناغەش بریتین لە:

**-قۆناغی تیۆلۆژی.**

**-قۆناغی میتافیزیکی (یان فەلسەفی).**

**-قۆناغی زانستی (یان پۆزەتڤیستی).**

کۆنت پێی وابوو جێهێشتنی قۆناغێكو پێخستنە ناو قۆناغێکی دیکە، شتێکە ناکرێت لێی پاشگەز بینەوە. بەمجۆرە ئەوا قۆناغی زانست یان پۆزەتفیزم زۆر پێشکەوتووترە، چونکە بەرەنجامی بڕینی مێژوویەکی دوورو درێژو پڕ کەندو کۆسپی مرۆڤایەتیە، بەرەو پێشکەوتنو تێگەیشتنی زیاتر. کۆنت بەم کارەی لێکۆڵینەوەی فیزیایی دیاردەکانی لە لێکۆڵینەوەی میتافیزیکی جیاکردەوە. لەم بارەیەوە دەڵێت: *"تەنها لە ڕێی سەرنجدانی دیاردەکانەوە دەتوانین بگەینە مەعریفەیەکی*

دروست" . بۆیە پێویستە لەسەرمان تاقیکردنەوەی زانستی لەسەر دیاردەکان بکەین، بۆئەوەی ئەو یاسا نەگۆڕانەی لێدەربهێنین کە جڵەوی دەکەن‌و ئاراستەی دەکەن. زانست یان دەبێت ئەمبرقی بێت یان نەبێت. ئەم مەسەلەیەش وەك یەك زانستە سروشتی‌و زانستە مرۆڤایەتیەکان دەگرێتەوە. هەرچەندە ڕادەی زانستە سروشتیەکان زۆر ڕوونترو تۆکمەترە لە زانستە مرۆڤایەتیەکان. لەبەر ئەمەش کۆنت سۆسیۆلۆژیا لە دوا ڕیزبەندی زانستەکاندا دادەنێت.

بۆئەوەی بە دیدگای کۆنت‌و تەواوی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم ئاشنا بین، بوار دەدەین خۆی لەم بارەیەوە قسەمان بۆ بکات. لە بەشی یەکەم‌و لە لاپەڕەی سێیەمی کتێبە بەناوبانگەکەیدا (چەند وانەیەك دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم) دەڵێت: *"کاتێك ڕۆحی مرۆڤایەتی دەگاتە قۆناغی پۆزەتڤیزم، ئەوکات دان بەوەدا دەنێت کە گەیشتن بە چەمکە ڕەهاکان‌و جەوهەری شتەکان مەحاڵە، بەمەش دەست لە سۆراخکردن لە بنەچەی گەردوون دەکێشێتەوە، لەو پرسیارانەش دەکەوێت کە ژیان بەردو کوێ ملدەنێت. ئیتر تەنها گرنگی بە زانستی هۆکارە قوڵەکانی دیاردەکان دەدات، ئەویش لە ڕێگای بەکارهێنان‌و تێکەڵکردنی ئەرگومێنتی ئەقڵانی‌و سەرنج‌و تێبینی ئەمبرقیەوە. ئەوکات پەیوەندیە نەگۆڕەکان (یاخود یاساکانی) بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەو یاسایانەی شتەکان پێکەوە دەبەستن‌و بە یەکیانەوە گرێدەدەن".*

*III*

نابێت لە مەسەلەی پەیوەندی نێوان مەعریفەو دەسەڵاتدا زیادەڕۆی بکەین و، مەعریفە بکەینە پاشکۆو پاشبەندی دەسەڵات. چونکە مەعریفە سەربەخۆیی تایبەتی خۆی هەیە، بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی ئایدیۆلۆژیستەکانی فەرەنسا لە سالانی حەفتادا هێنابوویانە ئارا. وەك ئاشکراشە ئەم ئاقارە ئایدیۆلۆژیە لەم بۆچوونە پەرگیرەیاندا پشتیان بە تیۆریەکەی "میشیل فۆکۆ" بەستبوو (هەوڵدەدەین لە نووسینەکانی داهاتوودا باس لەم مەسەلەیە بکەین)، بەڵام بۆئەوەی لەو قەڵەمبازە گەورەیەی دوای ساڵانی شەستەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان بگەین، ئەوا دەبێت بە درێژی ئێستێك لە بەردەم دروستبوونی یاخود ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتیەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا بکەین، چونکە ئەستەمە بتوانین شتێك دەربارەی شارستانیەتی خۆرئاواو هۆکاری پێشکەوتن‌و بەهێزی بزانین، بێئەوەی ئاگاداری ئەو قۆناغە بین. هەروەها ناتوانین پچێك لەو موشتومڕانەی دوای جەنگی دوەمی جیهانی حاڵی بین (لە هەریەك لە فەرەنساو ئەڵمانیادا)، گەر بێت‌و نەچینەوە سەر سەرچاوەو ڕەگوڕیشەی ئەو گفتوگۆیانە لە سەدەی ڕابردوودا.

ڕەخنەگەلێك کە لە ماوەی سەردەمی بونیادگەریدا لە ئارەدا بوو، پەرچەکردار بوو بەرامبەر گەشبینی سەردەمی ڕۆشنگەری‌و هەژمونی بیروباوەڕی پۆزەتڤیزم لە سەدەی نۆزدەهەمدا. بە واتایەکی دی پرانسیپەکانی مۆدێرنێتی کلاسیکی خۆرئاوا کە لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا سەریان دەرهێناو پاشان لە سەدەی نۆزدەهەمدا چەکەرەیان کرد، پاش ئەوە تا دوەم جەنگی جیهانی کۆنترۆڵی ئەورووپاو تەواوی جیهانی کرد، ئێستا بۆتە جێی گومان‌و کەوتۆتە ژێر پرسیارەوە. ناتوانین لەو ڕەخنە توندو تیژانەش بگەین کە لە لایەن قوتابخانەی فرانکفۆرت‌و *میشێل فۆکۆوە* ئاراستەی مۆدێرنێتی کراوە، گەر بێت‌و لە خودی مۆدێرنێتی خۆی تێنەگەین. بەمجۆرە دەبینین هەندێجار گەڕانەوە بۆ دواوە کارێکی پێویستەو بگرە تەنانەت ناچاریشە.

سەرەتا باسمان لەوە کرد کە مەعریفە لە یەکەمین قۆناغیدا سەربەخۆیی‌و پاکی‌و بێگەردی

ڕەسەنی خۆی هەیە. فزولی مەعریفیش ناتوانێت دەستبەکار بێت، گەر هەر لە سەرەتایەوە کوشتەی هێزو خۆپەرستیو دەسەلات بێت، چونکە خواستی سەرەکی ئەو دۆزینەوەی مەعریفیە، نەک شتێکی تر بێت. مەعریفە دەیەوێت نهێنییەکانی سروشت ئاشکرا بکاتو تەلیسمەکانی گەردون بکاتەوە. هەروەها ئامانجی ئەوەیە خێرو خۆشی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات.

بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەم قسانەش هێندە بەسە چاوێك بە تێکستی گەورە بیریارانی وەك: "ڕینیە دیکارت، ئیمانوێل کانتو ئۆگست کۆنت"دا بخشێنین. هەریەك لەوانە دڵیان پڕ لە خۆشەویستیو خێرو چاکە بوو بۆ مرۆڤایەتی. ئەوان دڵیان بە مرۆڤ دەسووتاو بە تاسەوە بوون لە دواکەوتوویيو نەزانیو هەژاری ڕزگاری بکەن. زۆرجار ئەو کارەیان لەسەر حسابی ژیانی تایبەتی خۆیان دەکرد. بگرە دەکرێت بڵێین هیچ یەکێك لەوان ژیانی خۆیان نەژیانو خێزانیان نەبوو. ئەوەی ئەوان سەرقاڵی بوون */خێزانی گەورەی هەموو مرۆڤایەتی/* بوو، کارێك کە وای کرد ژیانی تایبەتی خۆیان بیرنەهێنێت.

هەریەك لە "دیکارتو کانتو کۆنت" پێیان وابوو ئەرکی ڕزگارکردنی کۆمەڵگاکانیان لەسەرشانی ئەوانە. لە ناخەوە هەستیان دەکرد بەوەی هەڵگری پەیامێکی قورسو گرانن، ئەمەش وایان لێدەکات لە پێناویدا قوربانی بە هەموو شتێك بدەن، شارستانیەتیش بەمجۆرە بونیاد دەنرێت.

پێویستە ئەوەمان لە یاد نەچێت دانیشتوانی ئەوروپا تا بەراییەکانی سەدەی نۆزدە، بە دەست ئەو کێشانەوە گیرۆدە بوون کە ئێستا میللەتانی جیهانی سێ بە دەستیانەوە دەناڵێنن، وەك: کێشەی هەژاریو دروستکردنی ژێرخان یاخود بنەمای مادی کۆمەڵگەو پاشان دامەزراندنی دامودەزگای سیاسیو بەدەست هێنانی ئازادیە سەرەکیەکانی وەك ((ئازادی ڕۆژنامەوانیو بڵاوکردنەوەو ڕادەربڕینو پێکهێنانی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان لەگەڵ مشتومڕی دیموکراسی)). کۆمەڵگەی فەرەنسی هەرچی جارێك دوو هەنگاو چووبێتە پێش، هەنگاوێك گەڕاوەتە دواوە، بۆئەوەی پشوویەك بداتو لە ئاکامی ئەو هەنگاوانەی ناویەتی حاڵی بێت. بۆ نمونە سەبارەت بە ئازادی ڕۆژنامەگەری لە فەرەنسادا، بە درێژایی سەدەی ناوەڕاست لەو ئازادیە پەشیمان دەبوونەوەو ڕێگەیان لێدەگرت، تا سەرەنجام بوە مافێکی شەرعیو پارێزراوو بۆ یەکجارەکی چەسپا. دەکرێت هەمان شتیش سەبارەت بە مافی مانگرتن لە لایەن چینی پرۆلیتاریاوە باس بکەین. ئێمە کە سەیری کۆمەڵگای ئەورووپی ئەمڕۆ دەکەین پێمان وایە بەردەوام وەها بوون: واتە سەرشار بوە بە مافو ئازادیو کارئاسانی و.. هتد، بەڵام ئەمە بۆچوونێکی میسالیو میتۆلۆژیو نامێژووییە بۆ شتەکان.

دیدگای مێژوویی پێمان دەڵێت کەوا چینی کرێکار بەرلەوەی تەنها مافێکی لە چنگی خاوەنکارەکان دەرهێنابێت، شەقامو گەڕەکەکانی پاریسی بە خوێن سوور کردوە. بۆ نمونە ئێمە بە ئاگاین لەوەی کە کرێکارێك لە ڕۆژێکدا پانزە سەعات کاری کردوە، واتە زیاتر لە سەد سەعات کار لە هەفتەیەکدا، بێئەوەی مافی ئەوەی هەبێت لەسەر کارەکەی خۆی بمێنێتەوەو بەردەوام بێت.

بەڵام ئەمڕۆ کرێکار لە هەفتەیەکدا کەمتر لە چل سەعات کاردەکاتو خاوەن مافێکی زۆریشە، ((کەمترینی بیمەی کۆمەڵایەتیو تەندروستیو مافی خانەنشینیو مافی مانگرتنو موچەی بێکاری.. هتد))، بەڵام لە نێوان سەد سەعات کارکردنی دوێنێو چل سەعات کاری ئەمڕۆدا، سەدەیەکی تەواو لە خەباتو ڕووبەڕووبوونەوەو خۆپیشاندانو سەدان کوژراو بریندار هەیە.

ئەو دەمەی ئۆگست کۆنت لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا سۆسیۆلۆژیای دامەزراند بیری لە هەموو ئەمانە دەکردەوەو خەمی تەواوی کۆمەڵگای لەکۆڵ نابوو. کاتێك بە یەکێك لە گەڕەکە هەژارەکاندا تێدەپەڕیو باری ناهەمواری چینە میللییەکانو کرێکاران (یاخود ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت پرۆلیتاریا)ی دەبینی، ترسو تووڕەیی دایدەگرت. لە نامەیەکیدا بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی دەنووسێت: *"ئەم بارە نالەبارەی چینی کرێکاران بە تەنها بەرەنجامی ئەوەیە کە ئێوە پێی دەڵێن سستمی کۆمەڵایەتی لە واقیعدا ئەم سستمە کۆمەڵایەتییەش جگە لە پشێوییەکی کۆمەڵایەتی شتێکی تر نییە، بۆ بەرژەوەندی چەند کەسانێکی بێکارو بێئیش دانراوە، ئەویش لەسەر حسابی بەرژەوەندی ژمارەیەکی زۆرتری خەڵك. ئەوەی کاردەکات هیچی نیەو ئەوەش کارناکات خاوەنی هەموو شتێکە"*.

کەواتە هۆکاری سەرەکی دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیا بە مەبەستی پاراستنی هەلومەرجی کۆن نەبوو، بەڵکو هەستکردن بوو بە ئێشو ئازارەکانی مرۆڤ. ڕاستە ئۆگست کۆنت هەستی بە تێکچوونی هاوسەنگیو ترسێکی دەروونی دەکرد لای زۆربەی زۆری ئەوەی سەردەمی خۆی، کە لە سەردەمی پشێویو نائارامی دوای شۆڕشی فەرەنسیدا ژیان، هەروەها ڕاستە کە ترس ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانی تایبەتی ئەو هەبوە وەك بیرمەندێکی هەست ناسك، کە زیاد لە مرۆڤێکی ئاسایی هەستی بە ئێشو ئازاری میللەتەکەیو سەردەمەکەی دەکرد.

لێرەوە پڕ بەدڵ حەزی دەکرد دڵنیاییو ئاسایشو ئارامی بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگای فەرەنسی کە بە هۆی شۆڕشەوە لە ناخەوە دووچاری شپرزەییو شیرازە تێکچوون هاتبوو. کۆنت خەونی بە سستمو ئارامی دوای گۆڕانەوە دەبینی نەك پێش گۆڕان، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو بیرمەندە کۆنسێرفاتیڤانەوە بوو کە خواستیان گەڕانەوە بوو بەرەو دواوە. ئەو پێی وابوو سستمی کۆن ڕووخاو کۆتایی هات، لە گەڵیشیدا ئەقڵیەتی تیۆلۆژی کاتۆلیکی هەرەسی هێنا. بۆیە پێویستە ئەقڵیەتێکی نوێو سستمێکی نوێ بێتە ئارا. تا تەواوی ئەو گۆڕانکاریانە لەبەرچاو بگرێت کە لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی ئینگلیزیو شۆڕشی سیاسی فەرەنسیەوە دروستبوون.

وەك تەواوی گەورە بیرمەندانی دیکە کۆنت بەر لە کەسانی دی هەستی بە بزاوتی مێژوو کردو، تێگەیشت کۆمەڵگای زانستیو پیشەسازی جێگای سستمی تیۆلۆژیو سەربازی گرتۆتەوە. هەروەها بە زەین ڕوونی خۆی حاڵی بوو لەوەی زانست بۆتە ئەلتەرناتیڤی باوەڕی مەسیحی تەقلیدیو زانایان جێگای پیاوانی ئاینیان گرتۆتەوە. تەعمیمکردنی ئەمەش بەسەر گەلی فەرەنسیدا تەنها پێویستی بە کات هەیە.

لە ئێستادا کە سەیری کۆمەڵگای فەرەنسی -یان ئەورووپی- دەکەین ناتوانین ئیعتراف بە هاتنەدی پێشبینییەکەی "ئۆگست کۆنت" نەکەین. ئەوەتا پزیشکی دەروونی لە پرۆسەی ((ئیعتراف کردن))دا جێگای پیاوی ئاینی گرتۆتەوە. توێژەری کۆمەڵایەتی لە مەسەلەی ڕێنوێنی کردنی خەڵکدا بۆ دۆزینەوەی جۆری کار یاخود گرتنەبەری ڕێگای گونجاو، جێگای پیاوانی ئاینیان گرتۆتەوە. پیشەسازانو ئەندازیارانو تەکنیکارانو کارمەندانی بواری ڕاگەیاندن، بوونەتە سەرداری کۆمەڵگا. هەروەها فتوای زانستی شوێنی فتوای ئایینی گرتۆتەوە. ئەوەی لەمڕۆدا فتوای چارەسەرکردنی کێشە تازەکانی کۆمەڵگا دەردەکات، پزیشكو زانایانی بواری کۆمەڵناسیو دەروونناس، یاخود زانایانی بواری زیندەوەرزانیو یاساناسانو فەیلەسوفەکانن، نەك پیاوانی ئاینی مەسیحی کە بە درێژایی چەندین سەدە کۆمەڵگایان خستبوە ژێر

ڕکێفی خۆیانەوە. ڕۆڵی پیاوی ئاینی دیاری کرا بەوەی دەبێت تەنها لە بواری ئاینیدا بێت و سنووری خۆی بزانێت. لەم پرۆسەیەش هەریەک لە کۆمەڵگاو ئاین سوودمەند بوون.

جێی باسە سەرەتاکانی ئەم بەرەو پێشچوونە لە تیۆریای سێ قۆناغەکەدا هەیە کە "کۆنت" هێنایە ئاراو بوە مایەی دروستبوونی فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم. وەک دەشزانرێت ئەمە ئەو تیۆریایەیە کە لە مێژووی فیکردا "کۆنت" ناوبانگی پێدەرکرد.

"ئۆگست کۆنت" بڕوای بە یەکێتی ڕەگەزی مرۆڤایەتی هەبوو، پێی وابوو تەواوی مرۆڤایەتی بە هەمان گۆڕانی مێژوییدا تێدەپەڕن و یەک یاسای کۆمەڵایەتیشیان بەسەردا جێبەجێ دەبێت. بۆیە بە پێویست هەموویان دەگەنە هەمان سستەمی کۆمەڵایەتی. ئەو دەیوت: *"درەنگ یان زوو سستەمی پۆزەتیڤیزم تەواوی گەلانی سەر زەوی دەگرێتەوە"*. بەلام بەر لە گەیشتن بە سستەمی پۆزەتیڤیزم (یان زانستی) مرۆڤایەتی بە دوو قۆناغی یەک لە دوایەکدا تێپەڕیوە: یەکەمیان قۆناغی تیۆلۆژییە، دوەمیشیان قۆناغی میتافیزیکییە.

دواتر قۆناغی پۆزەتیڤیزم دێت بۆئەوەی دوو قۆناغی پێشووتر وەلاوە بنێت و بە تەواوەتی جێگایان بگرێتەوە، بەو پێیەی قۆناغی پۆزەتیڤیزم کۆتایی گەشەی مرۆڤایەتیە. لە دوو قۆناغی ڕابردوودا (تیۆلۆژی و میتافیزیکی) مرۆڤ پێی وابوو دەتوانێت بگاتە مەعریفەی ڕەها، واتە بگاتە جەوهەری شتەکان. قۆناغی تیۆلۆژی لە ڕێی هێزە شاراوە نادیارەکانەوە تەفسیری دیاردەکانی دەکرد، هەرچی قۆناغی میتافیزیکیشە (کە پاشماوەی فەلسەفەی یۆنانییە) لە ڕێی جەوهەرە ئەبستراکت و حەقیقەتە گشتگیرەکانەوە دیاردەکانی لێک دەدایەوە. پاشان قۆناغی پۆزەتیڤیزم هات بۆئەوەی ئاستێک بۆ هەموو ئەو خەیاڵ پلاوو تێرامانە میتافیزیکیانە دابنێت.

پۆزەتیڤیزم دەیوت: *"تەنها مەعریفەیەک کە شیاو بێت، زانینی یاسا زانستیەکانە، ئەو یاسایانەی ئاراستەی دیاردەکان دەکات و دەتوانین لە ڕێی ئەزموونی فیعلیەوە پێیان بگەین"*. لێرەوە پێویست بەوە ناکات خۆمان ماندوو بکەین و کات بە فیڕۆ بدەین تا جیهانی میتافیزیک کەشف بکەین، چونکە شتێکی وەهای تێدا کە نیە عەقڵی مرۆڤ نەتوانێت پەی پێبەرێت. سەبارەت بەم مەسەلەیە دەکرێت "کۆنت" بە درێژەپێدەری "ئیمانوێل کانت" دانێین لە ڕەخنەگرتنی لە ((ئەقڵی پەتی))، واتە ڕەخنەگرتنی لە ((ئەقڵی میتافیزیکی)).

ئیتر لێرە بەدواوە زانایان و تەکنۆکراتەکان دەبنە گەورە پیاوانی ئاینی مرۆڤایەتی، نەک کەسانێکی تر. بەلام با بپرسین ئایا خەسڵەتە سەرەکیەکانی ڕۆحی پۆزەتیڤیزم چیە، کە ئێستا بەسەر ئەقڵیەتی مرۆڤی ئەوروپیدا زاڵە؟

ئەڵبەتە ناتوانین لە ئەقڵیەتی ئەوروپی و چۆنیەتی سەیرکردنیان بۆ مەسەلەکان و تەنانەت لە هۆکاری سەرکەوتن و باڵادەستیان لە ڕووی تەکنۆلۆژیەوە تێبگەین، گەر بێت و ئەو خەسڵەتە سەرەکیانە ڕوون نەکەینەوە. دەکرێت بڵێین خەسڵەتە سەرەکیەکانی پۆزەتیڤیزم بە گشتی بریتیە لە: *بە کەم سەیرکردنی میتافیزیک، گرنگیدان بە واقیع و ئەزموون و بەڵگە، متمانەیەکی تەواو بە زانست، ستایشکردنی دەسکەوتە زانستیەکان، بەخشینی شێوەیەکی زانستی بە لێکۆڵینەوەی دیاردە ئەخلاقی و ئینسانی و کۆمەڵایەتیەکان...*

ئەمە ئەو ئەقڵیەتەیە کە لە نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بەسەر نەوەیەک لە بیریاران و زانا فەرەنسیەکانەوە باڵادەست بوو، لەوانەش: ((ئەرنست رینانی فەیلەسوف، ڕەخنەگری ئەدەبی هیپۆلیت تین، زانای بەناوبانگ لویس پاستۆر، کلۆد بێرنارو لیتری.. هتد)).

هەوڵ و کۆششەکانی کۆنت دوای ماوەیەکی کەم مەبەستی خۆیان پێکاو، دوای مردنیشی تێزەکانی بەسەر تەواوی بیرو بۆچوونەکانی تردا سەرکەوت. دواتر لەناو داموو دەزگا فێرکاریەکانی فەرەنسادا ڕەگی داکوتاو فۆرمێکی ڕەسمی وەرگرت، کارێك کە وای کرد بایەخ و کاریگەری زانستی زیاتر بێت. کۆماری سێیەمی (واتە ڕژێمی سیاسیی فەرەنسای نوێ) دامەزراند، تەبەنی فەلسەفەی پۆزەتڤیزمی کرد. "جۆل ڤێری" یەکێك لە گەورە ئەدیبان و دەستەی دامەزرێنەری کۆماری سێیەم سەرسامی خۆی بە پۆزەتڤیزم و بە ئۆگست کۆنت نەدەشاردەوە.

"ڤێری" بەو پێیەی خۆی سەرپەرشتی دامەزراندنی قوتابخانەی عەلمانیەتی نوێی لە فەرەنسادا کرد، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بیرو بۆچوونی فەلسەفەی پۆزەتڤیزم لەو قوتابخانەیەدا بڵاو بکاتەوە، لەوێشەوە بە دەرەوەی بگەیەنێت. دەسەڵاتی سیاسی فەرەنسا پۆزەتڤیزمی کردە چەکێك یاخود ئایدیۆلۆژیایەکی کارا بۆ دژایەتیکردنی هەموو ئەو ئایدۆلۆژیایانەی دیکە کە لە فەرەنسادا باڵادەست بوون (وەك مەزهەبی کاتۆلیکیەت).

هەروەك یەکێك لە گەورە مێژوونووسانی ئاینەکانی ئەمڕۆی فەرەنسا "ئەمیل بۆلا" دەڵێت: *"فەرەنسای مۆدێرن، بەرهەمی ئەو ململانێیەیە کە زیاتر لە سەدەو نیوێکە لە نێوان کاتۆلیکیەت و بەرەی عەلمانی، یاخود پۆزەتڤیزمدا لە ئارەدایە"*. تەنانەت هەموو هەوڵی "ئەمیل دۆرکهایم"ی میراتگری شەرعی "ئۆگست کۆنت" بە جۆرێك لە جۆرەکان بۆ ئەوەبوو لەسەر دارو پەردووی کاتۆلیکیەت کە شۆڕشی فەرەنسی ڕایماڵی، ئاینێکی عەلمانی دابمەزرێنێت.

لە دوای هەرەسی کاتۆلیکیەت فەرەنسا لە ڕووی دەروونیەوە هەستی بە بوونی بۆشاییەك دەکرد، بۆیە دەبوو گەورە بیریارانی فەرەنسا ئایدیۆلۆژیایەکی ئەلتەرناتیف یاخود "ئاینێکی ئەلتەرناتیف" بدۆزنەوە، بۆئەوەی بە شێوەیەکی ترسناك هاوسەنگی کاراکتەری کۆمەڵایەتی تێك نەچێت و شیرازەی ئەو کۆمەڵگایە نەپچڕێت. لێرەوە وەك ئەلتەرناتیڤێکی سستمی کلتوری و ڕوحی پێشوو، عەلمانیەت و مۆدێرنێتی هاتنە ئارا، بەڵام نابێت پێمان وابێت ئایدیۆلۆژیای نوێ بە یەك جارو لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا دروست بووبێت، بەڵکو کاتێکی زۆری ویست بۆ ئەوەی برسکێت و شوناسی تایبەتی خۆی وەرگرێت. ئەمەش لە میانەی ململانێ کردنیدا بوو لەگەڵ مەزهەبی کاتۆلیکی و مەشروعیەتی کۆندا.

ئەم ململانێیەش ململانێیەکی /دیالەکتیکی، ناوخۆیی، سروشتی، قۆناغ بە قۆناغ/ بوو. بەڵام هەندی کات توندوتیژیش بوو. بۆئەوەی لەمە دڵنیا بین هەر کتێبێکی مێژووی ئەو قۆناغە هەڵبەینەوە بەسە تا ڕاستی ئەو ڕووداوانەمان بۆ دەربکەوێت. ئێمە لێرەدا دەگەڕێینەوە سەر کتێبەکەی *ئەمیل بۆلا* ((ئازادی، عەلمانیەت: شەڕی هەردوو بەرەی فەرەنساو پرانسیپی مۆدێرنێتی)) چاپی ساڵی *1988*. پاشان سەرنج بدە کتێبێکی دیکەی بە ناوی ((کڵێسای بۆرژوازیەت)) چاپی ساڵی *1979*.

گەورەترین بەڵگەش لەسەر تەبەنی کردنی پۆزەتڤیزم لە لایەن کۆماری سێیەمەوە بە شێوەیەکی ڕەسمی، ئەوەیە "جۆرج کلیمینسۆ" یەکێك لە گەورە سیاسەتمەدارەکانی فەرەنسای کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست، هەستاوە بە وەرگێڕانی کتێبێکی "جۆن ستیوارت میل" دەربارەی "ئۆگست کۆنت".

هەروەها "ئەمیل لیتری"ی خوێندکاری "کۆنت" بەشداری لە بڵاوکردنەوەی پۆزەتڤیزمدا هەبوە، بە شێوەیەکی زۆر پەرگیرانە. تەنانەت لەسەر دەستی ئەم، پۆزەتڤیزم دەبێتە جۆرە ئاقارێکی زانستی پەرگیر، وەك ئەوەی لەمڕۆدا بە "زانستگەرایی" ناوی

دەبەین. "ئەمیل لیتری" تەنها هەر زاناو ڕۆشنبیر نەبوو، بەڵکو ئەندام پەرلەمان و هاوڕێی گەورە دەسەڵاتدارانی کۆماری سێیەم بوو، لەوانە: "گامبیتا، جۆل ڤێریو.. هتد".

کاتێك "لیتری" بە یارمەتی "جۆل ڤێری" کاندید کرا بۆ ئەکادیمیای فەرەنسی "دۆبانیلۆ" یەکێك لە گەورەترین نوێنەرانی حیزبی کاتۆلیکی کۆنسێرڤاتیف، دەستبەجێ لەو ئەکادیمیایە کشایەوەو وتی: *"لە جێگایەکدا دانانیشم کە پیاوی مادیو زەندیقو بێباوەڕی لێبێت!"*.. ئەمە لەو کاتەدا بوو ململانێیەکی توندوتیژ لە نێوان پیاوانی کڵێساو ئەو عەلمانیانەدا هەبوو کە بە توندی داکۆکیان لە بیروباوەڕی هاوچەرخو مۆدێرنێتی دەکرد.

لەم ململانێیەشدا "پاپا" پشتیوانی لە حیزبی کاتۆلیکی فەرەنسی دەکرد، هانی دەدان بۆئەوەی تەسلیمی کۆماری سێیەم نەبن. هەربۆیە فتوایەکی دەرکردو تیایدا ئیدانەی سەرلەبەری یاساکانی کۆماری سێیەمو بیرو بۆچوونەکانی مۆدێرنێتی کرد. بەڵام حیزبی کاتۆلیکی لەم ململانێیەدا بە یەککگرتوویی نەمایەوەو بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان دژ بەو یاسایانە بوونو هەندێکیشیان داکۆکیان لێدەکرد. بەڵام دواجار ناچاربوون ملکەچی ئەمری واقیع بنو سستمی کۆماری پەسەند بکەن. ئەمە لە دەوروبەری ساڵی *1890*دا بوو، واتە سەد ساڵ دوای شۆرشی فەرەنسی! هەروەها ڤاتیکان دوای چاوەڕوانیەکی زۆرو لە ساڵی *1961*دا بە ڕەسمی ئیعترافی بە جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ کرد.

بیرو بۆچوونەکانی مۆدێرنێتی دوای چاوەڕوانیەکی زۆر توانیان خۆیان بەسەر کۆمەڵگا ئەوروپیەکاندا بسەپێنن. تەنیا ئەو کاتەش مۆدێرنە توانی بە تەواوی ڕەگ دابکوتێ کە حیزبی کاتۆلیکی یان لانی کەم ڕۆشنگەرەکانی ناو ئەو حیزبە، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستدا بوونە لایەنگری مۆدێرنەو دەستیان لە دژایەتیکردنی هەڵگرت.

دڵنیایی ڕۆحیش تەنها ئەوکاتە گەڕایەوە بۆ فەردەکانی کۆمەڵگا کە مەسیحیەکان دەستیان کرد بە گەورەترین پرۆسەی چاکسازی ئاینی لە دوای چاکسازیەکانی "مارتن لوثەر"ەوە، ئەویش لە ڕێی سەرلەنوێ لێکدانەوەی تێکستە ئاینیەکانو پێداچوونەوە بە فتوا ئاینیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا، بە جۆرێك تا لەگەڵ هەلومەرجی سەردەمو دەسکەوتە تازەکانی مۆدێرنەدا بگونجێت.

بیریارە مەسیحیەکان (ئەوانەی ژیرانە بیریان دەکردەوە) گەیشتنە ئەوەی ناکرێت تا سەر شەڕ لەگەڵ سەردەمدا بکەن، بۆیە چاکتر وایە بە شێوەیەکی ئیجابی خۆیان لەگەڵ مۆدێرنەو دەسکەوتەکانیدا بگونجێنن.

هاوکات هەستیانکرد گەر بێتو بەردەوام بن، لەسەر دواندنی خەڵك بە هەمان زمانی ئاینی کۆن، ئەوا تەواوی پلەو پایەکانی خۆیان دەدۆڕێننو کەسێك نابێت گوێیان لێبگرێت. لەم سەروبەندەدا ئەو بزاوتە تیۆلۆژیە بەناوبانگە دەستیپێکرد بەناوی "قەیرانی مۆدێرنێتی". دەرهەق بەم مەسەلەیەش پیاوانی ئاینی بوون بە دوو بەشەوە: بەشێك لەگەڵ تازەکردنەوەیەکی گونجاوو نوێکردنەوەی عەقیدەو تیۆلۆژیاوە، پراکتیزەکردنی میتۆدی مێژوویدا بوون بەسەر دەقە پیرۆزەکانیداو بەشەکەی دیکەش سەرلەبەر دژی ئەو هەنگاوانە بوون. ئەم کێشمە کێشو ململانێیە زۆر توندو ترسناك بوو، لە بەرمبەردا مەسیحیەتی ئەورووپیش باجێکی قورسی دا، بەڵام سەرکەوتوانە هاتەدەرێو توانی خۆی پاك بکاتەوەو، هەرچی پاشماوەی سەدەکانی ناوەڕاستە لە خۆی داماڵێو لەگەڵ سەردەمو کۆمەڵگاو مۆدێرنەدا

هەڵبکات، بە جۆرێک ئەم کارە بە سوودو قازانجی هەموو لایەک بگەڕێتەوە.

لێرەدا بە مەبەست لەسەر ئەم خاڵە ڕاوەستام، بۆئەوەی ئەو دوو وەهمە بەتاڵ بکەمەوە کە لە جیهانی عەرەبیدا باوەو باسی لێدەکرێت. یەکەمیان ئەوەیە عەلمانییەت لەگەڵ ئیلحاددا تێکەڵ دەکرێت، کەچی زۆر لە دەسەڵاتدارانی ئەوسای فەرەنسا لەسەر ئاستی شەخسی کەسانی ئیماندار بوون‌و ڕێزیان لە بیروباوەڕی ئیمانداران دەگرت‌و ڕێیان نەدەدا کەس سووکایەتیان پێبکات، بە مەرجێك ئەو بیروباوەڕانە سنووری خۆیان نەبەزاندایەو هەڕەشەیان لە ئازادییەکانی خەڵك نەکردایە، لە پێش هەموویشیانەوە ئازادی فیکرو ڕادەربڕین. دوەمیان پێی وایە پۆزەتڤیزم بە تەواوەتی مەسیحیەتی لە فەرەنسادا ڕامالیوەو هەموو کۆمەڵگای فەرەنسیش بۆتە کۆمەڵگایەکی پۆزەتڤیستی پەرگیری مادی‌و بێباوەڕو.. هتد.

بێگومان ئەوە سەیرکردنێکی ئەفسانەیی مەسەلەکانە نەك سەیرکردنێکی مێژوویانە بێت. چونکە چین‌و توێژەکانی مەسیحیەت ماون‌و هەندێ جاریش بە شێوەیەکی بەهێز دەردەکەون، بەڵام هەنووکە مەسیحیەتێکی بە عەلمانیکراو بە مۆدێرنە کراوە، جگە لە تاقمێکی کەمی دۆگما نەبێت، ئەوانیش بە تەواوەتی پەراوێز کەوتوون. گەر مەسیحیەت سوور بوایە لەسەر ڕەتکردنەوەو ئافەرۆز کردنی کلتوری نوێ‌و میتۆدی مێژوویی، ئەوا لەوانە بوو بە تەواوەتی بپوکایەتەوەو لەناو بچوایە.

هەرچۆنێك بێت پۆزەتڤیزم هەموانی ناچارکرد بە خۆیاندا بچنەوەو سەرەتای قۆناغێکی تازەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕەنگرێژ کرد. ئەو سەرکەوتنە تەکنۆلۆژیەی لە پۆزەتڤیزم کەوتەوە تەواوی گەلانی سەرزەوی سەرسام کرد. هەربۆیە هەندێك بیرو بۆچوونی پۆزەتڤیزم گەیشتە ناوچەکانی دیکەی جیهان، وەك ئەمریکای لاتینی‌و جیهانی عەرەبی‌و ئیسلامی. تەنانەت شۆڕشی بەرازیلی کە لە ساڵی 1881دا بەرپا بوو بەرهەمی دەستی پۆزەتڤیزم خوازەکان بوو. لەوکاتەوە ئیتر ئاڵای بەرازیلی دوو دروشمی پۆزەتڤیزمی وەك ((سستم‌و پێشکەوتن))ی لەسەر نووسراوە. میسرو تونس‌و وڵاتانی دیکەی عەرەبیش لە ڕێی پۆزەتڤیزمەوە بە مۆدێرنیتی ئاشنابوون، ئەویش لە ڕێی ئەو خوێندکارو دەستەبژێرە ڕووناکبیرانەی کە بۆ خوێندن دەچوونە خۆرئاوا.

ئەم مەسەلەیەش زیاتر بەسەر تورکیادا دەچەسپێت. "ئەتاتورك" کە لە شاری تۆلۆزی فەرەنسی ئەکادیمیای سەربازی دەخوێند، هەوڵیدەدا تەواوی پۆزەتڤیزمی فەرەنسی بگوازێتەوە بۆ وڵاتەکەی. ئەمەش لە سەرەوەڕا بەسەر کۆمەڵگای تورکیدا سەپاندی‌و پێی وابوو بەم کارەی تورکیای بە تەواوەتی بردۆتە ناو مۆدێرنێتیەوەو لە شەوەزەنگی سەدەکانی ناوەڕاست دەریهێناوە. سەرەنجامیش ئەوەبوو کە هەموومان دەیزانین. تورکیا نەیتوانی ببێتە نمونەیەکی وا کە وڵاتانی دیکەی ئیسلامی یان عەرەبی چاوی لێبکەن، بەڵکو بوە نمونەیەکی تەواو پێچەوانە کە پێویستە خۆی لێ بەدوور بگیرێت.

هۆکەشی ئەوەیە عەلمانیەت‌و پۆزەتڤیزم‌و مۆدێرنێتی تورکیا بە شێوەیەکی خۆڕسك‌و سروشتی لە ناوەوە نەڕسکاون، بەڵکو بە ئامادەکراوی لە دەرەوە هێنراون. لە ژێرەوە سەری دەرنەکردوە، بەڵکو لە سەرەوە سەپێنراوە. ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەزموونی فەرەنسایە کە لە ناوەوەو قۆناغ بە قۆناغ‌و لە ڕێ ململانێیەکی دروستەوە، بەم پرۆسەیەدا تێپەڕیوە. سەرەڕای ئەوەش ئەزموونی "ئەتاتورك" ئاستی تێگەیشتنی میللەت‌و ئەو هەستە ئاینیە قوڵەی کۆمەڵگای تورکی لەبەرچاو نەگرتبوو، یان هەوڵی نەدابوو جۆرە هەماهەنگیەکی دیالەکتیکی

لە نێوان ترادسیۆنی ئیسلامیو میتۆدو بیروبۆچوونەکانی مۆدێرنێتیدا دروستبکات. بەڵکو کاری ئەو پێکەوە لکانو کۆکردنەوەی دوو شتی ناکۆکو دژ بەیەك بوو. کارێك کە بوە مایەی ئەوەی دوو کۆمەڵگەی دژ بەیەك (کۆمەڵگای دەستەبژێرە ڕوناکبیرو بورژوازیەکانی ناو شارەکان لە لایەك، تەواوی هاوڵاتیانی دیکە لە لاکەی دی) لەناو کۆمەڵگای تورکیدا دروستبێت.

کەواتە بۆئەوەی ببینە مۆدێرن هەر ئەوەندە بەس نیە بیروبۆچوونی مۆدێرنێتی یاخود ئامێرەکانی تەکنۆلۆژیا بگوازینەوە، یان پیتەکانی زمانەکەمان بگۆڕین! چونکە نوێگەری ڕاستەقینە ئەو نوێگەریەیە کە ڕەگوڕیشەی بە قوڵایو زەویدا دادەکوتێت، ئەمەش بەرەنجامی هەوڵو ماندوو بوونێکە دەبێت خۆمان پێی هەستین وەك چۆن لە ئەوروپا ڕوویدا. بە واتایەکی دی نوێگەری ڕاستەقینە ئەوەیە کە باجی بۆ دەدرێت، نەك لە دەرەوە بخوازرێت. ئەم قسانە تەنها نوێگەری سیاسی یان پیشەسازی یاخود زانستی ناگرێتەوە، بەڵکو تەنانەت بواری ڕەخنەی ئەدەبیش دەگرێتەوە. ئەوەتا ئێمە دەبینین چۆن چۆنی میتۆدەکانی ئەم ڕەخنەیە بە ئامادەکراوی لە خوارئاواوە دەهێنرێت و، پاشان وەکی خۆی چۆن هەیە بەسەر شیعری کۆنو نوێی عەرەبیدا پراکتیزە دەکرێت.

### سەرچاوە

ماشم صالح: قراءة في الفكر الاوروبي الحديث- الطبعة الاولى، *1994*.

# هاووڵاتیی جیهانی یان ناسنامەی ئەوروپی*

## ڕەخنەیەکی لۆکسیمبۆریانە لە مانۆئیل کاستیلس

■ یوهان لۆنروت

● و. لە سویدیەوە: ئیدریس ئیبراهیم گەلاڵەیی

کاستیلس لە شاکارە مەزنەکەی *دوا ساتەکانی سەدەی بیست*دا کارێکی شایستەی کردوەو دەتوانرێت وەك بەرهەمێکی بەپێز لەگەڵ سەرمایەی مارکس بەراورد بکرێت، کاستیلس بە پێچەوانەی مارکس پیاوێکی نەرمە، من ناتوانم بە هیچ شێوەیەك بە زیادەڕۆیی داخوازیەکانی تاوانبار بکەم. لەو تێکستانەی کە وەڵامی داخوازییەکان دەداتەوەو بنچینە تیۆرییەکان لێکدەداتەوە، ئەو لە چاوپێکەوتنێکی ئەلکترۆنیدا لە ژێر ناونیشانی "ئایندە ئێستامانە" کە لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییە پەیوەندی تۆڕەکانی کۆمەڵگا بە هێلکارێکی لۆژیکی ناو دەبات، ئامانجیش ئەوەیە پشتیوانی چوارچێوەی ئەناتیزەکراوی ساختمانەکەی ئیلهام بەخشین باشتر بکاتو بە بەردەوامی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات.

لەگەڵ بە ساڵاچووونمدا، تا دێت زیاتر بە گومان دەبم بەرانبەر بە هەموو لێکۆڵینەوەیەك کە پەیوەندی هەبێ بە تیۆری کۆمەڵگا، زیاتریش بیر لەوە دەکەمەوە ئەو ئەگەرانە بخەمە ژێر پرسیارەوە کە باس لە داهێنانی "چوارچێوەیەکی ئەنالیزمی هاوبەش" دەکەن، کە ئاستیان زۆر لەوە کەمترە کە "کاستیلس" باسی دەکات، هەموو ئەوانەی پێیان دەڵێن "زانستی کۆمەڵگا" لێکۆڵینەوە تایبەتیەکان، کە لەسەر ئەساسی بیری کۆمەڵگا دروستکراون، وەك ئابووری نەتەوەیی، زانستی، سیاسی و سیسۆلۆژی، ئەمانە گەردەلوولێکن بەرەو کەشکەلانی ئاسمان هەڵدەچنو لێکچوونیان لەگەڵ ژیانە قەرەباڵغەکەی گۆی زەمین لێك دوور دەکەوێتەوە. مرۆڤ دەتوانێ وەك "کاستیلس" چەندین تیۆری وازی مۆدێرنو تیۆری هەڵبژراوی لۆژیکی، زیادبکات. مرۆڤو کۆمەڵگاکەی بە شێوەیەك پڕە لە ململانێو ئاڵۆزکاری، دەتوانرێت تەنیا لەناو قەفەزێکی تیۆری زیندانی بکرێن، بەڵام من پێشوازی لە هەڵەکانی کاستیلس دەکەم کە لە چوارچێوەیەکی فراواندا لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کۆمەڵگای زانیاری دەکات.

لە هەمانکاتیشدا ڕێگا بۆ ڕەخنە واڵا دەکات، یەکەمجار کاتێ شێوەی هەیکەلی گشتی تیۆرەکەم خوێندەوە لە ڕاستیدا هەستم بەوە کرد ئەو فکرەیە ئەوەندە جێی سەرنجم نیە کە دەڵێت *تۆڕی زانیاری بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگای مۆدێرنە*، گریمان ئەوە مارکسە کۆنەکەیەو سیحر دەکات. بەهانەکانی من دژی کاستیلس دزینی ڕەخنەیەکی مارکسیە لە ئابووری سیاسی لیبرالی هاوچەرخ. چۆنیش سیگنالە* نادیارەکانی تۆڕی پەیوەندییەکان لە گەردوونی کۆمپیوتەری پەیوەندیە مرۆڤایەتییەکان دەشارڕێتەوە، بە هەمان شێوەش بە گوێرەی مارکس خەباتی چینایەتی لە پاش ئاخنی دیاردەکانی بازاڕی دراودا دەشارڕێنەوە، من لەو باوەڕەدام بەشێك لە تۆڕی پەیوەندییەکانی "Network"ی کاستیلس لە ئەنجامدا هەمان ڕۆڵ دەبینن کە ئاماژە شاراوەکانی "ئادەم سمس– Adam Smith" دەبینێ و دەسەڵات دەشارڕێتەوە، با بە شێوەی کاستیلس چەمکی سەرمایە، سەرمایەدارو سەرمایەدارێتی بەکار بهێنین، ئەو لە نووسینەکەی خۆیدا دەڵێت: تۆڕی پەیوەندی زانیاری بازاڕی دارایی جیهانگیری، سەرمایەداری هاوبەش پێکدەێنێ و سەرمایەی زانیاری کۆن بۆتە هۆی داهێنانی مرۆڤێکی ئالی، بەمشێوەیە سەرمایەدار دەشارێتەوە.

مرۆڤیش بە گۆشت و خوێنەوە دەکا بە بازاڕێك یان پەیوەندی تۆڕەکان و سەرمایە –ئامرازەکانی دەسەڵاتیش دەکات بە مرۆڤێکی "ئالی". بە بۆچوونی من و لە ڕاستیدا ئەوە سەرلێشێوانە، چەمکەکە دەتوانێ پشتیوانی لە ئەفسانەی خۆشەویستی ئابووری بورژوازی نەتەوەیی بکات کە سەرمایەداری بەمشێوە بەرهەمهێنانە بە فۆرمی سوڕی بازاڕ یەکسان دەکات. هەروەها ڕەخنەم لە نووسینەکانی کاستیلس هەیە دەربارەی هێزی بزوێنەری بنچینەکانی سەرمایەداری، ئەگەرچی ئەو پارێزگاری لەخۆی دەکات کە ئەو لەو بەشەدا بۆچوونەکانی لەگەڵ زۆربەی ئادیۆلۆژیەتی سیاسی ئەکادیمیەکانی بەرەی چەپ هاوبەشە. "لە پێشنیارە تازەکەی بەرنامەی سوشیال دیموکراتیەکانی سویددا سەرمایەداری وەك سیستەمێك دەناسێنێ کە قازانجی بەرژەوەندی هێزی بزوێنەری بنچینەکانە، بەڵام کاستیلس چەمکی سەرمایەداری بەمشێوەیە پێناسە دەکات: *سەرمایەداری چەمکێکە ئامانجی پرنسیپەکەی ئەوەیە کە ئیدارەی ڕێکخراوی کۆمەڵگا بکات، دەستکەوتنی دراویش پرنسیپەکە دادەپۆشێ. ئێستاش زانیاری ڕێکخراو کۆمەڵگاکەیەو بە سەرمایەوە بەستراوەتەوە.*

من (عادەتم) نیە هەواردارێکی باوەڕپێکراوی مارکس بم، بەڵام لە ڕاستیدا لەو خاڵەدا من کۆنسەرڤاتیزم "کۆن خوازم"، چونکە بۆ من سەرمایەداری سیستەمێکی پەیوەندی کۆمەڵایەتیەو دیاردەی دەسەڵاتە. کە لە ژێر پەردەی قازانج و موچەو قەبارەی دراودا باشتر وەدیار دەکەوێت و ڕووکارەکان دەشارڕێتەوە، لە سەرمایەداری مۆدێرنیشدا ئەو دیاردانە بە شێوەیەکی فراوان بەشێکن کە "سیگناڵەکانی" ئەلکترۆنی و بەیەك گەیشتنی تۆڕی پەیوەندییەکان، وەك مارکس دەڵێت؛ *دەستکەوتنی دراو پرنسیپی سێیەرداری سەرمایەداری نیە*، هەروەها وەك فاوست گوتە دەڵێت: *سەرمایەدار گۆشەگیرە لە نێوان ژیانێکی ئاسوودەو دەسەڵات*، خوازیاری دەسەڵات زیاتر هێزی بزوێنەری بنچینەکانە لەوەی قازانج بێت، قازانج و دراو پێوسترین ئامرازن بۆ داگیرکردنی دەسەڵات هەروەها بە پێچەوانەشەوە، من هاوڕام لەگەڵ کاستیلس لەمەڕ چین و کوباش کە لە لایەن سەرمایەداریەوە داگیرکراون ئەمرۆ لەوێ دەزگای سەرمایەداری هەن کە قازانجی گەورە دەکەن، بەڵام

ئەوان بە دەگمەن دەسەلات بەکاردێنن، ئەوان سنورێکی تەسکیان هەیە، چونکە ئەو سنورە لە لایەن سەرکردەو دەسەلاتدارەکانی پارتی کۆمۆنیستیەوە دیاری کراون. لە ڕاستیدا کاستیلس "چین" هەروەکو "سیگنافوریا" تا ئێستا وەک دەوڵەتێکی گەشەکردوو پیشان دەدات کە دەوڵەت ڕۆڵێکی چالاک دەگێڕێ وەک دینەمۆیەک لە گۆڕانکارییە ئابورییەکاندا، بەلام من لەو باوەڕەدام کە ئەم باسکردنە ناتەواوە، چین تا ئێستا نەگەیشتۆتە قۆناغی سەرمایەداری، ئەگەر گەیشت بەو قۆناغە پێویستە ئەوکات پارتی کۆمۆنیست لە ناوبچێ. بۆ من سەرمایەداری شێوەیەکی بەرهەمهێنانە کە تێیدا سەرمایەدارەکان و دەسەلاتدارەکان لەسەر سەرمایەی خۆیان دەژین و بە یارمەتی ئەوانیش خەڵکانی تر کار بۆ خۆیان دەکەن کە لە ئەنیستیتۆی سیاسیدا بەهێزن.

هەڵبەت دەوڵەتیش بێدەسەلات نیە. لە نێوان هەموو نەتەوەکاندا خەباتێکی بەردەوام لە نێوان دەوڵەت و سەرمایەداریدا هەیە. دەسەلاتی دەوڵەتە نەتەوەییەکانیش کەمدەبێتەوە، لەگەڵ ئاستی گەشەکردنی سەرمایەداری دارایی جوولانەوەی جیهانگیریدا، بەلام دەسەلاتی دەوڵەتە نەتەوەییەکان ناتوانرێت بێ نرخ بکرێت. کاستیلس دەڵێت: *بەڵگەی بنچینەیی بۆ کۆمەڵگای تۆڕی پەیوەندییەکان ئەوەیە کە دەسەلات لە ئەنیستیتۆیەکانی سیاسیدا نامێنێ.* دەسەلاتی ڕاستەقینە، لە شەپۆلەکانی پێکەوە بەستنەوەی تۆڕی پەیوەندیو ڕەمزەکانی کولتورییەوە سەرچاوە دەگرن، من سەختە لەوە بگەم کە دەڵێت شەپۆلو ڕەمزەکان خۆیان دەسەلاتیان گرتۆتە دەست، دەتوانم لە ناخەوە دەری ببڕم کە کاریگەری سەرمایەداری جیهانگیریو بەڵێندەرە سەرەکیەکانی دارایی بازاڕو ئامرازە سەرەکیە بەکارهێنراوەکان —خاوەن ئەنیستیتۆیەکان— دەسەلاتیان زیاترە لە دەوڵەتە نەتەوەییەکان، گواستنەوەی دەسەلاتیش ئاسانتر کراوە لە تەکنەلۆژیای زانستی نوێ و پردەکانی تۆڕی پەیوەندیەکان. ڕاستەوخۆ من دانم بەوەدا نا کاتێ ڕەخنەی چەمکو تیۆرەکان بە دیارکەوتن و لە هەموو شتەکانیش هاوڕام لەگەڵ لێکۆڵینەوە ئەزموونیو مێژووییەکانی کاستیلس سەبارەت بەوەی کە چۆن فۆرمی نوێی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریو ململانێ لەگەڵ هێزە بەرهەمهێنەرەکانی زانستی نوێی تەکنەلۆژیادا گەشەی کردوە. بە دیارکەوتنی بێهێزی دەوڵەتە سوشیالیستەکان لەمەڕ هەڵسوکەوت کردن و گواستنەوەیان بۆ قۆناغی سەردەمی زانیاری، بەهێزترین هۆکار بوو کە یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتانی پارتی کۆمۆنیست، لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەیان ڕۆشنتر بوو. ئەوەی من هەست بە نەبوونی دەکەم گۆڕینەوەی بۆچوونەکانە دەربارەی ئیدارەی بازاڕی ئابووری، کرێکاران لە یوگۆسلاڤیای کۆن و هەروەها بەراوردکردنی چالاکیە ئابوورییە مسۆگەرەکانی ئایندە بە تایبەتی لە سلوڤانیاو بەشێکی کرواتیاو سربیا لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریو سیستەمی داڕێژراوی ئابووریدا سەرەڕای ئەوەی کە هێزی بەرهەمهێنان بە دەگمەن پێگەییوە بۆ ئەو شێوە ئەزموونە. هەمان نرخیش بە نووسینەکانی "ماکێنیزم" دەدەم دەربارەی گەشەکردنی جیاوازی داهاتەکان و بلاوبوونەوەی ئەو دەسەلاتانەی کە بەربەست دروستدەکەن، هەروەها بچووکی نیمچە دورگەکان و دەوڵەتەکان و دەردە هەژاریو تیرۆریزمو دەمارگیری. لەو سیستەمەدا هیچ ڕێگایەکی خۆشاردنەوە نیە لە ئازارو تێکدان، ئەمەش ڕەنگدانەوەی مەرجەکانە بۆ ئەوانەی بە شێوەیەک لە شێوەکان عاسی بوون لەناو ئەو ناوچە کۆمەلایەتییانەدا، وەک کاستیلس لە کتێبی "دوا ساتەکان سەدەی بیستەم"دا دایڕشتوە بە هەمان

شێوەش وێنە بۆیاخکراوەکانی "جیهانی چوارەم"ی گەشەکردوو کەنارگیرو گەڕەکی کۆمەڵگا دابڕاوەکان‌و گەڕەکی شارەکان کە لە ناوچەو دەوڵەتەکاندا هەن دەبینرێن.

لێرە شتێکی زیاتر نیە بیخەینە سەر ئەو ئەنالیزەی کە مارکس بێڕەحمانە دەربارەی کەڵەکەبوونی سەرەتایەکان‌و بە کرێکاری کردن‌و گەشەکردنی پیشەسازی سەرمایەداری کردوویەتی. کاستیلس سەرەتا خۆی لە ئەورووپاو دامەزراوەکانی یەکێتی ئەورووپاو زۆربەی تۆڕی پەیوەندیەکانی دەوڵەتانی جیهان نزیك خستەوە کە بۆ من زۆر زەحمەتە بەو هەموو پەیوەندیانە ڕابگەم، ئەو هەوڵیداوە بە زۆر شوێنی تریش ڕابگات کە ناسنامەی ئەورووپی هەتا ئێستا لەوێ نیەو ئایدیالانە بیردەکەنەوەو ئەنالیزەکانی ئەو شوێنانەش تا ڕادەیەك بێڕەحمانەن.




من لە ڕابردوودا پەندم لە قسەکانی مارکس وەردەگرت، بەڵام ئێستا دەمەوێ ڕەخنە لە کاستیلس بگرم، بە هەمان شێوە کە رۆزا لوکسۆمبۆرگ "Rosa Luxumburg" ڕەخنەی لە باوکی تیۆرزانان گرتبوو کە وتبووی "سۆشیالیزم" بۆ جاری یەکەم لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانی وەك "ئینگلترە، ئەمریکا، ئەڵمانیاو فەرەنسا" پێدەگات. بە گوێرەی کاستیلس سەرمایەداری مۆدێرن زۆر بە سستەمێکی داخراو دەبینرێ. لێرەدا ئەو سستەمە نابینێ کە دەتوانێ سەرمایەی زیادە بنێرێتە دەرەوەو هێزی کار لە دەوڵەتانی نیوە سەرمایەداری‌و نا سەرمایەداری‌و لە بەشەکانی تری جیهاندا بەکرێ بگرێ هەتا ئەوانیش بژین، بۆیە سۆشیالیزم لە تاقە دەوڵەتێکدا بیرێکی نائیمکانە.

کاستیلس بە تایبەتی لە تێکستی "بنیاتنانی ناسنامەی ئەورووپی"دا بە دوای هەنگاوە ئیدیالەکاندا دەڕوات ئەو وەك مارکس پێشکەوتنی دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی یەکێتی ئەورووپا دەبینێ کە بە شێوەیەکی سەرەکی خۆیان بەرهەمهێنەری سیستەمەکەن‌و ئەو شتانە دەبینێ کە بە توانایەکی کەمەوە دەنێررێنە دەرەوە، بەڵام ئەوە نابینێ کە دەهێنرێتە ناوەوەی ئەورووپا. کۆچکردنی هێزی مێشکی دەوڵەتە هەژارەکان، من وای دەبینم، یەکێك بێت لەو فاکتەرانەی کە یارمەتی فراوانبوونی دەرسەکانی داهات‌و دەدات‌و یارمەتیدانی خەڵکی ڕەشۆك بێت. بە گوێرەی قسەکانی کاستیلس خۆی بەربەست دەخاتە بەر ئاستی جیهانگیری‌و بە دیموکراتیبوونی جیهانگیری، کە خەباتی بۆ دەکات. لە ئەمریکا داگیرکردنی سەرمایەی دەوڵەتە هەژارەکان زیاتر بەدیار دەکەوێ کە ئەمەش تەنیا بەسترابۆوە بە هێنانی بەهرەمەندە بە تواناکان‌و بەڵکو لە هەمان کاتیشدا لێشاوێکی مەزنی سەرمایەش بوون بۆ هاوسەنگ ڕاگرتنی تەنگژەی کاڵا، هەڵبەتە من لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نیم کە زۆربەی ئەوانەی سەر بە تیۆری قۆتابخانەکانی ئەورووپاو ئەمریکای باکورن دەڵێن کە بەرهەمەکان جیهانیتر بوەو بۆتە داینەمۆیەکی یاسا سەرەتایەکانی

گەشەکردنی دەوڵەتە پێشکەوتوەکان، بەڵام لە قۆناغی زانیاری ئەمڕۆدا دەوڵەتەکان خۆیان هێزی بەرهەمهێنانیان هێناوەتە ئاراوە، بە تایبەتی لەو کاتەی کە تەکنەلۆژیای زانیاری گرنگی زۆرتری پەیداکردوەو پێداویستیەکانی ئەو قۆناغەشیان بۆ دەوڵەتە هەژارەکان ناردوە، من دان بەوەدا دەنێم کە سەرمایەداری کۆلۆنیالیزمی نوێ، جێگای سەرنجی سەرمایەو مرۆڤە، فاکتەرێکی بە تواناو گرنگە بۆ پێشکەوتنی ئەوروپاو ئورگەکانی ئەمەریکای باکور لە رووی سەرمایەدا بۆ ناسنامەی ئەوروپی. پرسیارەکە ئەوەیە، *ئایا مرۆڤ چاوپۆشێ لە پەیوەندی نێوان دەوڵەمەندو هەژارەکاندا؟* لە کام حاڵەتدا پێویست بوە تێگەیشتنمان دەربارەی بەشێکی تاریکی مێژوومان وا لە مرۆڤ بکات کە بەرامبەر بە چەپ نیگەران بێت؟

من دڵنیام ئەگەر ڕۆزا لوکسمبورگ لە توانایدا بوایە گۆڕەکەی خۆی هەڵتەکێنێ، زۆر بە گومان دەبوو و بڕیاری ئەوەی دەدا کە بەشێك لە فکرەی سۆسیالیزمی ڕەتبکاتەوە کە ئەمەش ئومێدی ئەوروپای هاوبەشەو ئەمڕۆ لە نیوەی کشیوەرەکەدا سەریهەڵداوەو بە هەمان شێوە کە خەونەکانی سوشیالیزمی لە تەنیا یەك وڵاتدا ڕەتکردەوەو بە گوێرەی ئەو بنچینانە کاستیلس و پێڕەوی ڕەخنەکانی دەربارەی ئەوروپای هاوبەش ناتەواون، ئەو تەنیا دوو جۆر ڕەخنە باسدەکات. یەکەمیان ئەوەیە کە بەشێك وەك زۆربەی بەریتانیەکان "ناتۆ"و پەیوەندی بە "USA"وە، لە دەسەڵاتی یەکێتی ئەوروپا لە کیشوەرەکەدا، بە باشتر دەزانن.

بەشەکەی تریشیان وەك لێ پێن "Le Pen" و هایدەر "Haider"ە کە سەرکردەی ناشونالیزمە ڕاستڕەوەکانن و بەرنامەکانیان بە فکرەی راسیزمی دژی بێگانە ڕازاوەتەوە. کاستیلس بە ڕوونیو دادپەروەرانە، ناشیونالیزم وەك پاشماوەیەکی بێسوودی ئاینی سەردەمی ناوەڕاست دەزانێ کە سنورەکانی بە بێباوەڕیو کافریو هەڵگەڕانەوە، داپۆشراون، بەڵام هەڵبەتە یەکێتی ئەوروپا هەوادارانی بەهێزیشی هەن کە بە تێڕوانین بۆ لانکی دیموکراتیو مەدەنیەت وەك "یۆنان"، دەیانەوێ شێوەیەکی ناشونالیزمی ئەورووپی هەڵبچنن، هەروەها دیموکراتخوازو مەسیحییەکان وەك هۆکارێك بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگای مەسیحی ئەورووپی ڕەوشتی مەسیحیانە بەکار دەهێنن، بەڵام یەکێتی ئەوروپا تەنیا مرۆڤایەتیو تیۆری دادپەروەرانەی مەسیحیەت نیە. یەکێتی ئەوروپا یەکێتی گومرگەکانیشە کە دیوارەکانی لەگەڵ دەرەوە بنیات دەنێو گەلێك جار شێوازی نامرۆڤانە بەرانبەر بە کۆچکردوە گیرساوەکانو بێگانەکان، دەنوێنێت.

بە گوێرەی بۆچوونی من جیاوازی ئەو رووکارانەی نێوان دەوڵەمەندو هەژارەکان مەترسیە کی بڕیاردەرە دژی ئاشتی جیهان، شەڕی ئایندە شەڕی ناوخۆی شارو ئاینو دەوڵەتەکانە لە کیشوەرەکاندا، لەو شەڕانەشدا ئەندامانی جیهانی یەکەمو جیهانی چوارەم دوژمنی سەرەکین، چونکە جیاوازی شارەکان دەتوانن ئاگر بۆ یەکێکی وەك هیتلەر، پۆل پۆت و صەدام حسین خۆشبکەن.

ئەگەر من بە تەواوی تێگەیشتبم، ئەوە هەوادارانی کاستیلس لەگەڵ هاورێ گەرمو گوڕەکانیان خاوەنی بیری هاوبەشن دەربارەی جەنگی دەسەڵاتخوازیانەیان چوونە ناو کۆسۆڤۆو ئەو مافەش بە خۆم دەدەم، کە گومانم هەبێ ئایا ئێمە چ گرانتیەکمان هەیە؟ ئەگەر هێزێکی بەو جۆرە کاری سەرەکی پارێزگاری دیوارەکانی دژی جیهانی چوارەم نەبێت ئەی چیە؟ یان ئایا شەڕێکی خاچپەرستەکان دژی کافرەکان بە ڕێگاوە نیە؟ من بە هەمان شێوە لەو باوەڕەدام کە کاستیلس دیوارەکانی یەکێتی ئەورووپای بە تەواوی دیار نەخستوەو ڕەخنەی

چەپەکانی لە یەکێتی ئەورووپا کە لەسەر بنچینەی ئایدۆلۆژی هاوکاری نێونەتەوەیی بنیات نراوە شاردۆتەوە، چونکە دەبێ ئەوە بزانێ کە ئێمە زۆرینە نین کە سەر بە جوولانەوەی سوشیالیزمی چەپی باکورین، بەڵام ڕۆڵێکمان لە سیاسەتدا هەیە زۆربەی ماس میدیاکانی ئەورووپا لە گۆشەنیگای راپرسینەوەی دانیمکارکیەکان لەمەڕ ئەورووپای هاوبەش سەیری ڕووداوەکان دەکەن لە کاتێکدا شێرزگارد "Kjersgaard"ی پۆپۆلیستی ڕاسترەو تەنیا وەك سمبولێکی "نا" بۆ ئەورووپای هاوبەش بوو، سەرەڕای ئەوە کە هۆلگێر نیلسون "Holger K Nielsen"و پارتی گەلی سوشیالیست، وەك لاکەرەوەی سیاسی لە وتوێژەکاندا وەستابوون، کاستیلس گاڵتەجاڕی جووتیارەکانی دەبینی کە بە دەستێك شەقامەکانی برۆکسێل بە بەرهەمەکانیان تۆو دەکەن‌و بە دەستەکەی تریان یارمەتییەکی زۆر لە دەزگاکانی یەکێتی ئەورووپا کە تایبەتە بە کشتوکاڵ وەردەگرن.

ئەوە نموونەیەکە کە ئەو لە کتێبی "دوا ساتەکانی سەدەی بیستەم"دا بە نوێکردنەوەی هەرەوەزی دەرەوەی سنووری نەتەوەکان ناویدەبات بە تێڕوانین بۆ بڕیارەکانی ئەورووپا، بەڵام لە دوای گاڵتەجاڕییەکان شتێکی گرنگی خوێناوی خۆی شاردۆتەوە. ئایا چۆن یەکێتی ئەورووپا دەتوانێ سنوورەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا فراوان بکات؟ ئەگەر سیاسەتی کشتوکاڵ، ڕێفۆرمێکی ریشەیی بەسەردا نەیەت؟ ئەمەش فۆرمێکی تری ڕەخنەگرانی یەکێتی ئەورووپایە وەك پارێزگارانی بلۆکی بازرگانی دژی یەکێتی ئەورووپا. چەند ساڵێك لەمەوپێش لە "نایرۆبی" بێجگە لە ڕۆنی کەرەی یەکێتی ئەورووپا ئیمکانی ئەوە نەبوو ڕۆنێکی تر بکڕدرێت چونکە بەرهەمەکانی خۆماڵی شکستیان هێنابوو.

کاتێکیش سوید لە ساڵی 1995دا بوو بە ئەندامی ئەورووپای هاوبەش، ناچار بوو کە بەشێکی یاساکانی تایبەت بە کشتوکاڵ دابڕێژێتەوەو کراسێکی تەسکی ریشاڵدار بپۆشێ، لە پراکتیکدا دەتوانین وا لێکبدەینەوە، کە کراسی باشتر لە پرتوگال بکڕین لە جیاتی هیندستان. ئەمەش بەڵگەیەکی تری نێونەتەوەییە دژی یەکێتی ئەورووپا کە کاستیلس پشتگوێی دەخات. لەو ماوەیەدا ئیمانوێل ویلشتێن "Immanuel Wellerstein" ڕەخنەی لە ئێمەی چەپ دەگرت، کە گومانمان لە یەکێتی ئەورووپا هەیە، دەیگوت چەپەکان شێوە هەستێکی ڕاسیزمیان دژی باشووری ئەورووپا هەیە، هەروەها دەیگوت ئەگەر ئێمە بتوانین وڵاتەکانمان لە دەرەوەی هێزی سەربازی هاوبەشی یەکێتی ئەورووپا ڕابگرین، ئەوە لە ڕاستیدا بەو واتایەیە کە ڕێگە بۆ ئەمریکا خۆش دەکەین دەسەڵاتی سیاسی، ئاسایشی ئەورووپا بخاتە ژێردەسەڵاتەوە، بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی کە لە ناتۆدا هەیەتی. من ئەوە بە ڕەخنەیەکی ناڕەوا دەزانم، ڕاستە ئێمە هەندێجار لەخۆ ڕازین‌و ئێمەی دانیشتوانی باکوری ئەورووپا خۆمان هەڵدەکێشین، وەك دادوەرێکی بێلایەن ڕۆڵی خۆمان لە کێشە هەمەجۆرەکاندا دەبینین، بەڵام نابێ ئەو ڕاستیە لەیاد بکەین کە دەوڵەتانی باکور لە مێژوودا بەوەفاترین دەوڵەتن لە سیستەمی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا.

ئێمەی باکووری، بە دڵنیاییەوە جارجار لە دیموکراتی ناوچەیی زیاتر تێدەپەڕێنین، ئەوەش ڕاستییەکە کە وڵاتی دارستانە ئاوەدانەکانی سویدو نەرویج تەنیا دەوڵەتن لە ئەورووپادا کە لە پراکتیکدا باوکسالاری دەرەبەگایەتیان بەجێ هێشتوە، زیاتر پێگەیشتوون بە تایبەتی ئەگەر لەگەڵ ئەورووپادا بەراوردیان بکەین، لەلایەکی تریشەوە ئێمە هەست بە کەمی دەکەین بەرانبەر بە کولتووری هەڵکشاوی

باشـووری ئـەورووپا. ئێمـەی چـــەپ و سوشـیال-دیموکراتـە بـەرەو چەپـەکانی ناوچـەکانی بـاکوور بـە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕووی سیاسیەوە ویستوومانە مێژووەکـەمان باشتر لـە پارتـە دەستەخوشـکەکانی باشـوورو ناوەڕاسـتی ئـەورووپا ببیـنرێ، چونکـە شانۆگەرییەکە زیـاتر لـە ژێـر ئیـدارەی ئێمەدایـە. سەرۆکی فراکسیۆنی ئـەندام پەرلەمانـە چەپـەکان لـە یەکێتی ئـەورووپادا لـە پێشدا ئیسپانی بـوو، ئێستا فەرەنسیە، پرسیارکە ئەوەیـە ئایا ئێمـە دەتوانـین ناسنامەیەکی ئـەورووپی کـە بـە سیسیلیای ئیتـالی تـا ئەوەری باکوور بەخۆوە دەگرێ، دروست بکەین؟ مـن دوودڵم، کاستیلس دەڵێت: دەوڵەتێکی بەختـەوەر بـۆ هەژاران، وەك ئەمریکا، تـا دێت ناسنامەی خـۆی لـە دەستدەدات، دەوڵەتێکی بەختەوەر کە پشتیوانی لـە گەشەکردنی کۆمەڵایەتیو زانیاریو ژینگە بـۆ هـەموو خەڵك بکات بە پێچەوانەوە ژیـانێکی درێـژی ئـابووری سیاسی دەبێـت. لـە پرنسـیپدا زۆربــەی چەپــەکانی بـاکوور لەگـەڵ ئـەو بۆچوونـەدان، هـەمان شـت ئـەو بەهایانەش دەگرێتەوە کە باس لەپایەکانی ناسنامەی ئەورووپی دەکات: "پارێزگـاری لـە گشت مەرجـەکانی ژیانو سایەکانی ژیـان، هاوکـاری کۆمەڵایـەتیو کـاری بەردەوام، یاساکانی مافی کار، هەروەها مافی مرۆڤ بـە گشـتی بەرپرسـیارە بەرانبــەر بــە هــەژارەکانی جیهان، هەروەها گەشەپێدانی ئابوری لەسـەر ئاستی ناوچـەییو هــەرێمیدا بـە پێداگرتـن لەسـەر چــەقی چـالاکی. هاوڵاتیـانو پارسـتنی بنـەما کولتوریـیـە مێژووییەکان و یەکسانی نێـوان "پیـاو و ژن"، بـەڵام بۆچی پێویستە کـە ئـەو بەهایانـە لـە ئـەورووپا بـن؟ مرۆڤ دەتوانێ ئەو بۆچوونەی هەبێ کە ئەم بەهایانـە دەبێت زیاتر ڕەنگدانـەوەی ناسنامەی ئێمـە بـن وەك هاوڵاتیەکی جیهانی لــەوەی وەك ئەورووپیــەك نابـێ لێکدانەوەکانی بۆ مێژووی ئەورووپا نەبێ، کاتـێ ئێمـە لەسەر ئەو گریمانەیە کاردەکـەین، دەبـێ بـەئاگا بین

کە لە بەشێکی مـەزنی جیهاندا، ناسنامەی ئـەورووپی بەشێکە لێیو ئێمە ڕابەرایەتی مافی مـرۆڤ دەکـەین، ئێمە خۆمان وا دەبینین کە باڵاترین لەوانەی تر، مـن وەك هـەوادارێکی کاستیلس ئامادەم، بـەڵام شـێوە گومانێکم هەیە، کاتێ ئەو بـە بـاوەڕێکی تـازەوە پـێ لەسـەر چـەقی چـالاکی هاوڵاتیـان دادەگرێـت کـە بەشێکە بـە ناسنامەی ئێمـە، هیوادارم ئـەوە بـەو واتایە بێت کە ئێمە ئێستا دروستی دەکەینو دروست کردنەوەش لـە خـوارەوە بێـت، زیـادبوونی بۆچوونی دیموکراتـیو کۆنـترۆڵ لـە لایـەن سیاسـەتمەدارانو میهرەبانــە فەرمانبـــەرەکانی یـــەکێتی ئـــەورووپیو دەزگاکـانی دەوڵەتــە نەتەوەییـەکان، بــە دەگمـەن خـاوەنی ئایندەن کـە گەنجـەکان بۆی دەسـووتێن. دیموکراتـــی دەوڵەتـــە نەتـــەوەکان وەك دەزگــا هەمەجۆرکانی یەکێتی ئەورووپا، تایبەتمەندی بــەرگری نیە، بـەو ئاراسـتەیەی کـە کۆنـترۆڵی سـەرمایەداری بکـەن، نـەك دەسـەڵات بگرنــە دەسـتو مـرۆڤ لــە چەوسانەوە ڕزگار بکەن.

ئـەو جوڵانــەوە تازانــەی ئێســـتا لـــە ئاسـتی نێونەتـەوەیی لــە پێشـرەویدان وەك جوڵانــەوەی "ئەتاك" داخوازی بەرگریان هەیە وەك ئۆلێ سڤێنینگ "*Olle Svening*" لـە کتێبـی "چـەپ لـە ئـەورووپا"دا دەڵێت: لـە سـەرەتای سـەدەی بیستـەمدا لیبرالیزمـە تازەکــان بـــە هـــەمان فەلســـەفەی سیاســـی ترادیسۆنەکان، جوڵانـەوەی کرێکـاریو سوشـیال-دیموکراتـیو کۆمۆنیزمیـان بنیـات نـا، لـە سـاڵی "*1930*"یشەوە بە شێوەیەکی سەرەکی وەك عـادەت جۆرە دەوڵەتێکی سوشیالیزمی هەیـە. لـە ژێـر نـاوی چینـی کرێکـاری هاوبـەشو هاوکـاری کۆمەڵگایـەکی بەهێز، هەروەها لـە ژێـر نـاوی سوشـیالیزمی زانستی کۆمۆنیسـتەکان، دەتوانـن کێشـــەکانی کۆمــەڵ چارەسـەر بکـەن، ئەگـەرچی بـەرەو پێشـەوە چوونـی تایبەتمەندیەکانی پارتـە کۆمۆنیستەکان گۆڕانکـاری

بەهێزی ئایدۆلۆژییان لە دوای **1989**دا بەسەر هاتوە، بەڵام تا ئێستاش سەختە واز لە بۆچوونە کۆنەکان بێنن. ڕۆدۆلف میدنێر "*Rudolf Meidner*" ئابووری زانی ڕێکخراوەی کرێکاران و یەکێك لە سەرکردە تازەکانی ئایدۆلۆژی چەند ساڵێك لەمەوبەر وتی: بۆ مارکس و ئەنگلز کارێکی سەخت بوو کە دەست بەسەر زەوی و زاری خاوەن موڵکەکاندا بگرن، بەڵام بۆ سوشیالیستەکانی سەدەی بیستەم کارەکە ئاسانتر بوە کە ئەو دەسەڵاتە بەکاربێنن کە تا ئێستا لەبەردەستی کرێکاراندایە و گەشەدەکات، هەروەها بە بەردەوامیش سەرمایەکە گەشەدەکات، بەڵام لە کۆمپانیای زانیاریە تازەکانی ئەوروپادا زیاتر ئەو کەسانە وەردەگرن کە خۆیان کار لە کۆمپانیاکەدا دەکەن و خۆشیان دەبنە خاوەنی. لە جوڵانەوەی کرێکارانی نێونەتەوەیی، وتوێژێکی وا لە ئارادایە کە چۆن پارەی کاتی خانەنشین کردنی کرێکاران بەکاربهێنن بۆ ئەوەی بەرتیل بدەن بە سەرمایەدارە نەفەس کورتەکان و خۆیان ببن بە خاوەن. ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆری کۆمپانیاکانی ئەمریکا، کرێکارەکان "بە مانا گشتیەکەی" خۆیان خاوەنن. لەژێر کاریگەری ململانێیەکی بەهێز و گرژیەکان و ئابووریەکی کۆمەڵایەتی هاوبەش کە خۆیان ئیدارەی دەکەن لەدایکبوە. کاستیلس هەرگیز هەوڵی نەداوە شوێنێك لە حکومەتێکدا بەدەست بێنێ، ئیشیش بۆ ئەوە دەکات کە دەسەڵات بە خاوەن ئایدیۆلۆژیاکان نەدرێت، ئەمە بۆچوونێکی بەهێزی ئیتۆپیەکانە و لینینیش دەکات بە نموونە، دەڵێت بەڕێزان "*بڕیارەکان لە دەسەڵات دوور بخەنەوە*، چونکە *خەتەرن*". هەڵبەتە خەتەرن، چونکە ئەوانە خەیاڵی زۆریان هەیە، وەك خاوەنی تیۆرە بەناوبانگەکان، بەڵام مرۆڤ بە پیاو و ژنەوە خەون بەوەوە دەبینن کە دەتوانن کاری ئەقل و بازوو پێکەوە گرێبدەن و ببنە هاوڵاتییەکی جیهانی لەسەر هەموو سنوورەکانی جوگرافیا و کولتووردا بسوڕێنەوە، پێویستە ئێمە مافمان هەبێ ئەو جۆرە خەونانە بە زیندوویی بهێڵینەوە. لە مێژە ناسنامەی ئەوروپی زۆر سنووردار کراوە.

## سەرچاوە

*لە گۆڤاری* Ord och Bild *ژ 1 ساڵی 2001 وەرگیراوە.*

**تێبینی: ئەمە وەڵامێکی {یوهان لۆنروت}ە کە سکرتێری پارتی چەپی سویدیە، بۆ مانوێل کاستیلسی نووسیوە، نووسینەکەی مانوێل لەژێر ناوی {ئایندە ئێستامانە} کە لە یەکێك لە ژمارەکانی ئایندەدا بڵاوکراوەتەوە.*

# پەیوەندیی دانەبڕاوی نێوان

## دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ

■ نوسینی: د.عەلی ڕەزا پارسا

● و. لە فارسییەوە: حەمە ڕەشید

### پێشەکی

ئەمڕۆ دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ ناوکی نێوەندی ژیانی سیاسی و مافەکانی مرۆڤ پێکدەهێنێ. چەمکەکانی لە بابەت ئازادی، یەکسانی، دادپەروەری و خودموختاری لە چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤدا ئاشکراو دەستەبەر دەکرێ و واش دێتە بەرچاو دیموکراسی بەسەر جۆرەکانی تری حکومەتدا سەرکەوتنێکی مێژووسازی بەدەستهێنابێ؛ بەو مانایەی کە زۆریەی هەرەزۆری سیستمە سیاسییەکانی جیهان بانگەشەی پەیڕەوکردن لە بنەماکانی دیموکراسی دەکەن و خۆیان بە حکومەتی دیموکراسی لەقەڵەم دەدەن. ئەگەرچی لەنێوان ناونیشان و قسەکردن، ڕەفتارو کردار جیاوازییەکی قوڵ هەیە بەڵام وەك ئەوەی ئەمجۆرە حکومەتە جۆرێك لە ڕەوایەتی بە ژیانی سیاسی دەبەخشێ[1].

دیموکراسی هەمیشە جۆرێکی خوازراوی حکومەت نەبوەو زۆر لە فەیلەسوفانی وەك ئەفلاتون بە شتێکی ناپەسەندو چەوتیان داناوە. لە کتێبی (کۆماری ئەفلاتون)، دیموکراسی لە ریزبەندی نزمەڕۆی (تنازلی) گەندەڵی سیاسیدا لەدوای حکومەتە ستەمکارەکانەوە دێت[2]. ئەرستۆ لە کتێبی "سیاسەت"دا بەمجۆرە دیموکراسی پێناسە دەکات: "دەبێ دیموکراسیەت بە حکومەتێك بزانرێ کە مرۆڤە ئازادەکان فەرمانڕەوایی تێدا بکەن.. و یەکەمین جۆری دیموکراسی ئەوەیە کە لە بنەمای یەکسانییەوە نزیکتر بێ. لەمجۆرە دیموکراسیەدا یاسا، بێتواناکان لە سەروی بەتواناکانەوە دادەنێ و هیچیان ناکاتە حاکم بەسەر ئەوی تریانەوە. بەڵکو هەموویان بە یەکسان و هاوتا دادەنێ". هەڵبەتە ئەم پێناسەیە ڕاستەوخۆ لەو خەڵك سالارییەوە سەرچاوەی گرتوە کە لە کۆمەڵگە بچوکەکانی دەوڵەت- شارەکانی یۆناندا باڵادەست بوە، بۆیە بەشێوەیەکی سروشتی لەگەڵ دیموکراسیەتی دونیای ئەمڕۆ جیاوازی چۆنایەتی و بنەڕەتی زۆری هەیەو

ئەرستۆش "لە ئەنجامدا دیدو بۆچونێکی هێندە دۆستانەتر لە ئەفلاتون نالێتەوە"[3].

کەوابو ئەگەرچی چەمکی دیموکراسی بۆ یۆنانی کۆن دەگەڕێتەوەو یەکەمین نمونەی پیادەکردنی راستەوخۆی دیموکراسیش لە دەوڵەت- شارەکانی یۆناندا بەدیدەکەین، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهاندا بەناوی دیموکراسییەوە هەیە دەرئەنجامی سەردەمی رۆشنگەری و بیری فەیلەسوفانی وەك ڤۆلتێر، رۆسۆ، تۆکڤێل و هەروەها بەری بەرهەمەکانی فەیلەسوفانی سەدەی نۆزدەیە (میل، کانت).

رۆسۆ لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا سەرەتا مەسەلەکە بەمشێوەیە دەخاتەڕوو:

"دۆزینەوەی جۆرە یەکێتییەك کە بە گشت هێزە هاوبەشەکانیەوە پارێزگاری و بەرگری لە کەس و ماڵی هەموو ئەندامەکانی بکات و لەڕێگەی ئەو یەکێتییەوە هەرکەسێك ئەگەرچی لەگەڵ ئەوانی دی یەکگرتو دەبێ بەڵام بەتەنها خاوەنی ئیرادەی خۆیەتی و وەك رابوردو ئازاد دەمێنێتەوە"[4].

رۆسۆ بە مەبەستی گەیشتن بە فۆرمیلایەك کە بتوانێ ئازادی تاکە کەس لەگەڵ پێویستیەکانی رێکخراوی کۆمەڵایەتی ئاست بکاتەوە، تیۆری فەرمانڕەوایی خەڵك و دیموکراسی سیاسی گەڵاڵە دەکات کە بەپێی ئەو تیۆرەیە حکومەت، تەنها ئۆرگان و دەزگایەکی ئیداریە و ئیرادەی خەڵکی جێبەجێ دەکات و بەتەواوەتیش لەژێر کۆنترۆڵی خەڵکی دەبێ.

ئەمڕۆش مافەکانی مرۆڤ "هەرچەندە یەکەمین بەرجەستەبونی یاسایی- سیاسی خۆی لە بڵاونامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی ساڵی *1789*ی فەرەنسا دۆزیوەتەوە بەڵام بێگومان دەبێ لە بزوتنەوەی فیکرو فەلسەفەی سەدەی هەژدەیەمی ئەوروپادا بۆ بونیادو لۆجیکەکەی بگەڕێین کە چاوی لەسەر بەرهەمی کەڵەپیاوانی ئەدەب و ئەندێشەی فەرەنسی بوە.. ئەوەی فیکری ئەو بیریارانەی بەخۆیەوە خەریك کردووە مەسەلەی خۆشبەختی مرۆڤ و چۆنیەتی بەدەستهێنانی ئەو خۆشبەختیە لەڕێگەی سەربەخۆیی فیکرو ئازادی مەدەنی لە کۆمەڵگەدا"[5].

ئەگەر روناکبینیو دوربینی رەخنەگرانە بە دوو چاکەی بنەڕەتی رۆشنگەری بزانین، ئەوا "کانت" لە رۆشنگەرێك زیاتر بوو. داهێنانە تازەکەی کانت "بەتەنها ئاشکراکردنی بەها رەوشتیەکان و حقوقیەکانی سەردەمی رۆشنگەری نییە، بەڵکو ئەو تازەکردنەوەیە پەیوەندی بە چۆنێتی ئامادەکردنی هەلومەرجی ناسین و بەدیهاتنی ئەو بەها رەوشتیو حقوقیانەوە هەیە[6]". "کانت" مەرجی پێویستی هاوئاهەنگی ئیرادەی مرۆڤەکانە چ بۆ گەیشتن بە حکومەتی خوازراو و چ بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی خود، لە سێ بنەمادا دەبینێتەوە:

*1*- هەر ئەندامێکی کۆمەڵگە وەك مرۆڤ ئازادە.

*2*- هەر ئەندامێکی کۆمەڵگە وەك بکەرێك لەگەڵ ئەوانی دی یەکسانە.

*3*- هەر ئەندامێکی کۆمەڵگە وەك هاوڵاتی سەربەخۆیە[7].

کۆی ئەم بنەمایانە زەمینەی بۆ گەڵاڵەکردنی مافەکانی مرۆڤی نوێ خۆشکرد.

بەڵام بەڕاستی پەیوەندی نێوان ئەم دوو وتەزایە چییە؟ ئایا بەهرەمەندبون بە مافەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی بەرەو حکومەتێکی دیموکراسی رێنوێنیمان دەکات؟ ئایا بنەما بنەڕەتیەکانی دیموکراسی زەرورەتی دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ؟ ئامانجی هەریەکێکیان چییە؟ خوازیاری دیموکراسی و ئاراستەکردنی بابەتێکی دورودرێژەو لە توانای ئەم وتارەدا نییەو بەدەر لەو بیروباوەڕە جیاوازانەی کە رەنگە لەم بارەیەوە هەبێ، لەم نوسینەدا تیشك دەخەینە سەر پەیوەندی نێوان



دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ. مەبەستی ئەم نوسینەش سەلماندنی پەیوەندی دانەبڕاوی نێوان مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی و دیموکراسییەت و مافەکانی مرۆڤە. لەبەرئەوە لە پێناسەی بنەما بنەڕەتییەکانی دیموکراسییەوە دەستپێدەکەین. ئینجا بۆئەوەی تێگەیشتنێکی دورستمان هەبێ لەسەر پەیوەندی نێوان دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ دەبێ بەو ئەندازەیەی جەخت لەسەر مافە سیاسی و مەدەنییەکان دەکرێ، مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتورییەکانیش ببێتە مایەی لێکۆڵینەوە (هەرچەندە ئەمەش کارەکە ئاڵۆزترو دژوارتر دەکات)، یەکەمجار پەیوەندی مافە سیاسی و مەدەنییەکان بە دیموکراسییەوەو لە قۆناغی دووەمیشدا پەیوەندی مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتورییەکان بە دیموکراسییەوە دەخەینە ژێر لێکۆڵینەوەوە.

## پێناسەی دیموکراسی

مافەکانی مرۆڤ لەڕووی رونکردنەوەی پانتای رایەڵەکانییەوە خاوەن، راشکاوییەکی تایبەتە (یەکەمجار لە بلاونامەی مافەکانی مرۆڤ و هاولاتی ساڵی *1789*ی زاینی، ئینجا لە بەڵگەنامە نوێکانی وەك جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ و بروانامەی مافە مەدەنی و سیاسیەکان و مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتورییەکان) بۆیە لەرێگەی ئەم وتارەوە لێرەو لەوێ و بە سەرنجدانە ئاستی گرنگی پەیوەندیان بە دیموکراسییەوە پێناسەی گرنگترینیان دەکەین.

بەلام پێناسەکردنی خودی دیموکراسی حیکایەتێکی دی هەیە. لەنێو دەیان پێناسەی وەك حکومەتی خەڵك، حکومەتی نوێنەرانی میللەت، حکومەتی زۆرینە، زۆرترین ئاستی بەشداری سیاسی، ململانێی توێژی نوخبە بۆ بەدەستهێنانی رای میللەت، سیستمی فرەحیزبی، پلورالیزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی، مافی یەکسانی هاولاتیان، ئازادی مەدەنی و سیاسی، کۆمەڵگەی مەدەنی و ئابوری بازاڕی ئازاد.. هتد، ژمارەیەکی زۆری ئەو دەربڕینانەی بەکارهێنراوە بەتەنها هیچ یەکێکیان جێگەی رەزامەندی زۆربەی تیوریستان نییە. لەگەڵ ئەمەشدا ناوکێکی (نواة) بنەڕەتی لە مانای دیموکراسیدا هەیە کە دەتوانێ لە روونکردنەوەی پێناسە جیاوازەکاندا سودی لێوەربگیرێو ئەو مەسەلانەش چارەسەر بکات کە ئەو پێناسانە دەیهێنێتە ئاراوە. چونکە لە زۆر شوێندا پێناسەی دیموکراسی لەگەڵ گەلێك پرسیاری لەبابەت ئایا دیموکراسی خوازراوە یا چ ئەندازەیەکی دیموکراسی خوازراوە بە هەڵە وەردەگیرێ و هەر ئەمەش دەبێتە مایەی سەرلێتێکچون. ئەم ناوکە بنەڕەتییە لەسەر دوو پایە خۆی راگرتوە: کۆنترۆڵی خەڵکی بەسەر بڕیارە گشتیەکان و یەکسانی لە راپەڕاندنی ئەم کۆنترۆڵەدا. بەڵگەکانی ئەم بانگەشەیە چییە؟ یەکەم، ئەم دوو بنەمایە بناغەی زۆرێك لەو پێناسانەیە کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کردو لەبەر رۆشنایی ئەم بنەمایانەش، ئەو پێناسانە ناتەواو و نیوە ناچڵ دێنە بەرچاو. دووەم، بەئاسانی دەتوانرێ پێشان بدرێ کە بزوتنەوە جەماوەرییەکانی ژێر ئالای دیموکراسی بەدەدر لە قۆناغی بەرپابونیان، بە مەبەستی بەدیهێنانی هەمان ئەو دوو بنەمایە ئەنجامدراون و بەدوای بەگشتی کردنی کۆنترۆڵی خەڵکییەوە بوون بەسەر بڕیاردان دەربارەی فرمان و سیاسەتە گشتییەکان و هەرچی کاریگەرترکردنی ئەم کۆنترۆڵە

یا گشتگیریکردنی یـا بەدیهاتنی یەکسانییەکی زیـاتر لە بەکارهێنانیدا. سێیەم، ئەوەی نەیارانی دیموکراسی هەمیشە رەخنەیان لێگرتـوە لـەنێوچونی کۆنـترۆڵی مۆنۆپولیـان بـووە لەسـەر ئـەو بڕیارانـەو لەسـەر یەکسانی خەڵکی رەشۆکی لەگەڵ خاوەن سامان و دەسـەڵاتداران لـەڕووی بەشـداریونیان لە کاروباری گشتیدا.

ئەگەرچی زیاد لە رونکردنەوەیـەك بۆ ئـەم بنـەما بنەڕەتیانەی دیموکراسی کراوە بەڵام هەموویان لەسەر یـەك رونکردنـەوەی بنـەڕەتی خۆیـان راگرتـووە کـە ئەویش هەمان یەکسانی بەهاو بایەخی مرۆڤەکانەو لە نێوەندی ئەوەشدا خودموختـاری مـرۆڤ راوەسـتاوە: هـەموو کەسێك مـافی کۆنـترۆڵکردنی ئـەو بڕیارانـەی هەیە کە پەیوەندی بە ژیانی خۆیەوە هەبێ.

*پـەیوەندی مافـە سیاسـی و مەدەنییـەکان بـە دیموکراسییەوە:*

کاتێك لە بنەما بنەڕەتیـەکانی کۆنـترۆڵی خـەڵکی لەسـەر کاروبـاری گشـتی و یەکسـانی تاکـەکان لـە راپـەڕاندنی ئـەم کۆنترۆڵـەوە دەسـتپێدەکەین، ئـەو پرسیارەی لە قۆناغی دوایدا دێتە پێشەوە، ئەوەیە: چ شـتێك پێویسـتە بۆئـەوەی ئـەم بنەمایانـە لـە چوارچێوەی وڵاتێکی مۆدێرنـدا ئـەنجامێکیان هـەبێ؟ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسیارە هاوکـات بـۆ دوو رێگـە رێنوێنیمان دەکات.

رێگـەی یەکـەم: رونکردنـەوەو ئاشـکراکردنی دەزگاگەلێکە کە بە تێپەڕبونی کـات بـە پێویسـت زانـراوە بـۆ مەبەسـتی بەدەسـتهێنانی دڵنیـابون لـە کاریگـەری کۆنـترۆڵی خـەڵکی، وەك چاودێری کردنـی هەڵبژاردنەکانی نێوان پارتە سیاسیەکان بەو بەرنامـە جیاوازانەوە کە بۆ راکێشـانی رای گشـتی پێشکەشـی دەکـەن، هـێزی یاسـادانانی هـەڵبژێراو لەلایـەن دەنگدەرانەوە کە بە مەبەسـتی لێپرسینەوەی هـێزی راپـەڕاندن (القـوة التنفیذیـة) کاردەکـات، هـێزێکی دادوەری سـەربەخۆ بـۆ دڵنیـابون لـەوەی کـە هـەموو پلەو پایەکانی دەوڵەت بەپێی ئەو یاسایانە کاردەکەن کە لەلایەن هێزی یاسـادانانەوە دانراوە، چاپەمـەنیو دەزگا سەربەخۆکانی پەیوەندی گشتی بـە مەبەسـتی وردبینی لـە کارەکـانی حکومـەت و ئاگادارکردنـەوەی رای گشـتی لێیـان، دەزگاکـانی بەدیـهێنانی مـافی تاکەکەس.. هتد، هەموو ئەم دەزگایانە ئـەو کاتـە بـە دیموکراسی دەزانرێـن کـە هاوکـاری کۆنـترۆڵکردنی حکومەت بکەن لەلایەن خەڵکیەوە. بە واتایـەکی دی، ئەوەی سیفەتی دیموکراتی بەو دەزگایانە دەبەخشـێ کارکردنیانـە بـەو بنـەما بنەڕەتیانـەی لـە سـەرەوە باسیان لێوەکراوە.

بـەڵام رێگـەی دووەم: بۆئـەوەی هاوڵاتیـان لـە بەشداریکردنی کاروباری گشتیدا بتوانن بەشـێوەیەکی کاریگەرتر مافـە دیموکراتیـەکانی خۆیـان پیادەبکـەن پێویستییان بە کام مافی دی هەیە؟ بە واتایـەکی دی دیموکراسییەت کـام مـاف بـە زەرورەت دەسـەپێنێ؟ هـەر لێرەوە زەرورەتـی ئـەو بەشـەی مـافی مـرۆڤ روونـاك دەبێتـەوە کـە بـە نـاوی مافـە مـەدەنی و سیاسـیەکانەوە ناسـراوە. بـەپێی مـادەی *(18)*ی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مـرۆڤ "هـەموو کەسێك مـافی ئـازادی بیرکردنـەوەو ویـژدان و ئـاینی هەیـە"، مادەی *(19)*ی ئەم جاڕنامەیـە رایدەگەیـەنێ "هـەموو کەسێك مـافی ئـازادی بـیروڕاو دەربڕینـی هەیە. ئـەم مافـە هـەڵگرتنی مـافی بـیروڕا بـەبێ دەسـتێوەردانی خـەڵکانی دیو ئـازادی گـەڕان و وەرگرتنـی هـەواڵ و فیکرو باوەڕ و بڵاوکردنەوەیان بـە هـەموو شـێوازێکی گونجـاو دەگرێتـەوە بـەبێ پابەنـدبوون بـە سـنورەکانەوە". دواتریـش بـەپێی مـادەی *(20)* "هـەموو کەسـێك مـافی ئـازادی کـۆڕو کۆبونـەوەو دامەزراندنی کۆمەڵەی ئاشتیخوازانەی هەیە". مـادەی *(13)*ی جاڕنامەکـەش دانـدەنێت بـە ئـازادی هـاتوچۆو شوێنگۆڕیندا. گرنگی ئەو مافە ناوبراوانە، واتە ئازادی

بیرکردنـــەوە، دەربڕیـــن، یەکســـانی، کۆبونــــەوەو شوێنگۆڕین دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خـەڵکی بـەبێ ئـەو مافانــە نــاتوانن بەشـێوەیەکی کاریگـەر چ لــە دەزگاکانی کۆمەڵگەی مـەدەنیو چ لــەو بابەتانــەی پـەیوەندیان بـە سیاســەتدانانی حکومەتــەوە هەیـە بەشداری بکەن. چۆن بـەبێ بەهرەمـەندی لـە ئـازادی کۆبونەوە دەتوانرێ ئەم بیروڕایانە لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتیدا ئاڵوگۆڕی پێبکرێ؟ چـۆن دەتوانـرێ بـەبێ ئـازادی یـەکبون لەگـەڵ ئـەوانی دی بـۆ نمونــە حیزبەکان دروست بکرێ کە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕای هاوبەش و دەوربینین لە حکومەتدا زەرورییە؟ بـەدەر لەمەش بەبێ ئەو یەکسانییە سیاسیەی کە لە مـاوەی 1 و 2 جاڕنامەکەدا هاتوە، بەشداریکردن لە کاروبـاری سیاســی بـەجۆرێك هـەموو خـەڵکی بەشـێوەیەکی یەکســـان ایـــی بەهرەمـــەندبن هــــەرگیز بە ئاسانی نارەخسێ.



بۆیە هەر بەو شێوەیەی لە بەشی پێشودا هاتوە، مـافی هاوڵاتیان لەسـەر بناغــەی یەکسـانی لەگـەڵ هاوڵاتیانی دیدا بۆ دەوربینیـن لـە کاروبـاری گشـتیو کۆنترۆڵکردنی حکومەتدا، ناوکی بنەڕەتی دیموکراسی پێکدەهێنـێ.. بۆئـەوەی ئـەو مافـە بەشـێوەیەکی کاریگـەر ئــەنجامبدرێ پێویسـتە، لەلایەکـەوە ئـەو بەشـەی دەزگـا سیاسـییەکانی وەك هەڵبژاردنـەکان، پارتەکان، یاسادانان.. هتد، کـە لـە ڕێگـەی ئەزمونـە دیموکراسییە سەقامگیربوەکانەوە ئاشنایەتیمان پێـی پەیداکردووە، بونیان هەبێت، لەلایەکی تریشەوە ئـەو بەشەی مافی مرۆڤ دەستەبەر بکرێ کە بەناوی مافە سیاسییەکان و پەیماننامـەی (کۆنڤانسیۆن) ئـەوروپا بۆ مافـەکانی مـرۆڤ رونکراوەتـەوە. بۆ بەدیـهێنانی بنەما بنەڕەتییەکانی دیموکراسی ئەم دوو هــەنگاوەی پێویسـتەو لەبەرئـەوە مافـەکانی مرۆڤ بـە بەشـێکی دانــەبڕاوی دیموکراســـی دادەنــــرێ. کـــەوابوو پێناسـەکردنی ئەمشـێوە حکومەتــە (دیموکراســـی) تەنها لە قـاڵبی کۆمـەڵێك دەزگـای سیاسیدا، بـە دوو بەڵگە ڕاست نییە: یەکـەم ئـەو بنـەما بنەڕەتیانـە لەبەرچاو ناگرێ کـە ئـەم دەزگایانـە دیموکراتـیزە دەکات و ئاستی دیموکراتیزە بونیشیان لەسـەر ئـەم بنەمایانە هەڵدەسەنگێندرێ، دووەم کـە زۆر گرنگـترە ئەوەیە کە ئەو دەزگایانە بە تاکە مەرجی پێویست بۆ گەیشتن بە دیموکراسی دادەنێ و مافـەکانی مرۆڤیش لەبـــەرچاو نـــاگرێ کـــە بەشـــێکی دانـــەبڕاو و گەوهەری دیموکراسییە.

بەدیـهێنانی مافــە مــەدەنیو سیاســیەکانیش هاوشانی مەرجی هەبونی دیموکراسیە. مادەی (21)ی جاڕنامەی جیـهانی مافـەکانی مـرۆڤ بەرجەستەبونی بنەما بنەڕەتیەکانی دیموکراسیە. بەپێی بەندی (1)ی ئەم مادەیە "هەموو کەسێك مافی بەشـداربونی هەیـە لــە بــەڕێوەبردنی کاروبــاری گشــتی وڵاتەکــەیدا چ ڕاستەوخۆ یا لە ڕێگەی ئـەو نوێنەرانـەی کە ئازادانە هەڵدەبژێردرێن". ئــەم بــەندە دەریدەخـات کە مافی بەشداربونی هاوڵاتیـان لـە کاروبـاری گشتیدا یەکـەم بنــەمای دیموکراســیە. بــەندی (3)ی هــەمان مــادە

رایدەگەیەنێ "... دەبێ هەڵبژاردن گشتی بێ و یەکسانی دەنگدانیش پارێزراو بێ" ئەم بەندە رەنگدانەوەی دووەم بنەمای بنەڕەتی دیموکراسیە. بەدەر لەمە بەندی (2)ی مادەی (29)ی جاڕنامەکە زۆر بە راشکاوانە تەنها ئەو سنورانە بە رەسمی دەناسێت کە لە "مەلومەرجی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیکدا دانراوە". بەڵام دیموکراسی و مافە سیاسی و مەدەنیەکان تەنانەت لە ئاستێکی قوڵتریشدا پێکەوە پەیوەستن کە ئەویش هەمان دیدی یەکسانییانە کە بۆ خودی مرۆڤ هەیانەو رونکردنەوەی هەردوکیان لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە[9]. رونکردنەوەی فەلسەفی مافەکانی مرۆڤ لەسەر زانینی پێداویستیو توانا هاوبەشەکانی سەرجەم مرۆڤەکان دانراوە بەدەر لە جیاوازی نێوانیان. بەتایبەتی مافەکانی ئازادی واتە مافی ئازادی تاکەکەس، ئازادی بیرکردنەوە، ئازادی بیروباوەڕ، ئازادی شوێنگۆڕین لەسەر توانای هەڵبژاردنی هوشیارانەو لۆژیکانە دامەزراوە یا لەسەر نوێنەرایەتی دانی ژیرانەو بەئامانج لەو بابەتانەی پەیوەندیان بە ژیانی تاکەکەسەوە هەیە[10]. مافە دیموکراسیەکانیش هەمان توانای هەیە بۆ ئەو بابەتانەی کە لەسەر ژیانی گشتی یا هاوبەش کاریگەریی بەجێدەهێڵن: مافی دەنگدان یاخود هەڵبژاردن لەسەر گریمانەی ئامادەگی بەشداریکردن لە بڕیاردان لەبارەی بەرژەوەندییە گشتی و بەرژەوەندییە تایبەتیەکان دامەزراوە[11].

بێگومان بڕیارە گشتیەکان، ئازادی هەڵبژاردنی تاکەکەس سنوردار دەکات، لەمڕووە ئامانجی مافەکانی مرۆڤ پێناسەی سنوری بڕیارە گشتیەکانە بەو شێوەیەی کە ئەرکی وتوێژی دیموکراسیش بڕیاردان و گفتوگۆ کردنە لەبارەی دۆزینەوەی هاوسەنگییەك لە چوارچێوەی ئەم سنورانەدا. بەڵام هەم ئازادی تاکەکەس و هەم وەڵامدانەوەی دیموکراتیک لەسەر گریمانەیەکی هاوبەش لەبارەی توانا مرۆییەکان و بەڵگەهێنانەوەی یەکسانی مرۆڤ و بەها حاشا هەڵنەگرەکانیان خۆی راگرتوە کە دەڵێت هیچ کەسێك یا چەند کەسێك لە شوێنی بڕیاردانا هیچ ئیمتیازێکیان بەسەر ئێمەوە نییە مەگەر خۆمان بەشێوەیەکی دیاریکراو، و لە چوارچێوەیەکی روون و ئاشکرادا سەرپشکیان بکەین.

تا ئێرە لێکۆڵینەوەکەمان بەتەنها مافە مەدەنی و سیاسیەکانی دەگرتەوە. بەڵام دەبێ بزانین هەر جۆرە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ بەبێ ئاوڕدانەوە لە مافە ئابوری، کۆمەڵایەتیو کولتورییەکان بە دڵنیاییەوە ناتەواو و نیوەناچڵە. یەکێك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکان دەربارەی ئازادی ئەوەیە کە پاراستنی ئازادییەکانی تاکەکەس لە دەستێوەردانی دەوڵەت یا خەڵکانی دی شتێکی بێمانایە بەبێ بەهرەمەندی تاکەکەس لەو تواناو سەرچاوانەی کە بە سوود وەرگرتن لێیان بتوانێ ئازادییەکانی پیادە بکات. ئەگەر تاکەکان لە بەکارهێنانی مافە یاساییەکانی خۆیان ئامرازی پێویستیان لەبەردەست نەبێ، ئەوا ئەم مافانە بەتەنها دەبێتە رێ و رەسمێك. ئازادی دەربڕین چ بەهایەکی هەیە ئەگەر ئامرازی گواستنەوەیمان بۆ ئەوانی دی لەبەردەستدا نەبێ؟ بەهرەمەندبون لە مافی مەرجەعە یاساییەکان چ بەهایەکی هەیە ئەگەر ئیمکانیاتی دارایی پێویستمان بۆ پێگەیشتنی لەبەردەستدا نەبێ؟ ئازادی خۆهەڵبژاردن بۆ وەرگرتنی پلەو پایەو کارە گشتییەکان چ بەهایەکی هەیە گەر بەتەنها ئەم دەرفەتانە لەبەردەستی خاوەن سامانو دەستەڵاتداران بێ؟ ئەمجۆرە تێبینیانەیە کە بەرنامەیەکی ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتووری بۆ دیموکراسی روندەکاتەوە.

### *پەیوەندی مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتووریەکان بە دیموکراسییەوە:*

ئەم باسە بە چەند پرسیارێك دەستپێدەکەین: ئایا دیموکراسی دەستەبەرکردنی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان دەکاتە پێویستیەك؟ ئایا مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان لەلای خۆیانەوە پابەندی هەبوونی دیموکراسییە؟

سەرەتا دەبێ بەشێوەیەکی گشتی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان بژمێرین، چونکە لە زۆر شوێندا مافە ئابوریەکان و پەرەسەندنی ئابوری تێکەڵ بەیەك دەکرێ.



ڤۆلتێر

ئەم مافانە بریتیە لە مافی کار یا کارکردن، مافی بیمەی کۆمەڵایەتی، مافی بەهرەمەندبوون لە ئاستی ژیانێکی گونجاو لەوانە مافی بەهرەمەندبوون لە خۆراك، جلوبەرگ، خانو، مافی بەهرەمەند بوون لە بەرزترین پێوەرەکانی تەندروستی جەستەیی و روحی، مافی خوێندن و بەشداریکردن لە ژیانی کولتوری و سودوەرگرتن لە پێشکەوتنە زانستی، کولتووری و ئەدەبیەکان. بڕوانامەی مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتووریەکان کە بە دوورودرێژی ئەو مافانەی سەرەوەی تیا هاتووە ئەو ئەرکانەشی تۆمارکردوە کە دەکەوێتە سەرشانی دەوڵەت بۆئەوەی تاکەکان بەو مافانە بگەن. بۆ نمونە لە مادەی (7)دا ئیقرار کراوە وڵاتانی پەیماندەر مافی کارکردن بە رەسمی دەناسێت بۆ دەستەبەرکردنی لایەنی کەمی دەرامەت بۆ سەرجەم پیشەوەران.

بەندی (2)ی مادەی (11) ئەرکی چاککردنی شێوازەکانی بەرهەمهێنان، پاراستن و دابەشکردنی خۆراك و مافی دەستگەیشتن بە ئاستی ژیانێکی گونجاو دەخاتە ئەستۆی وڵاتانی ئەندامی بڕوانامەکەو بەندی (2)ی مادەی (12) بە مەبەستی دابینکردنی مافی بەهرەمەندبوون و لە بەرزترین پێوەرەکانی تەندروستی جەستەیی‌و روحی وڵاتانی ئەندام رادەسپێرێ کە هەنگاو بنێن لەڕووی چاککردنی گشت لایەنەکانی ژینگەپارێزی و پیشەسازی و کەمکردنەوەی درمی ساوایان، بەرگرتن و کۆنترۆلکردنی ئەو نەخۆشیانەی لە کارکردن و پەتا جیاوازەکانەوە دەکەونەوەو هێنانەدی هەلومەرجێك کە خزمەتگوزاری پزیشکی بۆ هەموو کەسێك دەستەبەر بکات.

لێرەدا ئاشکرا دەبێ کە پەرەسەندنی ئابوری و پارێزگاریکردن لە مافە ئابوریەکان یەك شت نییە، دەکرێ پەرەسەندنی ئابوری کارئاسانی لە بەهرەمەندبونی مافە ئابورییەکان بکات بەڵام وەك کۆمیتەی رێکخراوی نێونەتەوەیی دەربارەی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتووریەکان چەندین جار دوپاتیکردۆتەوە کە ئاستی نزمی پەرەسەندنی ئابوری هیچ لە پابەندبونی ئەو وڵاتانە کەم ناکاتەوە کە بەپێی بڕوانامەکە هەیانە بەو مانایەی دەوڵەتەکان "بەدەر لە ئاستی پێشکەوتنیان" پابەندن بەوەی پارێزگاری لە مافی ئابوری هاوڵاتیانی خۆیان بکەن. ئینجا دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ بەبێ پاراستنی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتووریەکان و نەبونی بنەمایەکی ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتووری ئەوتۆ

که ئەم مافانە دەستەبەر بکات پەرەسەندنی ئابوری نەك هەر لەوانە نییە ببێتە مایەی پاراستنی مافە ئابورییەکان بەڵکو بە پێچەوانەوە نایەکسانی ئابوری‌ی پێشێلکردنی مافە ئابورییەکانیشی لێدەکەوێتەوە. رەچاوکردنی ئەم مافانە زامنی دابەشکردنی دادپەروەرانەی پێشکەوتنی ئابوری دەکات؛ گەیشتن بە یەکسانی ئامانج نییە بەڵکو زامنکردنی لایەنی کەمی هاوسەنگی بۆ هەموانە.

دوای ئەم پێشەکییە رونکارییە "توضیحی" سەرلەنوێ پرسیارەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەمشێوەیە دەخەینە روو: تا چ رادەیەك دیموکراسی پابەندی دەستەبەرکردنی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانە؟ تا چ ئەندازەیەك مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان لەلای خۆیانەوە پشت بە دیموکراسی دەبەستن؟

پرسیاری یەکەم پێویستی بە هەڵسەنگاندنی دەرئەنجامەکانی رەچاونەکردنی مافە بنەڕەتیە ئابوری، کۆمەڵایەتی، کولتورییەکانە بۆ دیموکراسی. لێرەدا یەکەمجار ئەو دەرئەنجامە راستەوخۆیانە لەئارادایە کە سەرنج دەداتە ئەو هاوڵاتیانەی مافە ئابوری و سیاسیەکانیان پێشێلکراوە ئینجا پێشهاتە ناڕاستەوخۆیانە دەخرێتە بەرچاو کە سەرنج دەداتە تێکڕای دانیشتوان و پەسەندبونی دەزگا سیاسییە دیموکراتیەکان.

ئاشکرایە کە یەکسانی مەدەنی و سیاسی پێویستی بە یەکسانی تەواوی ئابوری نییە. بەڵام لە حاڵەتێکدا موڵکدارەکان بە سوود وەرگرتن لە سامان و پلەوپایەی خۆیان بتوانن نفوزێکی سیاسی بەدەستبهێنن بەڵام یان ئەو بێموڵکانەی هێندە گیرۆدەی هەژاری بوون کە نەتوانن مافە بنەڕەتیە مەدەنی و سیاسییەکانی خۆیان پیادە بکەن و لە ئەنجامدا بکەونە پەراوێزەوە و لە پێگەی "موقع" هاوڵاتی ئاسایی بێبەش بن، ئەوا یەکسانی بەهەرەمەندبونی تاکەکان لە مافە سیاسی و مەدەنییەکان، گورزێکی کوشندەی بەردەکەوێ.

لەو وڵاتانەدا کە پێشینەیەکی دورو درێژیان لە دیموکراسیان هەیە، بۆ پێشگرتن لەو کێشەیەی سامان بۆ دیموکراسی دروستدەکات، نفوزی سیاسیان سنوردار کردووە. بۆ نمونە، جۆرە یاسایەك دادەنێن کە رێگە نەدات ئەمەرکوزی موڵکیەتی میدیاکان، لەکاتی هەڵبژاردندا سەقفێك بۆ کەسایەتیکان دیاریدەکەن کە بتوانن موجەی بکەن و کاندیدەکان ناچار دەکرێن سەرچاوەی داراییان رابگەیەنن و.. هتد.

بەلام بەرگرتن لە سەپینەوە یا پەراوێزبونی تاکەکان پێویستی بە ئاوڕدانەوەیەکی جیدی لە زامنکردنی مافە ئابوری کۆمەڵایەتی و کولتورییەکانیان هەیە. ژیان سەرەکیترین مەرجی پیادەکردنی مافە مەدەنی و سیاسییەکانمانە. ئەمەش پێویستی بە ئاسایشی جەستەیی و هەروەها دەستگەیشتن بە پێویستیەکانی ژیان هەیە، واتە ئامرازێك بۆ خۆراك، خانو، ژینگەی دروست و تەندروستی چاك[22]. دەبێ مافی فێرکردن و پەروەردەش بخرێتە سەر ئەم پێرستە. گومانی تیا نییە پەروەردەکردن بۆ دەستگەیشتن بە مافە ئابورییەکانی دی، پێویستە. بەبێ هەبونی زانیاری لەبارەی خۆراك یا تەندروستی بەتەنها دەستەبەرکردنی لایەنی کەمی دەرامەت یا تەندروستی بەس نییە. فێرکردن و پەروەردە شارەزایی و لێهاتویی بۆ کارکردن بەرهەمدێنێ و ئەمەش دڵنیاترین رێگەیە بۆ بەدەستهێنانی لایەنی کەمی دەرامەت و مافە ئابورییەکانی دی. فێرکردن و پەروەردە مەرجێکە بۆ کاریگەری پیادەکردنی مافە سیاسی و مەدەنیەکان و تەنانەت بۆ وشیاربوون لەم مافانەش پێویستە. کەواتە مافی فێرکردن و پەروەردە مافێکی کولتووری بنەڕەتیە و بێبەشبون

لەم مافانەش بەتایبەتی زیان لە یەکسانی سیاسی و مەدەنی دەدات کە بنەمای دیموکراتیکە.

فێرکردن و پەروەردە پەیوەستبونی دولایەنەی مافە جیاوازەکانی مرۆڤ دەردەخات. ئەم پەیوەستبونە لە هیچ شوێنێك هێندەی مافی کار یا کارکردن، واتە یەکەمین مافی ئابوری، کۆمەلایەتی و



کولتووری بڕوانامەی نێونەتەوەیی بەڕوونی دەرناکەوێ. ئەم بێکارییە بەربلاوەی سالەکانی *1970*، *1980* و سەرەتای *1990* زایینی یەخەی بەشێکی گەورەی جیهانی پێشکەوتوی گرتبوو لە ولاتە گەشەسەندوەکاندا وەك نەخۆشیەکی درێژخایەن دەرکەوتوە کە بۆتە مایەی بێبەشبونی مافەکانی دی مرۆڤ. مافی کارکردن چ بەشێوەی کار بۆ خودی کەسەکە بێ یا بۆ خەلکانی دی، لە دوو ڕووەوە گرنگی هەیە. یەکێکیان ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە دەرامەتێکی راستەوخۆی بۆ ئیشکەرەکە دەبێ، ئەویتریان بێکاری بەربلاو تواناو ئارەزوی کارگەران بۆ دابینکردنی بودجەی پێویست بۆ بیمەی کۆمەلایەتی بێکاران لاسەنگ دەکات، ئەم کارە مانای لەکەدارکردنی رەگەزو بنەماکانی کۆمەلگەی خۆشگوزەران و لەنێوچونی لەسەرخۆی گشت مافە ئابورییەکان دەگەیەنێ بە مافی تەندروستی، مافی نیشتەجێبوون، مافی خۆراك و مافی لایەنی کەمی دەرامەتیشەوە.

لایەنێکی تری مافەکانی کارکردن بەتایبەتی کاتێك گرنگی هەیە کە پەیوەندی هەبێ بە مافی سیاسیو یەکسانی هاولاتیانەوە، ئەوەیە کە کارکردنو بەجێهێنانی پێداویستییە مرۆییەکان لە رێگەی هەوڵ و کۆششی فەردیەوە دەبێتە مایەی رێزو پشت بەخۆبەستنی زیاتری مرۆڤ و هەر لەم رێگەیەشەوە پشتگیری بەدیهێنانی پێداویستیەکانی ئەوانی دی دەکرێ، بەلام بێبەرهەمیو پەیوەستبوونی یەك لایەنە بە ئەوانی دییەوە لەجیاتی پەیوەستبوونی دولایەنە، دەبێتە مایەی لەدەستدانی رێزو پشت بەخۆبەستن و لە ئەنجامیشدا ئابوتی شارەزایی وەرگرتنی مافەکانی دی لێدەکەوێتەوە[14].

کەواتە دەبینین دەستەبەرکردنی ماف ئابوری، کۆمەلایەتی و کولتورییەکان بە دەستەبەرکردنی لایەنی کەمی یەکسانی مەرجێکی زەرورییە بۆ بەدیهێنانی دیموکراسی بۆئەوەی هەموو هاولاتیان دەستیان بە مافە مەدەنیو سیاسیەکانی خۆیان بگات. هەر جۆرە بێبەشکردنێکی جیدی لە پێداویستیەکانی ژیان یان فێرکردن و پەروەردە یا دەرفەتی کارکردن، دەبێتە هۆی لاوازکردنی مافەکانی هاولاتیو لەکەدارکردنی توانای ژیانی مەدەنی بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ ئەوانی دیدایە. بەلام جگە لەم ئاسەوارە راستەوخۆیانە ئاسەواری ناڕاستەوخۆش زیان بە مافە دیموکراتیەکانو چونێتی یان توانای بەردەوامبونی دیموکراسی بۆ هەموان دەگەیەنێت. لەو ڕووەوە کە ئەم دەرئەنجامانە بە ئاکامی کۆمەلایەتی گەورەتری بێبەشبونی ئابوری دەژمێردرێ، لەڕووی زەمەنەوە درەنگتر دەردەکەون

دواتر دەرئەنجامەکان لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندا بەشێوەی جیاواز دەردەکەوێ. لەنێو ئەو دەرئەنجامانەشدا دەکرێ ئاماژە بکەین بۆ لەناوچونی بەرهەمهێنان و خزمەتگوزاری، زیادبونی تاوان‌و کۆچکردن بەرەو شارەکان، زۆربونی هەژارانی شارنشین‌و هەندێ جاریش شۆڕشی رێکخراو و بەرگری چەکدارانە. ئاراستەی "تەوەجوهی" دیموکراسی بۆ پاراستنی مافی ئابوری، کۆمەڵایەتی و کولتووری هاوڵاتیان لە دوو لاوە رەخنەی لێدەگیرێ[15]. یەکەم رەخنە کە زیاتر لایەنی ئابوری هەیەو، گریمانەکەی خۆی لەسەر دژایەتی نێوان بەرنامەی پاراستنی مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی‌و کولتورییەکان لەگەڵ ئامانجە زەرورییەکانی تری ئابوریدا دادەمەزرێنێ. بۆ نمونە لەبارەی وڵاتە روو لە گەشەکاندا دەوترێ لەڕووی گواستنەوەی سەرمایە بۆ بەشی مەسرەف لە ئەنجامی جێبەجێکردنی مافە ئابورییەکان، دژایەتی نێوان مافە ئابورییەکان‌و گەشەسەندنی ئابوری دەکەوێتە روو. بەڵام لێرەدا پێناسەکردنی سەرمایەگوزاری زۆر سنوردارە. کام سەرمایەگوزاری دەتوانێ لەو سەرمایەگوزاریە باشتر بێ کە لە خزمەتی فێرکردن‌و پەروەردەو تەندروستی خەڵکی ئەمڕۆ و ئایندەی وڵاتێك بێ؟ ئەوەی دەبێ لە بەرنامەی مافە بنەڕەتییەکاندا بخرێتەڕوو جۆری پەرەسەندنی ئابوری‌و شێوەی دابەشکردنی بەرژەوەندییەکانێتی، نەك خودی پەرەسەندنی ئابوری[16].

دووەم رەخنە کە زیاتر لایەنی سیاسی هەیە، ئەوەیە کە هەر جۆرە بەرنامەیەکی پارێزگاریکردنی مافە ئابورییەکان ناکۆکە لەگەڵ دەزگا بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتی ئازاد، واتە لەگەڵ مۆڵکایەتی تایبەتی‌و ئازادی ئاڵوگۆڕ: لەگەڵ مولکایەتی تایبەتی لەڕووی دانانی باجی زۆرەملێ بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی بەرژەوەندییەکان ناکۆکەو لەگەڵ ئازادی ئاڵوگۆڕیش لەڕووی دەستێوەردانی‌و بەدیهێنانی بیروکراتیەتی ئاڵۆز بۆ دابینکردنی خۆشگوزەرانی گشتی ناکۆکە. ئەگەرچی پێشەکی ئەم رەخنەیە راستە بەڵام بە زەرورەت دەرئەنجامەکەی راست نییە. زەرورەتی مولکایەتی تایبەت‌و ئاڵوگۆڕی ئازاد بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی‌و لە ئەنجامیشدا بۆ دیموکراسی جێگەی مشتومڕ نییە بەڵام سڕینەوەی ئەم خەسڵەتانە ئامانجی بەرنامەی پاراستنی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان نییە، بەڵکو رێکخستن و تەواوکردنی (اتمام) ئەم دەزگایانەیە ئەویش بە مەبەستی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گشتی‌و ئەم کارە بۆ خۆشگوزەرانی گشتی بە زەرورەت بنەمای بیروکراتییەکی مەزنی لێناکەوێتەوە. ئەو دیدەی کە مولکایەتی تایبەت‌و ئازادی ئاڵوگۆڕ بە مافی رەهاو نەگۆڕ دادەنێ، ئەو واقیعە لەبەرچاو ناگرێ کە رونکردنەوەی بنەڕەتی ئەم دوو خەسڵەتە کاریگەرە بۆ دابینکردنی ئامرازو پێداویستیەکانی ژیان‌و مانەوەی مرۆڤ‌و لە ئەنجامیشدا سنورداربونیانە لە حاڵەتی نەگەیشتن بەم ئامانجانە[17].

بە وتەیەکی دی بۆئەوەی خەسڵەتی کۆمەڵایەتی مولکایەتی تایبەتی رەوایەتی هەبێ، دەبێ ئامرازی سەرەکی ژیان بۆ هەموو کەسێك ئامادە بکرێ. کەواتە ئەگەر بڕیار بێ کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیك لەسەر پایەی رەزامەندی گشتی خۆی رابگرێ، سەرباری خەسڵەتی مولکایەتی تایبەتی‌و ئاڵوگۆڕی ئازاد پێویستی بە دەستەبەرکردنی مافە بنەڕەتییەکانی ئابوریش هەیە.

لەبەرئەوە دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە پارێزگاری نەکردنی مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی‌و کولتورییەکان بە شێوازی جۆراوجۆر گورزی گەورە لە دیموکراسی دەوەشێنێ. یەکەم، بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئەو هاوڵاتیانەی مافەکانیان پێشێلکراوە

بۆ گەیشتن بە مافە مەدەنیو سیاسی و مافەکانی دی هەم گوزەرانیان لێتێکدەچێ و هەم تواناکانیشیان لاسەنگ دەبێ: پەراوێزبوونی کۆمەڵایەتی یا ئابوری هاوشانی پەراوێزبوونی سیاسییە. دووەم، ئەوەیە کە بەتەواوەتی چۆنێتی ژیانی کۆمەڵایەتی هەموو کەسێك تێکدەچێ چونکە کە ئاسایشی تاکەکەسی و دارایی لەنێو دەچێت لە ئەنجامدا تۆپزیو خەفەکردن توند دەبێتەوە. سەرئەنجام هێدی هێدی رەواخوازی سیستمی دیموکراتیك نابووت دەبێو ئەم دەزگایانەش زیاتر بەرەو داتەپین هەنگاو دەنێن. تا لەدەستدانی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان بەرفراوانتر بێ، ئاسەوارەکانی قوڵترو توندتر دەبنەوە.

### ئەنجام

دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ لە روانگەی مێژووییەوە بە دوو دیاردەی جودا وەرگیراوە و هەریەکەشیان لایەنێکی تایبەتی لە سیاسەت بۆخۆی تەرخانکردوە.. یەکێکیان وتەزایەکە تایبەت بە رێکخستنی حکومەتو، ئەویتریان مەسەلەیەکە پەیوەندی بە مافی تاکەکان و بەرگری لێکردنیانەوە هەیە. ئێمە وا فێربوین (راهاتوین) کاتێك قسە لەسەر دیموکراسی دەکەین دەربارەی دەزگاکانی وەك هەڵبژاردن، فرەحزبی، جیاکردنەوەی هێزەکانو شتی دی بیربکەینەوە کە وتەزاگەلێکە دەربارەی رێکخستنی دەستەڵات. بەڵام مافەکانی مرۆڤ نێوەندێتی بە تاکەکان دەبەخشێ و تەقەللا دەکات لایەنی کەمی هەلومەرجی پێویست بۆ بەردەوامبوونی ژیانی مرۆڤ دەستەبەر بکات. ئیتر هەر بەو شێوەیەی کە لە زاراوەی مافەکانی مرۆڤ ئاماژەی پێدەدرێ ئەم مافانە هەمیشە گەردوونیە و پێناسەو بریارە نێونەتەوەییەکان دەیانگرێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا رێکخستنە حکومیەکانی وەك دیموکراسی

هەمیشە لە بابەتە نێوخۆییەکانی دەوڵەت حیسابیان بۆ کراوە. ئەو پۆلبەندییەی لەنێوەندی دانشگاکاندا برەوی هەیە ئەم جیاکارییە بەهێز دەکات چونکە لەسەر هەمان بناغە لە کۆڕی زانستەکانی سیاسەت و لێکۆڵینەوەی مافەکانی مرۆڤ خوێندنەوەو توێژینەوەی مافەکانی دیموکراسی بە زانستی مافەکان دەسپێردرێ[18].

بەڵام ئەمڕۆ ئەم جیاکردنەوەیە شایستەی بەردەوامبون نییە. داروخانی سیستمی کۆمۆنیستی لەژێر گوشاری جەماوەر دەریخست کە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ داخوازییەکی گەردونییە نەك جۆرە حکومەتێکی دیاریکراوی سەر بە ناوچەیەکی تایبەت. هەروەها پێشینەی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لەسەر دەستی رژێمە دیکتاتورە جیاوازەکان بە دیکتاتورە چەپ و راستەکانیشەوە نیشانی دا کە گرنگی سیستمی حکومەتی وڵاتێك، پاراستنی مافی مرۆڤی هاوڵاتیانە. دەبێ دانی پیابنێین کە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ پەیوەندییەکی دانەبڕاوەو حاشا هەڵنەگریان پێکەوە هەیە. لە دوتوێی ئەم باسەدا، پێناسەی خودی دیموکراسی هاتوە. لاوازی پێناسەی پشت ئەستور بە دەزگاکانی سیستمێکی حکومی لەوەدایە کە بەشێوەیەکی ورد پێمان نالێت چ شتێکی ئەم دەزگایانە سیفەتی دیموکراسیان پێدەبەخشێ. ئەگەر بەمەش وەلامبدرێتەوە کە سەرجەم ئەو وڵاتانەی بە دیموکراسیان لەقەڵەم دەدەین ئەمشێوە دەزگایانەیان هەیە، ئەوا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە بۆچی هەر لە بنەڕەتەوە دەبێ بە وڵاتانی دیموکراسی لەقەڵەمیان بدەین. بەمشێوەیە دەچینە بازنەیەکی بەتاڵی ئەوتۆوە کە تاکە رێگەی دەربازبون رونکردنەوەیەکی وردی ئەو بنەمایانە کە ئەم دەزگایانە خۆیان لەسەر پایەکانی راگرتووە یان کاریگەریان دەبێ لە دەستگەیشتن بەو بنەمایانەدا.

هەر بەو جۆرەی کە وتمان ئەو بیرکردنەوەیەی ناوکی بنەڕەتی دیموکراسی پێکدەهێنێ حکومەتی خەڵکی بەپا کۆنترۆڵی خەڵکییە لەسەر بڕیارە گشتییەکان کە خاڵی دەسپێکردنی هاوڵاتیانە نەک دەزگا حوکمییەکان. یەکێك لە بنەماکانی ئاشنابون بەم ناوکە (نواة) ئەوەیە کە هەموو هاوڵاتیان هەم لە ڕێگەی کۆبون کۆبونەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی و هەم لە ڕێگەی بەشداریکردن لە حکومەتدا مافی بەشداربونیان هەبێ لە کاروباری گشتیدا، ئەویتریان ئەوەیە کە دەبێ هەموو کەسێك بەشێوەیەکی یەکسان ئەم مافەی لەبەردەست بێ. پیادەکردنی کۆنترۆڵی هاوڵاتیان لەسەر کاروباری گشتیو یەکسانی هاوڵاتیان لە پیادەکردنی ئەم کۆنترۆڵەدا، بنەمای بنەڕەتی دیموکراسیە کە لە کۆمەڵگە بچوکەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پیادە دەکرێ و لە کۆمەڵگە گەورەترو ئاڵۆزترەکانیشدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بۆ نمونە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی نوێنەرەوە پیادە دەکرێ. لەو پۆلبەندییەی کە مافەکانی مرۆڤی تیا کراوە بە دوو بەشی سەرەکییەوە، مافی سیاسی و مەدەنی هەروەها مافی ئابوری، کۆمەلایەتی و کولتوری دەتوانرێ تێبینی ئەوە بکرێ کە مافە سیاسی و مەدەنییەکان، بەشێکی زاتیو دانەبڕاوی دیموکراسییە. دیموکراسی بەبێ ئەم مافانە دەبێتە قالبێکی کلۆر، چونکە بە نەبونی ئازادی دەربڕین، یەکێتی، کۆبونەوە، هاتوچۆو ئاسایشی تاکەکەس، هەڵبژاردن شێوەی ڕێوڕەسم بەخۆیەوە دەگرێو هەموو جۆرە کۆنترۆڵێکی خەڵکیش لەسەر حکومەت دەکاتە شتێکی لەستەم. بەڵام پەیوەندی مافە ئابوری و کۆمەلایەتییەکان بە دیموکراسییەوە پەیوەندییەکە لەسەر پەیوەندی بەرامبەر دامەزراوە. گشتگیری نەبونی ئەم مافانە یەکسانی سیاسی و مەدەنی، چێژێتی ژیانی گشتی و توانای بەردەوامبونی بەرژخایەنی دەزگا دیموکراتییەکان دەخاتە مەترسییەوە، لەلایەکی تریشەوە دیموکراسی خۆی مەرجێکی پێویستە بۆ پارێزگاریکردن لە مافە ئابوری، کۆمەلایەتی و کولتورییەکان.

تایبەتمەندێتی بیرکردنەوەی مۆدێرن شێوەی تێڕوانینی مرۆڤە لە ژیانی خۆی. مرۆڤی مۆدێرن خۆی وەك بکەرو خاڵی دەسپێکردنی هەموو زانیارییەکان دەناسێنێ، بەو مانایەی خۆی لە حاڵەتی ئۆبجێکتیڤ یا بابەتی ناسین دەرهێناوەو گۆڕاوە بۆ سەبجێکت یا بکەری ناسین. مافەکانی مرۆڤ، بەرجەستەبونی بکەری بونی مرۆڤە و دەرخەری ئەو واقیعەشە کە مرۆڤ لەپێناوی مانەوەیدا دەبێ خۆی کۆنترۆڵی ژیانی خۆی بگرێتە دەستو بەتەنها مافەکانی مرۆڤ وەك چوارچێوەیەکی هاوبەش رابگەیەنێ. ئەم خۆچاودێریکردنەوەو گەڕان بەدوای بەڵگەو مایەتی بون و دامێنانی میکانیزمی پێداویستیەکان، هەمان ئەو شتەیە کە "کانت" ناوی لێناوە "دەرچونی مرۆڤ لە منداڵی خۆی". ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە بوە هۆی ئەوەی مرۆڤ خۆشبەختی ڕاستەقینەی فەردیو کۆمەلایەتی لە بەدیهێنانی مافە زاتیەکانی خۆی و لە چوارچێوەی ئەو مافانەو ژیان لەگەڵ ئەوانی دیدا بدۆزێتەوە ئەویش لەسەر بناغەی یەکسانی سیاسیو بەهرەمەندبونی لە لایەنی کەمی پێداویستی ئابوری و کۆمەلایەتی و کولتورییەکان. ئەمەش خۆی پێویستی بە ڕەوشێکی سیاسەتە کە ژیانی کۆمەلایەتی لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا ڕێکبخاتو پارێزگاری لە مافە بەڵگەنەویستەکانیشی بکات. دیموکراسی دەرکەوتنی ئەم خواستەیە. کۆمەڵگەی دیموکراسی کۆمەڵگەیەکە ئامانجی سەرەکی بەرزترین ئاستی خۆشگوزەرانیە بۆ زۆرترین ژمارەی تاکەکان. لەم کۆمەڵگەیە فرەیی بەهرەو خۆشیو ئارامی ئامانجە نەك هێزو دەستەلات و قازانج. جێگەی

خۆیەتی ئەم نوسینە بە وتەیەکی ڕەوان و پاراوی ئەلیکس دۆ توکڤێل- ی فەرەنسی کۆتایی پێبهێنین کە فەیلەسوف و مافناس و سیاسەتمەدارێکی سەدەی نۆزدەیە.

تۆکڤێل دەڵێت: "ئەگەر بە ڕای ئێوە عەقڵ لە بلیمەتی و زیرەکی بۆ مرۆڤ بەسودترە، ئەگەر ئامانجتان خولقاندنی نەریتێکی خەمرەوێن بێ نەك هێنانەدی هونەری قارەمانانە، ئەگەر ئێوە بینینی خراپەکاری و کەموکورتی لە سەیرکردنی تاوانەکان زیاتر پەسەند دەکەن و پێتان باشە کەمتر شاهیدی هەنگاوە گەورەکان بن بەو مەرجەی لەم ڕێگەیەوە ژمارەی گوناهبارە چاونەترسەکان کەمبکات، ئەگەر لەجیاتی ژیان لە کۆمەڵگەیەکی درەوشاوە، قایلن بە ژیانی کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران، سەرئەنجام ئەگەر بە ڕای ئێوە زۆرترین هێزو گەورەترین شانازی بۆ سەرجەم میللەت ئامانجی سەرەکی حکومەت نییە، بەڵکو دابینکردنی بەرزترین ئاستی خۆشگوزەرانییە بۆ هەر تاکێك لە تاکەکانی میللەت و بەوپەڕی ڕادەی لەتوانابونیشدا لە داماوی و هەژاری ڕزگاریان بکات، کەوابوو هەلومەرجی ژیانی هەموو کەسێك یەکسان بکەن و حکومەتێکی دیموکراسی دامەزرێنن. ئەگەر دەبینن ئیتر دەرفەتێك بۆ هەڵبژاردن نەماوەو هێزێکی باڵاتر لە مرۆڤ ناچارتان دەکات تا بێ ڕاوێژکردن لەگەڵ مەیلەکانی خۆتاندا، یەکێك لە دوو جۆری حکومەت هەڵبژێرن، کەوابوو وەرن و لایەنیکەم هەوڵبدەن بۆئەوەی بەهرەمەندبن لە هەموو ئەو چالاکیانەی کە لەم ڕێگەیەوە دەستەبەر دەکرێ و بە ناسینی تەواوی غەریزە باشەکان و مەیلە ناپەسەندەکانی، هەوڵبدەن بۆ ئەوەی کاریگەری مەیلە ناپەسەندەکانی سنوردار بێ و جێپەنجەی غەریزە باشەکان زیاتر پەرە بسێنێ"[19].

## سەرچاوەکان


*1-D. Held. "Democracy" in Joel Kreiger, de, the oxford companion to the politics of the world, NY, oxford press, 1993, pp. 220- 224.*

*به نقل از خرد در سیاست. گزیده و نوشته و ترجمه ء عزت الله فولادوند، طرح نو، 1377. ص 362.*

*2- جان استوارت. میل، تأملاتی در حکومت انتخابی، ترجمه ء علی رامین، نشرنی، 1369، ص2.*

*3- همان، ص3.*

*4-G. Duby, "Histore de la France, de 1348 a 1852", References la russe, librairie la russe, Paris, 1989. P. 282.*

*5- رامین جهانبگلو، مدرنیته، دیموکراسی، و روشنفکران ، نشر مرکز 1378، ص 41.*

*6- همان، ص 42.*

*7- همان، ص 44.*

*8- بگەڕێوە بۆ بەرهەمی وەك:*

*B. Barder. strong Democracy, Berkley, University of California press, 1984; S. Ben habib (ed.), Democracy and Difference, princeton, princeton university press, 1966, G. Duncan (ed), Democratic theory and practice, cambridge Cambridge university press, 1983; D. Held Models of Democracy, second edition Cambridge, polity press, 1996; J. A. Schumpeter, Capitalism, socialism, and Democracy. fifth edition, London, Unwin University Books 1952.*

*9- . ر. ك. بە:*

*S. M. okin "Liberty and welfare: Some Issues in Human Rights Theory" in J. R. Pennock and J. W. Chapman (edj), Human Rights, New York, New York University press, 1981. pp. 230- 56.*

10-Ibid

11-R. Plant Modern Political Thought, oxford, Black well publishers, 1991, chapter 5.

12-UN Doc. E/ C. 4/ 1987/ 17. Principle 25;UN Doc. E/C 12/1990/8. pp. 41. 86.

13-okin, op. cit, pp. 230- 56.

14-D. Beetham, Democracy and Human Rights, London, Polity press. 1999. P. 98.

15-Ibid, p. 100.

16-Ibid.

17-Ibid, p. 101.

18–ر. ک. به:

D. Beetham (de), Politics and Human Rights, Oxford, Blackwell publishers. 1995. pp. 1-9.

19–ریمون آرون، مراحل اساسی سیر اندیشه در جامعه شناسی، ترجمه باقر پرهام، 1377، ص 253.

اطلاعات سیاسی، اقتصادی، شماره– 158– 157، ص 118–127.

# دەربارەی پێناسەی نەتەوەیی

■ نووسینی: رۆس پوول

● و. لە ئینگلیزیەوە: س.ع

وتارەکەی "جوناسان رێ-Ree" کە بە ناونیشانی "نێو نە‌تەوایەتی Internationality"یە، بەشدارییەکی زۆر گرنگ دەکات لەو نووسینە فەلسەفییە زۆرەی کە دەربارەی نەتەوایەتی هەیە. ئەو چەمکەی کە ناونیشانی وتارەکەی لە بارەیەوەیە بەڵێنی ئەوە دەدات کە سودێکی تایبەتی هەبێت. هەروەکو چۆن ئێستا راهاتووین کەوا بیر لە هاوڵاتیی تاك بکەینەوە کە لەناوو بەهۆی پەیوەندییە نێوخودییەکانەوە پێکهاتبێت، "رێRee" پێشنیاز دەکات کە دەبێت بەهەمان شێوە بیر لە تاکە نەتەوە بکەینەوە کە بەهۆی پەیوەندیی نێونەتەوەییەوە پێکهاتبێت، هەرچەندە، دژ بەم بۆچوونە، سیستەمی پەیوەندیی نێوان نەتەوەکانە کە رافەی بوونی نەتەوەکان دەکات، نەك بە پێچەوانەوە، ئەگەر بە تەواوەتی لێی تێگەیشتبم، (رێ Ree) نایەوێت نکوڵی لەوە بکات کە پێویستە چەند گۆڕانکارییەك لە بونیادی ناوەوەی وڵاتێك رووبدات، پێشئەوەی دانیشتوانەکەی -ئاغاو جوتیارەکان، کرێکارو سەرۆکەکانیان، ژنانو پیاوان- وەکو ئەندامی یەك کۆمەڵگای نەتەوەیی، بیر لە خۆیان بکەنەوە، بەڵام لەم پرۆسەیەدا دەمێکی چارەنووسساز هەیە، ئەویش بوونی چوارچێوەیەکی نێودەوڵەتییە کە وا دەخوازێت ئەو کۆمەڵگایانەی کە لێی پێکدێت (Comstituent Communities) بە هەندێك مەرجی تایبەتی رامیاریو یاساییو سەربازی جوگرافی بوونیان قایل بن. خۆناسینی نەتەوەیی وا دەخوازێت خەڵك وابیر لە نەتەوەکەیانو خۆشیان بکەنەوە کە رووبەڕووی خەڵکانی دیکەی جیاوازن -کە لەوانەیە هەندێکیان دژ بن. ئەوی دیکەیی (Otherness) چۆن بۆ پێناسەی تاك چارەنووسسازە، بە هەمان شێوە بۆ نەتەوەش چارەنووسسازە.

هەروەها وتارەکەی (رێ Ree) پەیامێکی تایبەتی بۆ فەیلەسووفەکانیش هەیە، لەوەی بەرەو رووی ئەوەمان دەکاتەوە کە ناچار بین لە تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکانی ئەو چالاکییەی کە هەڵمانبژاردوە بکۆڵینەوە.

زۆرجار فەیلەسووفەکان ئەو مەسەلەیە زۆر بە تەسکی وەردەگرن و وای چارەسەر دەکەن کە مەسەلەکە لە دەفەرێکدایە کە هیچ کاریگەری کارتێکردنی ناوچەیی تێدا نەبێت. هەرچەند هەموو لەوە ئاگادارین کە جیاوازیی زۆر هەیە لە شێوازەکانی فەلسەفەی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزیدا، بەڵام بە دەگمەن بیر لەوە دەکەینەوە کە ئەم جیاوازییانە تەنها مەسەلەی جیاوازی شێواز (*Style*) نین، بەڵکو لە ناوچەرگەی ڕوانینمان بۆ خودی مەسەلەکەوە هەڵقوڵاون. ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە (ڕێ) دەربارەی فەلسەفەی ئینگلیزی لە ساڵانی پەنجاکاندا ئەنجامی دا، ئەوەمان بیردەخاتەوە کە مشتومڕو بیرکردنەوە فەلسەفییەکان هەمیشە لە مێژوو و ناوەندی کۆمەڵایەتیی تایبەتەوە سەرچاوە دەگرن و دێنە کایەوە و داواشمان لێدەکات کە وا بیر لە پرۆژەی فەلسەفە بکەینەوە کە کارێکە لە فەرهەنگە نەتەوەییە تایبەتەکانەوە هەڵقوڵابێت و بەشداری ئەو فەرهەنگە بێت، ئەمە مەرج نیە ئەو بەهانانەی فەلسەفە لەناو ببات کە گەڕانە بەدوای ئەو ڕاستیانەی کە ڕووت (*abstract*) و گەردوونین؛ بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێین کە خاڵی لێک جیابوونەوە هەمیشە پتەو (*concrete*) و تایبەتە.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر مەسەلە لەم هەڵوێستەی (ڕێ)دا هەن کە ناچارم پێیان قایل نەبم و دەمەوێت شتێک دەربارەی دوو لەو مەسەلانە، کە بەلای منەوە گرنگی تایبەتییان هەیە، بڵێم یەکەمیان؛ مەسەلەی دەرکردنی چەمکی پێناسەیە (*identity*) کە لە زاراوەی "پێناسەی نەتەوایەتی"دا دێت، بە پێشنیازی ئەو ئەم زاراوەیە "یەکێکە لە گەوجیە سیاسی و ئایدیۆلۆژیی و هزرییە هەرە گەورەکانی ئەم سەردەمە" (ل8) بەرامبەر بەمە، دەمەوێت ئەوە بخەمە ڕوو، کە بەلای منەوە، چەمکی پێناسە ڕۆڵێکی چارەنووسساز دەبینێت لە تێگەیشتنمان لە نەتەوایەتی، ئەو زەمینەیەی کە (ڕێ*Ree*) دایناوە بۆ قبووڵنەکردنی، لەسەر تێنەگەیشتن دامەزراوە. دووەم خاڵی قایلنەبوونم دەربارەی ئەو هەڵوێستەیە کە دەبێت لە بەرامبەر بیری نەتەوایەتی (*nationalism*) وەریبگرین. (ڕێ*Ree*) هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەو نەریتە باستانییە بەردەوامە کە لە نێوەندە ڕۆشنبیرییەکانی باڵی چەپدا دامەزرابوو کە بریتیبوو لە هەڵوێست وەرگرتن لە دژی بیری نەتەوایەتی. سیستەمی نێونەتەوەیی (بە واتای ئەو) بریتیە لە "هەڵخەڵەتاندن و بەهانەو چاوبەست و ساختەیەکی زیندوو"(ل10) و دەبێت هەرچی زووە وازی لێبهێنین. ئاشکرایە کە ناتوانین (لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا) ئەم جۆرە بینینە ساکارە گەشبینە دەربارەی خێرو بێرەکانی (*benificence*) بیری نەتەوەیی وەربگرین کە لەوانە بوو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا بۆمان بشیایە. لەگەڵ ئەوەشدا، حەزدەکەم داوای ئەوە بکەم کە دیدێکی تۆزێك جیاوازتان هەبێت دەربارەی پێناسەی نەتەوایەتی لەوەی کە (ڕێ*Ree*) ماوەمان پێدەدات کە هەمانبێت. ناسیونالیزم لەلایەنی ئاکارییەوە دیاردەیەکە زۆر ئاڵۆزترە لەوەی کە ئەو دانی پێدادەنێت و هەر دەربڕینێك کە گوێ نەدا بەو ئاڵۆزییە دەبێتە مایەی ئەوەی کە (چەند منداڵێکیش لەگەڵ چڵکاوەکەدا فڕێ بدرێنە ژێرابەوە).

## *ئاوەزەکانی پێناسە*

با بە بیری (*notion*) پێناسە دەست پێبکەم. ئەم زاراوەیە لە سۆسیولوژیای باوو لە لێکۆڵینەوە فەرهەنگییەکان و لە گفتوگۆ سیاسیەکان و لە ڕۆژنامەکاندا بە زۆر شێواز، جیاوازی سەرلێشێوێنەر بەکاردەهێنرێت. بە تایبەتی لە بارەی مەسەلەی نەژادەکاندا، مرۆڤیش دەبێت بە گومان بێت لەمەڕ ئەگەری دامەزراندنی واتایەکی یەکگرتووی بەهێز. وا دیارە هێشتا دوو شێوە بەکارهێنان (یان، لەوانەیە،

دوو ئاراستە) زاڵن. لە واتایەکیاندا، پێناسە بریتیە لەو سیفەتو تایبەتمەندییانەی کە تایبەتن بە گرووپێك یان کۆمەڵگایەکی دیاریکراو. لەم تێگەیشتنەدا، پێناسەی نەتەوەیی دابونەریتو سیاسەتو مێژووو جوگرافیا فەرهەنگ دادەڕێژێت. کتێبەکەی *فێرنان برودێل* کە بە ناونیشانی *پێناسەی فەرەنسایە*، هەروەها ئەو کتێبەی کە بە هاوکاری لەگەڵ چەند نووسەرێکدا نووسراوەو *رافائێل ساموێل* بە چاپی گەیاندوە بە ناونیشانی *نیشتمان پەروەری! دروستبوون و تێکچوونی پێناسەی نەتەوەیی بریانی* دوو نمونەی باشمان دەدەنێ لە بەکارهێنانی زاراوەکە بەو شێوەیە ، لە لایەکی دیکەوە، ئەم زاراوەیە بە شێوەیەك بەکاردێت کە باس لە جۆرێك بوونی تاکە کەس بکات. ئەویش ئەو شێوەیەی کە بیر لە خۆیانو لە خەڵکانی دیکە دەکەنەوە. بەم واتایە، تاکە کەسەکان پێناسەیان هەیە (یان هەندێکجار بۆی دەگەڕێن)و "پێناسەی نەتەوەییش جۆرێکە لە خۆ ئاگابوونی هاوبەش Shared Self-awareness"، زاراوەکەش بە واتایەکی نزیك لەمەوە لە کتێبەکەی *چالز تەیلەر* کە بە ناونیشانی *سەرچاوەکانی خود: دروستبوونی پێناسەی مۆدێرنە* بەکارهاتووەو لەلایەن *پیتری ئەندەرسن*ەوە لە پێداچوونەوە سەرنجراکێشەکەیدا دەرباری کتێبەکەی *برۆدێل*و هەروەها لە لایەن ژمارەیەك نووسەری دیکەوە.

هەبوونی (بە لایەنی کەمەوە) دوو واتا بۆ زاراوەی *پێناسەی نەتەوەیی*، لەوانەیە زەمینە خۆشبکات بۆئەوەی زاراوەکە قبووڵ نەکەین لەسەر بنچینەی ئەوەی کە ئەمو مژاوییە (هەرچەند کە لە دواییدا شتێك دەڵێم بۆ پێکەوە بەستنی هەردوو واتاکە). لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەی مایەی مەراقە ئەوەیە کە (رێ Ree) هیچ لەم بارەیەوە پەرێشان نیە، لە راستیشدا باسی بەکارهێنانی یەکەمی زاراوەکە هەر ناکات. بەرپەرچدانەوەکانی ئاراستەی واتای دووەم دەکات. لەم بارەیەوە دەنووسێت.

کێشە لە بەکارهێنانی وشەی *پێناسە* لەوەدایە کە.. بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕوات کە هەموو ئازارو زەحمەتو لێڵییەك لە پەیوەندیی خەڵك بە خودییەتی (*Subjectinty*) خۆیانە، لابات: کێشەی کەسایەتی (*Personality*) بچوکتر دەکاتەوەو دەیکات بە مەسەلەی وێنەی خود Self- image، پێشەکی ئەگەری ئەوەی کە خەڵك لەوانەیە لەبارەی خۆیانەوە هەڵە بن یان هەڵخەڵەتابن دوور دەخرێتەوە (ل9) سەرەتای شپرزەبوونم لە بارەی ئەم راسپاردەیەوە ئەوەیە کە ناتوانم بیر لە (هیچ) کەسێك بکەمەوە، ئەم بۆچوونە دەربارەی پێناسەی نەتەوایەتی بەکاربهێنێتو لای وابێت کە ئەم ئەنجامانەی هەبێت. لە راستیدا، مەسەلەی ئەوەی کە باری کۆمەڵایەتی پێناسەکان بنیات دەنێتو لێڵەو کێشەی زۆری لەسەرە، بۆتە کڵێشەیەك لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییەدا، بێگومان ئێمە دەبێ زۆر ئاگامان لە بیرە کڵێشەییەکان بێت، زۆر گرنگیشە هەمیشە ئەوەمان لەبیر بێت کە ئێمە لەوانەیە لە بێئاگاییەوە ببەسترێینەوە بە هەندێك چەمکەوە کە لەوانەیە پێی قایل نەبین. بەڵام (رێ Ree) هەوڵی وا نادات بۆ وردبوونەوە لە بەکارهێنانە تازەکانی زاراوەکە، بۆئەوەی وا پیشانبدات کە ئەو پشتگیریی ئەو واتایانە دەکات کە تیایدا هەن، لەبەرئەوە دەشێت رێ خۆی، بە هەڵەدا چووبێت. بە هەر شێوەیەکیان بێت، پێویستیمان بەوە هەیە کە لە نزیکترەوە سەیری چەمکی پەیوەندیدار بە پێناسەوە بکەین.

رێ Ree سەرەتای ئەم چەمکە دەگێڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە بەناوبانگەکەی لۆك (*Locke*) دەربارەی پێناسەی کەسایەتی کە بە ناونیشانی *وتارێك لەمەر تێگەیشتنی مرۆڤ*ەوە بوو، هیچ بەڵگەیەکیش دەربارەی ئەم نەژادە ناداتە دەست، لەبەر چەند

هۆیەك كە لە دواییدا ڕوونی دەكەمەوە، من زۆر بە گومانم لە بارەی ئەم نەژادە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم وتارەی *لۆك* خاڵێكی سەرەتای گونجاومان دەداتێ، لۆك پەرۆشی ئەوە بوو كە چەمكێك لە بارەی "هەمان كەس بوون *being the sam peron*" بكات كە دەبێتە هۆی ڕوونكردنەوەی ئەو واتایەی كە تیایدا وا بیر لە خەڵك بكەینەوە كە پێناسەی خۆیان بە درێژایی كات دەپارێزن. ئەمەش تێگەیشتنێكە كە ژمارەیەك كرداری كۆمەڵایەتی پێشەكی گریمانەی دەكەن، وەكو ستایشكردنو خەڵات، لۆمەكردنو سزا، بەڵێندانو پابەندبوون.... هتد. پاش وردبوونەوە لە ژمارەیەك نمونەی ڕاستو گریمانەیی، *لۆك* پێشنیازی ئەوەی كرد كە پێناسەی تاكەكەس لەو ڕاستیەدایە كە كەسەكان دەتوانن بیر لەوە بكەنەوە كە چی بوونو چیان كردوە، ئەو ڕێگە تایبەتەی كە یادكردنەوە دەمداتێ بۆ گەڕانەوە بۆ ڕابردووی خۆم، ئەوەم بۆ ڕوون دەكاتەوە بۆچی وەكو هەمان ئەو كەسەی كە لە ڕابردوودا هەبووم سەیر دەكرێمو بە تەواوی بەرپرسیارم لەو كردارانەی كە كردوومنو ئەو بەڵێندانانەی كە بەشداریم كردوونو شتی دیكەی لەم بابەتە.

بە پێی *ڕیِّ* ڕاڤەكردنەكەی *لۆك* نزم دەكرێتەوە بۆ ئەمە: *"زۆر بە سادەیی، خەڵك ئەوەن كە دەربارەی خۆیان یاد دەكەنەوە، یاخود بە كورتی تۆ ئەو كەسەیت كەوا دەزانیت ئەوەیت"* (ل8) لەم خوێندنەوەیەدا، كە ئێجگار ناهاوسۆزە لەگەڵ *لۆك*دا، پێناسە -لەوانەشە كەسەكە- لە بابەتی بە ئانقەست هەڵبژێرراوی چەند كردەیەكی هەست زیاتر نیە، لەم بۆچوونەدا زۆر كێشە هەن، یەكێكیان ئەوەیە كە *ڕیِّ* باسی دەكات ئەویش ئەمەیە: زۆر زەحمەتە كە هەرگیز وا بزانین كە دەربارەی خودی خۆمان بەهەڵەدا چووبووین، تەنانەت لە خوێندنەوەیەكدا كە زیاتر هاوسۆز بێت لەگەڵ *لۆك*دا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە *لۆك* چەمكێكی سفتی پێناسەی كەسی پێشكەش ناكات. فەیلەسووفەكان دەمێكە بەرهەڵستی پێناسە دەكەن لەسەر بنەمای *بازنەیەتی Circularty*[1]: بیری (هزری) پەیوەندیداری یادكردنەوە گریمانەی چەمكی پێناسەی كەسی دەكاتو پێوانەیەكی سەربەخۆی بۆ دابین ناكات. ڕەنگە كێشەی گرنگتر لەم دەقەدا *{دەقەكەی ڕیِّ}* ئەوە بێت كە زۆر ئەستەمە لەوە تێبگەین چۆن ڕاستییەكی دەروونی وەكو یادكردنەوە دەتوانێت ئەم هەموو ئەنجامە كۆمەڵایەتیو ئاكارییە گەورەیەی لێبكەوێتەوە كە وا دانراون لە ئەنجامی پێناسەی كەسییەوە بێن، بۆچی، بۆ نموونە، یادكردنەوەی هەڵەیەك كە لەوانەیە كردبێتم ببێتە مایەی ئەوەی كە سزاكە بدەم؟ لە كاتێكدا ئەو فەلسەفەیەی لەدوای *لۆك*ەوە هات، قایل نەبوو بە شێوازی ڕاڤەكردنەكەی، بەڵام ڕازی بوو بە شێوازی ڕاوەستانی لەسەر كێشەكە. گەڕان بەدوای پێوانەیەكدا بۆ پێناسە، بریتیبوو لە هوڵێك بۆ دامەزراندنی دەستەیەك پەیوەندیی فیزیاییو دەروونی كە بەس بێت بۆ ڕاڤەكردنی هۆی ئەوەی بۆچی ڕێگەی مامەڵەكردن لەگەڵ كەسێكدا هەڵدەبژێرین كە لە كاتێكی تایبەتدا ژیابێت وەكو ئەوەی كە هەمان كەس بێت لەگەڵ كەسێك تەواو جیاوازدا كە كاتێكی دیكەدا ژیابێت. بە گشتی، هۆیەكی زۆر كەم هەیە بۆئەوەی وای دابنێین كە ڕاڤەكردنەكانی دوایی، بۆ نمونە ئەوانەی لە زاراوەی بەردەوامی جەستەییدان (*bodity Continuty*) زۆر لەوەی لۆك سەركەوتووترن. ئەمەش *دێرێك پارفت Derek Parfit* بڕیاری تەواوی لەسەر دەداتو ئەوە دەخاتە ڕوو كە هیچ سیفەتێكی فیزیایی یان دەروونی لەم جۆرە نیە كە سەرپشك بێت، ئەو پەیوەندییە سەرنجڕاكێشەیش كە هەیە لە نێوان خودەكانی (بە زاراوەی خۆی) ڕابردووو داهاتوودا، بەس نیە بۆئەوەی ببێتە بەهانە بۆ

نهێنانەی پێناسەی کەسی. بەپێی ڕاڤەکردنی پارفت، بیرۆکەی ئەوەی کە مرۆڤ لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا کەسایەتی خۆی دەپارێزێت، لە باشترین حاڵەتیدا دەربڕینێکی شلو چەواشەکەرە، لە خراپترین حاڵەتیشدا هەڵەیەکی فەلسەفی نزمە کە ژمارەیەک ئەنجامی گرنگی لێدەکەوێتەوە لە بیرکردنەوەماندا لە بارەی خۆمانو ئەوانی دیکەشەوە.

مەبەستی لێکۆڵینەوەکانی پارفت ئەوەیە کە بیری پێناسەی کەسی هەڵبوەشێنێتەوە ڕێگەیەکی دیکە بۆ لێکدانەوەی ئەو، کە هەموو ئەو بۆچوونانەی کە دەربارەی پێناسەی کەسی هەنو لە لۆکەوە دەستی پێکردوە بە هیچوپووچ لە قەڵەم بدەین. نەریتەکانی لۆک گریمانەی ئەوە دەکەن کە پێناسەی کەسی بریتیە لە پەیوەندییەکی فیزیاییو دەروونی کە لە بنیاتی هەندێک کردەی کۆمەڵایەتیدا هەیەو یارمەتی ڕاڤەکردنیان دەدات، هەوڵیشی داوە تێبگات ئەو پەیوەندییانە چین- بەڵام سەرکەوتوو نەبوە.

بۆچوونێکی باشتر ئەوەیە کە ئاراستەی ڕاڤەکردنەکە وەرچەرخێنینو بڵێین: ئەوە کردە کۆمەڵایەتیەکانە کە لە بنیاتی پێناسەدا هەنو ڕاڤەی دەکەن، بۆئەوەی خاڵەکە بە سادەیی بخەینەڕوو دەڵێین: پێناسە بەهۆی ئەنجامدانی ستایشو لۆمەوە گریمانە ناکرێت بەڵکو دروستی دەکەن، یان ئەگەر بە هۆشیارییەکی زیاترەوە باسی بکەین، دەڵێین: ئەو هزرانەی کە هەمانە دەربارەی کەسێک کە بە تێپەڕبوونی کاتو گۆڕانکارییەکان، بەردەوامییان دەبێت، کاری زنجیرەیەکی فراوانی ڕەفتارە ئاکاریو یاساییو بیرۆکراسیو کۆمەڵایەتیو ڕامیارییەکانە. من لاموایە کە ناسینەوەی ئەنجامەکانی پێناسە بۆ زۆربەی ئەم بەندانە (Items) کارێکی زەحمەت نیە (بۆ نموونە حیزبە سیاسیەکان، سەیارەکان، توێژینەوە زانستیەکان، کارە هونەرییەکان) هەموو لە لایەن نەریتە کۆمەڵایەتیو بیرۆکراتیو زانستیو یاساییەکانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێن، ئەنجامدانی پێناسەی کەسەکانیش بەهەمان شێوەیە، جیاوازی گرنگ لە نێوان کەسەکانو شتەکان لەوەدایە کە، کاتێک دەخرێنە ناو بازنەی هەندێک شێوازی ڕەفتارەوەو هۆشداری پێناسەی خۆمانو ئەوانی دیکە دەبین، ئەم بەئاگابوونە لەخۆو لەوانەی دیکە وەکو ئەنجامێک تاقی ناکرێتەوە، بەڵکو وەکو مەرجێک بۆ زنجیرەیەک تووشبوونو کارلێکردن، لەبەرئەوەی ئەم لەخۆ ئاگابوونە ئەو خاڵە دەستنیشان دەکات کە لەوێوە ئاگاداری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بووبن، زۆر لامان قورسە کە تەنها بەرهەمی ئەو پەیوەندییانە بناسین، بەڵام مەسەلەکە ڕێک هەر وایە. تێگەیشتنی پێناسە بریتی نیە لە دۆزینەوەی گەوهەرێکی بەردەوام (continuing essence)، بەڵکو بریتیە لە تێگەیشتنی ئەو کردە کۆمەڵایەتیە جیاوازانەی کە دروستی دەکەنو ڕایدەگرن. هەندێک لەمانە لەوانەی دیکە، بناغەیی ترن. بەو واتایەی کە ئێمە ناتوانین بیر لە کۆمەڵگایەک بکەینەوە کە تیایدا نەپارێزرابین - هەرچەند هەندێک باوەڕی ئایینی دەربارەی گەڕانەوەی گیان (Reicarnation)و بەرجەستەبوونی گیان لە لەشێکی دیکەدا (trans migration)و گۆڕینی بنچینەیی هەندێک هۆمان دەدەنێ کە زۆر دڵنیا نەبین لەوەی کە بیری لە دایکبوونەوە تا مردن لە کاکڵی هەموو ڕاڤەکردنماندایە. لە لایەکی دیکەوە، دەشێت پێناسەی دیکە هەبێت کە بەسترابێتەوە بە چەند ئەگەرێکی کۆمەڵایەتیەوە، چونکە لە چەند بونیادو کردەیەکی کۆمەڵایەتیەوە سەرچاوە دەگرن کە هیچ داخوازییەکی گەردوونێتیان (universality) نیە، یا وەکو شتێکی گەردوونیش ئەزموون بکرێن. بەپێی ئەم ڕاڤەکردنە دەست بە تێگەیشتنی ئەوە دەکەین کە چۆن پێناسەکان دەشێت کۆ (Plurd) بنو لە پێشبڕکێدا بنو دژ بەیەک بن. تاکەکان لەنێو

کردەی کۆمەڵایەتی جیاوازدا پێکدێن- ئەم کردانەش لەوانەیە تەواوکەری یەکتر بن، یان دژ بەیەك بن، یان تەنها جیاواز بن، ئێمە لێرەدا نابێت تەنها بیر لەوە بکەینەوە کە ئایا واتای چیە کە کەس بین (کە وەکو هیگل تێبینی کرد، چەمکێکی یاساییە) بەڵکو دەبێت بیر لەوە بکەینەوە کە پیاو بیت یان ژن، مێرد یان ژن، باوك یان دایك، کرێکار یان هاوڵاتی، باجدەرێك یان کرێکارێك بیت چی دەگەیەنێت، یاخود چی دەگەیەنێت کە ئینگلیز یان فەرەنسی یان ئوسترالی بیت.

ئەو چەمکەی پێناسە کە پەیوەندی بە بیری پێناسەوە هەیە لە لۆكەوە نەهاتوە، بەڵکو لەو بۆچوونە ئەڵتەرنەتیڤەوەیە کە نەخشەکەیم کێشا، ئەگەر پێویستی بە پێشینەی فەلسەفی کرد ئەوا، بێگومان دەتوانین لە هیگڵو نیچەو مارکسدا بیدۆزینەوە، بەڵام بە مەزەنەی من -ئەگەر باش بێت یان خراپ- بە زۆری بەبێ هیچ یارمەتییەکی فەلسەفی گەشەی کردوەو تەنها لێکچوونێکی زارەکی هەیە لەگەڵ ئەو راڤەکردنەی لۆك *loke* کە ری *Ree* پێشکەشیکردوە، راستە کە پێناسەکان لە هەستی تاکەکاندا هەیە، هەروەها واتایەك هەیە لەوەی کە ئەم پێناسانە چەند هەبوونێکی (*entities*) نیازکراون (*inlentional*)، بەڵام ئەوەندە بچووك ناکرێنەوە کە ببنە هەستی تاکەکەسیو ئەو نیازخوازییەی کە تێی کەوتوە، نیازخوازییەکی کۆمەڵایەتیە نەك تاکەکەسی. لەم روەوە، پێناسەکان جیاواز نین لە زنجیرەیەك دیاردەی دیکە کە کۆمەڵگا دایمەزراندوونو یاسای بۆ داناون. ئێمە تەنها کاتێك لە دامەزراوەکانی وەکو دادگاو بانكو دەسەڵاتو پارە، بێجگە لە نەتەوەو خوداکان، تێدەگەین کە لە زاراوەی چوارچێوەی باوەڕە هاوبەشەکانو نەریتەکانەوە هاتبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ئەم دیاردانە قووڵییەکی زۆرو ئاڵۆزیو لێڵیان تێدایە، هەروەها پێناسەش. بوونی پێناسە پشت بەوە دەبەستێت کە دەیڵێین یان بیری لێدەکەینەوە، بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نیە کە پێناسە ئەو شتەیە کە دەیڵێین یان بیری لێدەکەینەوە، بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نیە کە پێناسە ئەو شتەیە کە دەیڵێین یان بیری لێدەکەینەوە.

پێناسەی نەتەوەیی لە دنیای مۆدێرندا گرنگییەکی تایبەتیی هەبوە، لەوەی کە لە پێناسە گرنگەکانی دیکە لە پێشترە. کەسەکان داوایان لێکرابوو کە قوربانی بە خێزانو سامان تەنانەت گیانی خۆشیان بدەن لە پێناوی نەتەوەدا - زۆرجاریش هەر وایان کردوە. وا دانرابوو کە داواکاریەکانی نەتەوە زاڵ بێت بەسەر داخوازییە رۆژانەییەکانی ئاکارو ئایندا. پێناسەی وا دەبینرا کە شتێکە کەس ناتوانێت لێی دەرباز بێت، چونکە پشتگوێ خستنی بانگەوازەکانی، بە خیانەت دەژمێررا، تەنانەت ئەگەر هیچ پابەندبوونێکی دیاریکراویش لە ئارادا نەبووبێت، لەبەرئەوە جۆرە گرنگییەك هەیە کە ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانە بدۆزینەوە کە ئەم جۆرە پێناسەیان هێنایە کایەوەو چەسپاندیان. لێرەوە دەتوانین دەست بە بینینی ئەو پەیوەندییە بکەین کە لە نێوان پێناسەی نەتەوەیی وەکو شێوەیەك لە پێناسەی -خودو ئەو واتایەی کە تیایدا پێناسەی نەتەوەیی ئەو سەرچاوانە دەستنیشان دەکات کە تایبەتن بە نەوەیەکی دیارکراو. پەیدابوونی نەتەوە پەرستی *nationalism* پێویستی بەوە دەکرد کە هەوڵبدرێت بۆ داهێنانی کەلەپوورێکی فەرهەنگی یەکتا بۆ هەر نەتەوەیەك کە ئیدعای نەتەوە دەکات- کە لە مێژووی نەتەوەییو ئەدەبو دیمەنەکانی وڵاتو شێوازی ژیان، هتد

پێکهاتبێت. لەو شوێنانەی کە ئەم هەوڵە تیایدا سەرکەوتوو دەبێت ئەم نوێنەرانە representatives لە سیستەمی فێرکردن و نەریتە رامیاری و کۆمەڵایەتییەکان و دامەزراوە فەرهەنگییەکان و میدیاو شێوەکانی پەیوەندیدا بەرجەستە دەکرێن، کە هەموویان کلیلی سەرەکین لەو پرۆسەیەی کە بەهۆیەوە پێناسەی نەتەوەیی بەدەست دەهێنرێت و دەچەسپێت، تاکە کەسەکان کاتێك هوشیاری ئەوە دەبن کە پێناسەیەکی نەتەوەییان هەیە کە دەستگیری زمانێك و پەروەردەیەك و چەند سەرچاوەیەکی فەرهەنگی بن کە بۆ مانەوەیان لە دنیای ئێستا پێویستن. بەمجۆرە، نەتەوە بریتییە لە پێکهاتەیەك کە لە ئاگایی هەر تاکە کەسێك لەخۆی و لە ئاگایی ئەوانی دیکەدا هەیە. فەرهەنگێکی نەتەوەیی دیاریکراو شانۆیەك لەم نوێنەرانە دەستبەر دەکات، ئەوانیش دەمە دەرەکییەکانی ناسین external mome:.'s of relogintion دەستەبەر دەکەن کە تیایدا هەر تاکێك (نێر یان مێ) دەستەبەری لەخۆئاگابوون دەکات. قایلنەبوونی ڕێ Ree بە چەمکی پێناسەی نەتەوەیی لەسەر بناغەی ئەو گومانەیە کە هەیەتی، کە ئەگەر ئەم چەمکە بکاربهێنین دەبینە بارمتەی ئەو هێزە ڕەشانەی کە نەتەوەپەرستی نوێنەرایەتی دەکات. ئەو لای وایە کە چەمکەکە هەوڵدەدات لە ڕێی تیۆرییەوە بەو کارە هەستێت کە نەتەوە پەرستی بە کردەوە دەیکات: ئەویش، لابردنی ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان پێناسەی تاکەکەسی و پێناسەی تێکڕایی Collectiveدا هەیە (ل9). چەمکی نەتەوەیی nationhood دەگێڕێتەوە بۆ هیگڵ کە *"بریتییە لە ڕێبازێك بۆ کردنەوەی ئەو بەربەستە مزرییە ئاساییانەی کە لە نێوان هەست و ئەزموون و لە نێوان ژیارە کەسییەکان و مرۆڤایەتیی گەردوونیدا هەن"* (ل9).

بێگومان ڕێ Ree هەقێتی کە هوشیار بێت لەو شێوازەی کە بزووتنەوە ناسیونالیستەکان داخوازییەکانی تاکەکانیان پووچەڵ دەکردەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە دەبێت ئەو شێوازانە پشتگوێ بخەین کە تیایاندا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ئەو ڕێگەیە دەگرن کە خەڵك گەیشتوونەتی بۆ بیرکردنەوە لە خۆیان. تەنانەت لیبراڵەکانیش گەیشتوونەتە ئەوەی دان بەوەدا بنێن کە ئیتر پێویست ناکات سوور بین لەسەر بوونی تاکی پێش کۆمەڵگا Pre- social بۆ بەرگریکردن لە تاکی ڕێك دژ بە کۆمەڵگا. لەگەڵ ئەوەشدا *(ڕێ)* لای وایە هەر کە زاراوەی *پێناسەی نەتەوەیی*مان بەکارهێنا ئیتر دەستبەرداری تاك دەبین لە بەرامبەر داخوازییەکانی نەتەوەدا. بە پێچەوانەوە، ئەوەی ئێمە کردوومانە ئەوەیە کە سەرەتایەکمان داناوە بۆ ئەرکی تێگەیشتنی ئەوەی بۆچی ئەو هەموو تاکانە ئارەزوومەندانە خۆیان لە پێناوی نەتەوەکەیاندا بەخت کردوە. چ جۆرە هەڵوێستێك بەرامبەر ئەم جۆرە پێناسەیە وەردەگرین، ئەوە پرسیارێکی دیکەی تەواو جیاوازە.

## ئایا نەتەوە سامانێکی فەرهەنگییە؟

ڕێ Ree هیچ گومانێك لای خوێنەرەکانی ناهێڵێتەوە دەربارەی هەڵوێستی خۆی لە بەرامبەر نەتەوایەتیدا: ئەو خۆی بە یەکێك لەوانە دادەنێت کە قینی لە *بیری نەتەوەیی*یە (ل11). زەمینەی هەندێك لە قینەکانی، تا رادەیەك، هۆی گونجاوی هەیە. دەمێکە دەزانین کە نەتەوایەتی زیندەوەرێکە دەوڵەت دروستیکردوە، لەبەر ئەوەش بوو کە بەکارهێنانی زەبرو چەوساندنەوەی زۆردارانە بە ڕەوا دەزانی و ڕۆڵی بینیوە لە لەشکرسازی و کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزمدا. هەروەها، هانی هەڵگیرساندنی کێشەی خوێناوی و چارەسەرنەکراوی دەدا لە هەندێك دەڤەردا

کە بوو نەتەوە یان زیاتر لە دانیشتوانەکەی داخوازییان لەسەر هەبوو. تەنانەت لە شێوە میهرەبانەکەیشیدا، نەتەوایەتی دەبوە کۆسپ لە رێی گەشەکردنی بە ئەندامبوون لەو جۆرە دەڤەرانەوەو گرێدانی خەڵك پێکەوە، بە تایبەتی لەو دەڤەرانەی کە سنووری دەوڵەتەکان دەبڕن. ئەوەندەی کە ئەمە بە فەرمانی سروشتیی شتەکان دابنرێت، نەتەوایەتی مشتومڕی زۆری بەرپاکرد هەم لەسەرو هەم لە بەرامبەر ئەو سیاسەتانەی کە بەناوی ئەوەوە بەڕێوە دەبران. نەتەوایەتی هێشتا لایەنی دیکەشی هەیە: خۆبەختکردن، خۆشەویستی، قارەمانێتی، هاوکاری. نەتەوایەتی هەر بە تەنها خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئیمپرالیزمی نەکرد، بەڵکو خزمەتی شێوازەکانی دیکەشی کرد کە تیایدا تێکۆشان دژی ئیمپریالیزم بە شێوەیەکی کاریگەر ئەنجام درا هەرچەند کە زۆر کەرەت لەلایەن چینە دەسەڵاتدارەکانەوە سوودی لێوەردەگیرا بۆ خنکاندنی یان لە پەراوێزدانانی نەیارەکانیان، هەروەها پشتگیریەکی رەوانبێژیی بەهێزی دابینکرد بۆ مەسەلەکانی تەندروستی نەتەوەیی‌و بەرژەوەندیی نەتەوەیی‌و بەرنامەکانی فێرکردن.

ئێرە شوێنی ئەوە نیە کە لایەنە *باشەکانی* نەتەوایەتی بژمێرین‌و لە بەرامبەر *خراپەکاندا* رایانبگرین، لەوانەیە هەردووکیان جودانەکراو بن. پەرێشانی من لەوەدایە ئایا ئێمە لە ئاستێکی دیاریکراوی وەهادایین کە بتوانین ئەو خەمڵاندنە *assessment* ئەنجام بدەین. باش بێت یان خراپ، نەتەوایەتی، لە درێژایی ئەم چەند ساڵەی دواییەدا، توانیویەتی سەرچاوەی زۆری فەرهەنگی‌و ئاکاری کە بۆ ئەم خەمڵاندنە پێویستن بۆ خۆی دابینبکات. بێگومان، ئاستی ئاکاری دیکەش بە شێوەی گوزارەیی *abstractly* هەن، وەکو ئەو گوتارە گەردوونیەی کە فەیلەسووفەکان پێی ئاشنان، یان پەنابردن بۆ کۆمەڵگا ناوچەییەکان‌و بۆ شتە باستانیەکان لەم ساڵانەی دواییدا لە ناوەندەکانی چەپەکاندا (کە لەوە دەچێت رێ حەزی لە پەیوەندیکردن پێیانەوە هەبێ) دەستی بە دەرکەوتن کردوە، بەڵام روون نیە کە ئەمانە ئامادەبوونێکی کۆمەڵایەتی یان فەرهەنگی وایان هەبێت کە بتوانن لە بەرامبەر داخوازییەکانی نەتەوەدا بوەستن، ئەمە بە تەنها مەسەلەی پشتگیری باو *Papular* نیە، بەڵکو هەبوونی کایەیەکی واتای هاوبەش لە چەند زاراوەیەکدا بشێت تیایدا چەندو چوون *debate* بکرێت. گوتاری نەتەوە قوڵایی‌و ئاڵۆزییەکی تایبەتی هەیە. لە شێوازێکی چەسپاوو سنوورداردا نیەو هەمیشە کراوەیە بۆ راڤەکردن‌و گۆڕان. هەروەها، بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی سەر بە لایەنی پاشکەوتن نیە ئەوەندەی کە نەتەوە خۆی وەکو کۆمەڵگایەك پێناسە بکات کە لە هەموو خەڵك پێکهاتبێت کە پێکەوە لە ناوچەیەکدا دەژین، ئەوانەی کە بە زمانی ناسیونالیزم دەدوێن دەبێت پابەند بن بە هەندێك بیری تێکەڵبوون‌و پێکهاتنی گشتی. ئەم پابەندبوونە زۆرکەرەت ناشیرین دەکرێت، بەڵام شتێکە کە سیاسەتی فەرهەنگی چەپڕەو دەتوانێت سوودی لێوەربگرێت. من پێموایە کە نەتەوە نوێنەرایەتی سامانێکی فەرهەنگی دەکات کە دەبێت سوودی لێوەربگرین، نەك هەر وا بە سووکی بیگوێزینەوە بۆ کەسانی دیکە. من ئەم پێشنیازانە بۆ هۆی تاکێتی ناکەم "وەکو پێشنیازی ئەو لێنینیستە وشکانەی کە دەیانگوت دەبێت چەپەکان سوود لە دیموکراسیە لیبرالییەکان وەربگرن تا ئەو کاتەی کە پێویستیان پێ نامێنێت". ناسیونالیزم سەرچاوەی ئاکاریی وەهامان بۆ دەستەبەر دەکات کە لە هەموو هەڵوێستێکی ئاکاریی خوازراودا جێی دەبێتەوە. با نموونەیەکی ئەم دواییەتان بۆ روونبکەمەوە. چەند ساڵێك لەمەبەر مشتومڕێکی زۆر لە نێوان یورگن

هابرماس و ژمارەیەك لە مێژوونووسە ئەڵمانەکان هەبوە دەربارەی بایەخی قڕکردنی جوولەکەکان لە مێژووی نەتەوەیی ئەڵمانیادا. لایەنێکی مشتومڕەکە، کە لە دەوری ئێرنست نۆڵت و مێژوونووسە پارێزگارەکانی دیکەدا کۆببوونەوە، لەو باوەڕەدا بوون کە ئەڵمانەکان دەبێت خۆیان هەر نەبێت لە هەندێك لە تاوانەکانی قڕکردن پاك بکەنەوەو داوای بەردەوامی پێدانی پێناسەی ئەڵمانی بکەن.

هەنگاوێکی ئەم مشتومڕە پێویستی بە بەراورد کردنی ڕێژەی قڕکردنەکە بوو بە بەراوردکردن لەگەڵ چەند کارەساتێکی دیکەی سەدەی بیستەم (بۆ نموونە پاکتاوکردنەکانی ستالین و هێرشەکانی بۆ سەر کۆلاکەکان و قەلاچۆکردنەکانی پۆل پۆت و جینۆسایدکردنی ئەرمەنەکان لەلایەن تورکەکانەوە). وەڵامەکەی هابرماس بەگشتی پەسەند کراو بوو، ریسواکردنێکی کاریگەر بوو بۆ ئەو نیشانە سیاسییانەی کە لەم هەنگاوانەداو لە هەزرە جیاوازەکانی مێژووی ئەڵمانیادا هەن. هەرچۆنێك بێت، جۆرە گرژییەك لە هەڵوێستی هابرماسدا هەبوو. ئەو خۆی جۆرە وابەستیەکی ئاشکرای یونیڤێرسالی[2] تێدا هەبوو. هابرماس لای وابوو کە پەیوەندیی گونجاو لە نێوان هاوڵاتی و دەوڵەتدا، دەبێت بریتی بێت لە نیشتمانپەروەریەکی دەستووری. ئەو دڵسۆزییە هۆشیارەی کە هەموو کەسێك هەیەتی بەرامبەر ئەو حکومەتەی کە لەسەر دەستورێکی راست دامەزراوە. پێناسەی گونجاویش بۆ تاکە کەس، ئەوە نیە کە نەتەوە پێی بەخشیوە، بەڵکو ئەو پێناسە باش نەریت *Post- Conventional*ەیە کە هۆکارێکی عەقڵانی نیوکانتی پێگەیشتووی هەیە، هابرماس سوور بوو لەسەر ئەوەی کە قڕکردن پەیوەندییەکی گرنگی بە ئەڵمانەکانەوە هەیە (هەر لەبەر ئەوەی کە ئەڵمانن) هەروەکو لە برگەیەکدا دەڵێت کە شایانی دووبارە کردنەوەیە:

*"ڕاستییەکی سادە هەیە ئەویش ئەوەیە کە نەوەکانی دواییش لە هەمان ئەو شێوە ژیانەدا گەورە بوون کە ((ئەو شتە)) دەشیا تیایدا روویدات. ژیانی خۆشمان بەستراوەتەوە بە دەقی ئەو ژیانەی کە تیایدا ((ئۆشویتز Auschwitz)) دەشیا رووبدات، نەك بە هۆی ئەو بارودۆخانەی کە هەڵکەوتن، بەڵکو لەبەر هۆی خودی intrinscally. شێوازی ژیانمان پەیوەندیدارە بەوەی کە باوك و باپیرانمان لە ڕێگەی تۆڕێکی نەریتی باستانیی خێزانی و ناوچەیی و رۆشنبیرییەوە، کە داماڵینی کارێکی زۆر ئەستەمە، ئەویش بەهۆی ئەو دەوروبەرە مێژووییەی کە بەم شێوەیەی ئێستا دروستیکردووین، کەسمان لەم دەوروبەرە رزگارمان نابێت، چونکە پێناسەکان، چ وەکو تاك و چ وەکو ئەڵمانی بە بەردەوامی تێکهەڵکێشی یەکتر دەبن. ئەمەش بگرە هەر لە رووی لاسایی و ئیشارەتە فیزیاییەکانەوە راستە تا دەگاتە زمان و دەچێتە ناو ئەو لقە زۆر باریکانەی کە هەڵوێستی رۆشنبیریمان پێکدەهێنن. وەکو ئەوەی، کاتێك کە لە زانکۆکانی دەرەوەی ئەڵمانیا وانە بڵێمەوە، بتوانم واز لەو عەقڵییەتە بهێنم کە شێوازی نەقشی داینامیکیەتی عەقڵیەتێکی زۆر ئەڵمانیی، لە کانتەوە بۆ مارکس و ماکس ڤیبەری بەسەرەوەیە. کەواتە با پشتگیریی نەریتە باستانیەکانمان بکەین ئەگەر نەمانەوێت نکوڵی لە خۆمان بکەین"*.

لەم دیدەوە، مەسەلەی ئەوەی کە ئایا لە رووی چەندێتییەوە، هیتلەر زیاتر یان کەمتر جوولەکەو قەرەجی کوشتوە لەو جوتیارانەی کە ستالین کوشتوونی، یان ئەگەر لە زاراوەی ڕێژەی سەدی هاووڵاتییە قەلاچۆکراوەکانەوە بروانین، *پۆل پۆت* لە تۆماری جینۆسایدا لە سەرەوەیە. بەلای ئەڵمانەکانەوە پەیوەندیی بە بابەتەکەوە نیە. هیتلەرو نازیزم و قڕکردن سێ هەڵکەوتن لە مێژووی ئەڵمانیادا، لەبەرئەوە ئەڵمانە هاوچەرخەکان

بەرپرسیارییەکی تایبەتییان هەیە، ئەویش کۆتایی هێنانی ئەم مەسەلەیەیە. ئەوەی لە لایەنی ئاکارییەوە قێزەوەند بوو، لەو هەوڵەی کە هەندێك مێژوونووسی ئەڵمانی دەیاندا بۆ بەرێژەیی کردنی قڕکردنەکە، بە تەنها لەبەر ئەو بەرنامە رامیارییە نەبوو کە لە پشتەوەی هەوڵەکەدا بوو، نە لەو سەرنەکەوتنەشیان بوو لە رەفتارکردن بە پێی ئەو بەڵێنانەی کە ئەرکن لەسەر هەموو ئەو ئەڵمانیانەی کە لە پاش سەردەمی نازییەت ژیاون، کە بریتییە لە یادکردنەوەی هەموو ئەوانەی کە کوژران و یادکردنەوەی هۆی مردنەکانیان. ئەمە جۆرێك بوو لە پاکانە کردن لە هەموو جۆرە بەشدارییەك لەو کردەوە تۆقێنەرانەی رابوردوو کە هەموو ئەڵمانییەکی هاوچەرخ دەبوو بیکات. رێك بەهەمان شێوە، ئینگلیزەکان بەرپرسیاری تایبەتیان هەیە بەرامبەر ئیرلەنداو ئوستralیە سپی پێستەکان هەیانە بەرامبەر ئەو شالاوی کوشتارو ماڵ و موڵك داگیرکردنانەی کە لە دژی دانیشتوانە رەسەنەکان ئەنجامیان دەدا،...هتد. ئەمە مەسەلەی ئەوە نییە کە ئایا تاکەکەسانی ئێستا سوودیان لەو کردارانەی کە هاووڵاتیەکانیان لە رابردوودا پێی هەستاون وەرگرتووە یان نا. لە حاڵەتی ئەڵمانیادا ئەمە زۆر نەشیاوە. مەسەلەکە لەوەدایە کە ئێمە، لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگایەکی تایبەتدا دەژین و پێناسەیەکی تایبەتیمان وەرگرتووە، خۆمان بە میراتگری فەرهەنگێکی تایبەتی و چەند لێپرسراوییەکی مێژوویی دەبینین -ئایا ئەمانە خۆمان هەڵمان بژاردبن یان نا.

مەسەلەکە لەوەدایە کە ئێمە تەنها لەنێو گوتاری پێناسەی نەتەوەییدا دەتوانین ئەم خاڵانە بخەینەڕوو: زۆر لاشمان روون نیە کە ئایا ئەمە لەگەڵ هەڵوێستی رەسمی هابرماس دەگونجێت، کە بریتییە لە پابەندبوون بە رێبازەکان و ئاکاری ((رزگاربوون universalistic یان نا. لە راستیشدا مشتومڕ هەیە لەسەر ئەوەی ئایا کەسێك کە پێناسەی ئاکاریی *پاش نەریتی* وەرگرتبێت، کە لای هابرماس پەسەندە، بیر لە پێناسەی نەتەوەیی بکاتەوەو بە نیشانەی پێنەگەیشتنی (خامی) ئاکارو لە دەستدانی خودموختاریی دانەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا، وەکو هابرماس بۆی دەرکەوت، شتێکی رووکەشی هەیە کە شایانی لۆمەکردنە لەو هەوڵانەی کە ئەڵمانییەکی هاوچەرخ (یان ئینگلیزێك یان ئوسترالیەك) دەیدات بۆ خۆدزینەوە لەهەر بەرپرسارییەك لەو هەڵکەوتانەی کە لە رابوردووی نەتەوەیەکدا روویاندابێت.

من لێرەدا بە تەنها نەخشەیەکی هەنگاوە سەرەتاییەکانی ئەو شتەم کێشاوە کە دەبێتە مایەی چەندوچوونێکی ئاڵۆز. ئەو خاڵەی کە دەمەوێت باسی بکەم ئەوەیە کە گوتارێکی ئاکاری هەیە کە پەیوەندیی بە ناسیونالیزمەوە هەیەو ئێمەش، بمانەوێت یان نەمانەوێت لەم گوتارەدا بەشدارین، لەوەش زیاتر، بە لایەنی کەمەوە، هەندێك لەو سەرچاوانەی کە پێویستمانە لە مشتومڕە سیاسییەکان و مشتومڕەکانی دیکەدا، ئەو پێناسەیە دەماندات. ئەو پێناسەیە تاك دەخاتە ناوەڕۆکێکی کۆمەڵایەتی گەورەترەوەو بەرپرسیارێتی وای دەخاتە پاڵ کە بواری خودو خێزان و هاوڕێکان تێدەپەڕێنێت و وا پیشاندەدات کە بەرژەوەندیی تاك بەستراوەتەوە بە بەرژەوەندیی کۆمەڵی گەورەترەوە.

کە دەچینە سەر زەویی نەتەوەوە، ئیتر پابەند نابین بە قبوولکردنی ناساندنە سەپاوەکانی نەتەوەوە، بەڵکو بە مێژووی ئەو سەرکەوتن و سەروەرییانە کە هەمووومان لە قوتابخانە خوێندوومانە. هەر مشتومڕێکی ئاکاری نابێت بە تەنها سوودوەرگرتن بێت لەو سەرچاوانەی کە لە بەردەستماندایە، بەڵکو دەبێت سەرنجیشمان لە بارەیانەوە هەبێت بۆئەوەی ئاگاداری سنووردارییەکانی و تواناییەکانیشی ببین، دەبێت بە

تایبەتی ئامادە بین بۆ بەرگرتن لە هەندێك داخراوەیی کە سیفەتێکی زۆر بەهێزی ژمارەیەکی زۆری بیرە ناسیونالیزمەکان بوە. ئەگەر پێناسەی نەتەوەیی گریمانەی فەرهەنگێکی هاوبەش بکات، کەواتە دەبێت بیرێکی شموولیو بلورالیستی بێتو نە بەرهەمو نە مالی گرووپێکی سەرپشك کراو نەبێت. دەبێت وەکو دابو نەریتێك سەیر بکرێت کە کراوە بێت لە بەردەم پێشکەوتنو گۆڕانو بە پیتکردنی جۆراوجۆر. ئەگەر نەتەوایەتی پێوانە بێت بۆ هاوولاتێتی، کەواتە وەرگرتنی ئەو نەتەوایەتیە دەبێت لەبەر دەستی هەرکەسێکدا بێت کە دەیەوێت وەریبگرێت، بێگومان نابێت سنووردار بکرێت لەسەر بناغەی رەگەزی یان نەژادی. نەتەوەکان دەبێت وا سەیر بکرێن کە لە تەنیشت یەکتردا دەژینو فەرهەنگو مێژووی جیاوازیان هەیەو کەسیش بۆی نیە هیچ داخوازییەکی دەربارەی بالاتربوونەوە هەبێت، بێگومان، سنووردارێی گرنگی هەیە، داخوازیی نەتەوەیەك بۆ ئەوەی تاکە دەسەلات بێت لەناوچەکەیداو سەرداریی سیاسی هەبێت زۆرجار بە شێوەیەکی تراژیدی لەگەل راستییەکانی تێکەلبوونی نەژادیو فەرهەنگی لە هەندێك ناوچەدا ناسازێت. دەبێت سنوور هەبێت بۆ ئەو مەودایەی کە تەنانەت پێناسە نەتەوایەتیە نەرمو میهرەبانیەکانیش دەشێت بگوڕرێن. نەژادو شێوەکانی دیکەی جیاوازبوون لەوانەیە بە شێوەیەك بن کە لە بەرامبەر لەناوگرتن (احتواء) لە چوارچێوەی فەرهەنگێکی گشتیدا بوەستن، هەرچەند فەرهەنگەکە پلورالیستی (هەمەچەشن)و ئارام بێت.

لەوانەیە سیاسەتی فرە فەرهەنگی رێگەی داهاتوو بێت، ئەمەش بە واتای کۆیی ناسیونالیزمە بەو شێوەیەی کە دەیزانین. دەولەتانیش پێویستیان بەوە هەیە کە بنچینەیەکی نوێ بۆ رەوایی یاسایی بدۆزنەوەو کۆمەلگاکانیش بنچینەی نوێ بۆ یەکگرتنی کۆمەلایەتی بدۆزنەوە. ئەمانە ئەرکی بچووک نینو گومانیش لەوەدا هەیە کە ئایا لایەنگرانی فرە فەرهەنگی تا ئێستا رووبەڕوویان بوونەتەوە.

بێگومان هەندێك رێباز لە جیهانی سەرمایەداریی پێشکەوتوەکاندا هەن. پێشنیازی ئەوە دەکەن ئێمە لەوانەیە بەرەو قۆناغی پاش نەتەوە Post nationalist برۆین، بەلام هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەو قۆناغە. هەر نەبێت بۆ ئەم ماوەیە، دەولەتی نەتەوەیی راستییەکی سیاسیەو پێناسەی نەتەوەییش یەکێك لە گرنگترین دیدەکانمان دەداتێ کە لەبەردەستماندا بێت. ئەم دیدە لەبەردەستماندایە بۆ ئەوەی بە شێوەی رەخنەگرانەو بە تێڕامان بەکاری بهێنین. توورهەلدانی بەتەواوەتی مەترسی خۆشاردنەوە لە هەموو جۆرە گفتوگۆیەکی لێدەکەوێتەوە.

## پەراوێزەکان

*1*-بازنەیەتی (لە لوجیکدا ناڕاستە چونکە گوتەیەك یەکاردەهێنێت بۆ سەلماندنی شتێك کە پاشان بۆ سەلماندنی گوتەکە بەکاردێت). *Encyclo pecki Dictionary*

*2*- *Univeralist* باوەڕێکی (ئاینییە) کە لایوایە هەموو کەسێك لە ئاکامدا رزگار دەبێت *Eneylopedhc Dictionary*.

## سەرچاوە

*On National Identity, by Ross Poole, Radical Philosphy (62), Autumn 1992*

سەردەم

# ڕەخنەو تۆژینەوەی ئەدەبی

- پێنج نووسین لە بارەی ئەخلاقەوە — ئۆمبێرتۆ ئیکۆ
- سایکۆلۆژیای هونەر — دێنی هویسمان
- چۆن بووم بە شاعیر — مارگرێت ئاتوود



# پێنج نووسین لە بارەی ئەخلاقەوە..


■ ئۆمبێرتۆ ئیکۆ

● لە ئیتالییەوە: یاسین فەقێ سەعید


## پێشەکیی نووسەر

ئەم وتارانەی لێرەدا کۆکراونەتەوە، دوو خەسڵەتی هاوبەشیان هەیە.

**یەکەم:** هەموویان بۆ بەشداری کۆنفرانس یان سیمینار یان بە بۆنەیەکەوە نووسراونو باس لە کێشە گشتییەکان دەکەن.

**دووەم:** هەموویان لە بابەتی *ئەخلاق* یان *زانستی ئەخلاق* دەدوێن، واتا پەیوەندییان بەو کارانەوە هەیە کە بکرێن باشە، یان کە دەبێت ئەنجام بدرێنو یان بە هیچ شێوەیەک ناتوانرێ ئەنجام بدرێن.




بەپێی ئەو خەسڵەتەی یەکەمیان، پێموایە جێی خۆیەتی ئەو بارو زروفەش روونبکەمەوە کە وتارەکانی تیا نووسراون، یان بۆ نووسراون، بۆئەوەی بە سادەو ناجدیی نەیەنە پێشچاو.

وتاری یەکەم: *بیرکردنەوە لە شەڕ*. ئەم وتارە لە ئەپریلی *1991*، لە ڕۆژانی شەڕی کەنداودا، لە گۆڤاری *La Rivista dei libri*[1] ژمارە (*1*)دا بڵاو کراوەتەوە.

وتاری دووەم: *فاشیزمی هەتاهەتایی*. بە زمانی ئینگلیزی نووسراوەو لە زنجیرە کۆڕێکی زانستی ((کۆلیژی زمانی ئیتالیو فەرەنسی)) زانکۆی ((کۆلۆمبیا Columbia))دا، لە ڕۆژی 25ی ئەپریلی 1995 خوێندمەوە، ئەو زنجیرە کۆڕە بۆ ساڵیادی ڕزگاربوونی ئەوروپا سازکرابوو. پاشان بە ناونیشانی Eternal Fascism لە گۆڤاری: The New York Review of Booksدا ڕۆژی 25 حوزەیران 1995دا

بڵاویۆتەوە، لە دواتردا ئەم وتارە وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئیتالیو لە گۆڤاری La Rivista dei libn ژمارەی مانگی تەموزو ئاب ی 1995 بە ناونیشانی Totalitarismo fuzzye Ur- Fascismo بڵاو کرایەوە (ئەو دەقەی لێرەدا دەیخوێننەوە، لەگەڵ ئەوەدا کە بڵاوکراوەتەوە، تەنها دەستکارییەکی زۆر کەمی فۆرماڵیو هەندێ ڕاستکردنەوە نەبێ، ئیتر دەقاودەق لە یەك دەچن)، بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە ئەو دەقە بۆ جەماوەرێکی خوێندکاری ئەمەریکی بیری لێکراوەتەوەو لە ڕۆژگارێکدا خوێنراوەتەوە کە سەرجەمی ئەمەریکا بەهۆی تەقینەوەکەی شاری ((ئۆکلاهۆما))وە کەوتبوە لەرزین، هەر لەو ڕۆژانەدا ئاشکرابیبوو کە لە ئەمەریکادا ڕێکخراوێکی سەربازی ڕاستڕەو هەیە. لە هەلومەرجێکی ئاوادا، ئاخاوتن لە بارەی ((بابەتی دژە فاشیزم)) گرنگیو بایەخێکی تایبەتی پەیدا دەکات، لە لایەکی ترەوە لێکدانەوەو توێژینەوە مێژووییەکە دەیویست ورە بداتە بەر لێکدانەوەو توێژینەوە هەنووکەییەکان بۆ ڕاڤەکردنی ئەو کێشەو گرفتە گشتیانەی لە چەند وڵاتێکدا هەن. ئەو زنجیرە کۆڕە، لە هەنگاوی دواتردا لەلایەن چەندین ڕۆژنامەو گۆڤارەوە وەرگێڕرانە سەر چەندین زمانو بڵاوکرانەوە. لەم بارەیەوە تەنها ئەوە ماوەکە ئاماژە بۆ لایەنی شێوەی نووسینی وتارەکە بکەم، لەبەرئەوەی وەك وتم بۆ جەماوەرێکی خوێندکاری ئەمەریکی نووسراوە، بۆیە لە هەندێ لایەندا، چەند زانیارییەك بە دوورو درێژی نووسراون کە بۆ خوێنەری ئیتالی پێویست نینو هەر لە پێناوی گەیاندنی بابەتەکەدا، ئاماژەم بە هەندێ گوتەی سەرۆکی ئەمەریکی ((ڕۆسڤێلت)) کردوە، بۆ سەلماندنی بۆچوونی دژە فاشیزمی ئەمەریکی، لە کۆتاییدا پێم داگرتوە لەسەر ئەو دیدارەی لە نێوان ئەوروپییەکانو ئەمەریکییەکان، لە ڕۆژانی ڕزگاربوونی ئەوروپادا، ساز درابوون.

وتاری سێهەم: *لە بارەی چاپەمەنییەوە*. ئەم وتارە ڕاپۆرتێکە لە میانەی زنجیرە سیمینارێکدا پێشکەشم کرد، کە *ئەنجومەنی پیران*– *سێنات*ی ئیتالی سازیکردبوو (لە قۆناغی سەرۆکایەتی کارلۆ سکۆنیامیلیۆدا)، لە کۆڕەکەدا ژمارەیەك ئەندامی سێناتو سەرنووسەری ژمارەیەك لە چاپەمەنیە هەرە دیارەکانی ئیتالیا ئامادەبوون، کە لە کۆتایی باسەکەمدا توانیان گفتوگۆیەکی دوورو درێژ لەو بارەیەوە بکەن. لە پاشاندا دەقی کۆڕەکەم، لە یەکێك لە بڵاوکراوەکانی هەمان ئەنجومەندا بەناونیشانی:

(Gli Incontri di studio a Palazzo Giustiniani. Stampa e mondo Politico oggi)(2)

لە شاری ڕۆما، چاپخانەی ئەنجومەنی پیران، ساڵی 1995دا بڵاوکرایەوە. شایانی باسە، جگە لە دیراسەکەی من، موداخەلەی ئەم بەڕێزانەش لەو کتێبەدا بڵاکراوەتەوە:

Giulio Anselmi. Eugenio Scalfaris, Carlo Scognamiglio, Walter Veltroni, Silvio Boroli, Francesco Paolo Mieli, Livio Caputo, Darko Bratinas, Salvatore Carruba

وتاری چوارهەم: *کاتێك ئەویتر دەورو ڕۆڵی خۆی دەبینێ*. ئەم نووسینە پێکهاتوە لە وەڵامەکانی من بۆ ئەو چوار نامەیەی کە کاردنیاڵ مارتینی – Mortini بۆی نووسیومو وەڵامم داوەتەوە کە لە لایەن گۆڤاری Liberalەوە سازدراو بڵاوکرایەوە. لە دواتردا ئەم پرسیارو وەڵامانە کۆکرانەوەو لە دووتوێی کتێبێکدا لە لایەن دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی Atlandite Editorialeەوە لە شاری ڕۆماو لە ساڵی 1996دا بڵاوکرایەوە بە ناونیشانی: Che Cosa Crede chi non Crede? *ئەوەی بڕوا ناکات بڕوای بەچی هەیە؟* دەقەکەی منو وەڵامی پرسیارەکانی کاردیناڵ *مارتینی*یە: ئایا ئەو کەسەی

زۆر بە سادەیی هەڵسوکەوت دەکات، دڵنیایی‌و ناچاربوونی ئەخلاقی لەسەر چ بناغەیەك دارشتوە، بۆئەوەی بگاتە دامەزراندنی زانستی ئەخلاق بە شێوەیەکی ڕەها، ئایا لەسەر پرینسیپە میتافیزیکیەکان، یان هەرچۆنێ بێت، لەسەر ئەو بەهایانە کە بۆی ماونەتەوە، یان لەسەر ئەو فەرمان‌و ناچارییە پۆلێنراوەیە کە لە هەموو گەردووندا کاری پێدەکرێ؟ بۆئەوەی خوێنەر باشتر لەم گفتوگۆیە تێبگات داواکارم بچنەوە سەر کتێبە چاپکراوەکە کە موداخەلەی ئەم بەڕێزانەش لەگەڵ دەمەتەقێکەماندا چاپکراون:

Eugenio Scalfari, Manlio Sgalambro, Emanuele Severino, Cloudio Martelli, Vittorio Foa, Indro Montanelli.

وتاری پێنجەم: هیجرەتکردن، ئارامی‌و *نائارامبوون*. ئەم نووسینە کۆلاژە. بەش یەکەمی، دووبارە کردنەوەی بەشی یەکەمی ئەو وتارەمە کە ڕۆژی *23*ی **کانونی دوەمی** *1997* لە ئامەنگی کردنەوەی کۆنفرانسی ((پێشبینییەکانی هەزارەی سێهەم)) پێشکەشم کرد کە شارەوانی شاری ((ڤەلێنچە)) سازیکردبوو. بەشی دوەم؛ وەرگێڕان‌و ئامادەکردنەوەی ئەو وتاری پێشەکیەیە کە ڕۆژانی *26*و *27*ی مارتی *1997* لە کۆنفرانسی نێو دەوڵەتی لە بارەی نائارمییەوە پێشکەشم کرد، کە ئەکادیمیای زانکۆی کولتور، لە شاری پاریس سازیکردبوو. بەشی سێهەمی وتارێك بوو کاتی خۆی بە ناونیشانێ: "*Non Chiediamoci Per chi suona la campana*- با چیتر نەپرسین زەنگەکە بۆ کێ لێدەدا" لە ڕۆژنامەی *La Repubblica*- لا ڕێپوبلیکەدا بڵاوکرایەوە، ئەمەش بە بۆنەی دادگایی کردنی *Priebke*- پریبکەوە لەلایەن دادگای سەربازیەوە لە شاری ڕۆما.

* * *

1-واتە: گۆڤارە کتێبەکان.

2-واتە: (دیدارەکانی تۆژینەوە لە کۆشکی جوستینیانی. چاپەمەنی‌و دنیای سیاسەتی ئەمڕۆ).

## *بیرکردنەوە لە شەڕ..*

ئەم وتارە باسی جەنگ دەکات، جەنگ بە مانا گەورەکەی، بە قەبارەی ئەو فۆرمەی لە جیهانی هاوچەرخدا هەیەتی، وەکو شەڕی "گەرم"و سەرجەمی ئەو شەڕو شۆڕانەی بەهۆی ڕەزامەندی ئاشکرای وڵاتانەوە بەرپا دەبن. لەبەرئەوەی لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا کە هێزی هاوپەیمانەکان چوونە ناوشاری کوێتەوە، منیش ئەم وتارەم نارد بۆ بڵاوکردنەوە، لەوانەیە کاتێك بگاتە بەردەستی خوێنەران، زۆربەی خەڵك بڕوای بە سەرکەتوویی جەنگی کەنداو هێنابێ- ئەگەر هیچ ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو نەقەومێ- چونکە توانی بگاتە ئەو مەبەست‌و ئامانجانەی لە پێناویدا هەڵگیرسا. لە حاڵەتی ئاوادا قسەکردن لەبارەی بێکەڵکی‌و نەگونجاویی جەنگەوە کەمێك نادروست دێتە بەرچاو، چونکە کەس ئامادە نابێ پرۆژەیەکی سەرکەوتوو بە بێکەڵك‌و نەگونجاو پێناسە بکات کە توانی بگاتە ئەو ئەنجامەی لێی چاوەڕوان دەکرا. سەرەڕای هەموو ئەمانە، لێکدانەوەو ڕەخنەگرتن لە جەنگ، بەبێ گوێدانە ئەو ئەنجامانەی پێی گەیشتوە، پێویستە بەردەوام بێ. بە پێچەوانەوە، دەبێ لەو حاڵەتەدا زیاتر نرخ‌و بەها پەیدا بکەن کە جەنگ بە ئاکامی سەرکەوتوو دەگات، چونکە ئەم سەرکەوتنە دەتوانێ زۆر کەس هەڵخەڵەتێنێ بەوەی کە گوایە هێشتا شەڕکردن، لە هەندی حاڵەتی تایبەتیدا، گریمانەیەکی ڕاست‌و دروستە. لە سەروو هەموو ئەمانەوە، ئەرکی هەرە پێویستی سەرشانمان، دەبێ ڕەتکردنەوەو دژایەتیکردنی شەڕ بێت.

لە سەرەتای ئەم شەڕەوە گوێبیستی چەندین ڕاوبۆچوون و بانگەواز بووین و هەندێکی دیکەشمان خوێندەوە کە سەرجەم گلەیی و گازەندەیان لە "ڕووناکبیران" دەکرد، گوایە لە بەرامبەری ئەم دراما گەورەیەدا هەڵوێستی ئاشکراو پێویستی خۆیان وەرنەگرتوە. جا لەبەرئەوەی زۆربەی زۆری ئەم دەنگدەرانە (قسەکەران)، وەك باوە، لە لایەن ڕووناکبیرانەوە پێشڕەوایەتی دەکرێن -بێگومان ڕووناکبیر مەبەستم لە مانا پیشەیی و سەندیکاییەکەیەتی- کەواتە جێی خۆیەتی بپرسین: ئەو کەمایەتییە بێدەنگە (قسەنەکەن)، کە داوای هاتنە قسەیان لێدەکرێت، کێن؟ ئاشکرایە مەبەستیان لە هەموو ئەوانەیە کە بێپەردە قسەیان نەکردوە؛ واتە بە ئاشکرا لایەنگریی لایەك لە دوو لا شەڕکەرەکەیان نەکردوە. بەڵگەشم ئەوەیە، کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، ئەگەر یەکێك بە پێچەوانەی ویستی ئەویترەوە قسەیەکی بکردایە، ئەوا یەکسەر مۆری ڕووناکبیری خیانەتکاریان دەنا بە نێو چاوانیەوەو دەمێك بە شەڕخوازێکی لایەنگری کەپیتالیست و دەمێکی دیکە بە ئاشتیخوازێکی لایەنگری عەرەب پێناسە دەکرا.

هۆیەکانی ڕاگەیاندن بەهۆی بەراوردی هەڵوێستەکانەوە لەناو ڕیزەکانی ئەو زۆرایەتیە دەنگدەدا کارێکی وایان کرد کە هەرکەسە شیاوی ئەو تۆمەت و ناوەناتۆرانە بێت کە ئەویتر دەیخستە پاڵی. لایەنگرانی هەڵگیرسانی شەڕەکە، کتومت وەك هەوادارانی کارە سەربازیەکانی قاڵبە کۆنەکان دەهاتنە بەرچاو، ئاشتیخوازەکانیش، کە هێندە بێدەسەلات بوون و نەیانتوانیبوو لە پروپاگەندەو هاش و هووشەکانی ساڵانی ڕابردوو خۆیان ڕزگار بکەن، هەموو چرکەیەك شیاوی ئەو هەڵسەنگاندنە بوون کە گوایە دەیانەوێ بەهۆی دۆڕاندنی لایەکەوە، خەڵاتی شەڕەنگێزی لاکەی تر بکەن. هەروەکو داب و نەریتی مەزهەبی ((ئێزۆرچیزم Esorcismo- واتە: دەرکردنی شەیتان لە ڕۆحی مرۆڤ)) دەبوو ئەو کەسەی لایەنگری شەڕ بوە، شەیتان لە گیانی دەرکرێت و ڕایگەیەنێ کە شەڕ چەندە خراپ و قێزەون و وەحشیەتە، هەروەها ئەوەش کە دژی شەڕ بوو دیسانەوە دەبوایە شەیتان لە گیانی دەرکرێت و بێتەوە هۆش خۆی و ڕایگەیەنێ کە (صدام) چەند خراپ و شەڕانی و وەحشیە.

لە هەرکارم لەم ڕەهەندانەدا، بە دڵنیا، ئامادەو بەشداری گفتوگۆکان بووین کە لە نێوان چەند ڕووناکبیرێکی سەنعەتکاردا ساز دەدرا، بەڵام بە دڵنیا، ئەم بەشداریکردنە بۆ ڕاپەڕاندنی وەزیفەی ڕووناکبیری نەبوو. وەك زانراوە، ڕووناکبیران توێژێکی زۆر تەموژاوین و ناڕوونن، بەڵام مەسەلەکە زۆر جیاوازە. ئەگەر بمانەوێ پێناسەی وەزیفەی ڕووناکبیری بکەین، وەزیفەی ڕووناکبیری واتە جیاکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانە لە نێو هەموو پێشبینیە پۆزەتیڤەکاندا بۆ تێگەیشتن لە خودی حەقیقەت -ئەمەش لە توانای هەموو کەسێکدایە جێبەجێی بکات، تەنانەت پەراوێزترین مرۆڤ کاتێ بیر لە بارو زروفی خۆی دەکاتەوە ئەم جیاکاریە ئەنجام دەدا، خودی ئەم مرۆڤە دەکرێت لە لایەن نووسەرێکەوە لە خشتە ببرێ ئەگەر نووسەرەکە بە سۆزو عاتیفە لە بەرامبەر ڕووداوێکدا هەڵوێستی وەرگرت و لێکدانەوەکانی بە فلتەری عەقڵدا ڕەت نەکرد.

هەر لەبەر ئەم حاڵەتە بوو کە ڤیتۆرنیۆ دەیوت: ڕووناکبیر نابێت زۆرنا بۆ شۆڕش بژەنێ. ئەمەش نەك بۆ ڕاکردن لە بەرپرسیارێتی هەڵبژاردنێك (کە ڕووناکبیریش وەك تاکێکی کۆمەڵ ئازادە لە هەڵبژاردنیدا) بەڵکو لەبەرئەوە بوە لەو ساتەوەختەدا، پێویستە هەرچی تەموژو نادیارییەك هەیە نەمێنێ و بڕەوێتەوە (ئەمەش وەزیفەی

بنچینەیی هەموو بڕیارێکی چارەنووسسازە لە ساتەوەختی دامەزراندندا)، بەلام بە پێچەوانەوە وەزیفەی ڕووناکبیر لە هەمان ساتەوەختدا ڕۆچوونە بە قولایی نادیارەکانداو دەرهاویشتنیانە بۆ بەردەمی ڕووناکی. یەکەم ئەرکی سەرشانی ڕووناکبیر ئەوەیە خودی هاوڕێی (هاوڕێگا)ی خۆی ڕەخنە بکا. ("بیرکردنەوە" مانای ئەوەیە ببیتە باڵندەیەکی قسەکەر بەوپەڕی زیندوێتیو جوڵەو چالاکییەوە). دەکرێت ڕووناکبیریش هەبن بێدەنگی هەڵبژێرن، بە تایبەتی لە ساتە نادڵنیاکانداو بۆ لەخشتەبردنی هەموو ئەوانەی گوێی لێدەگرنو بڕوایان پێیەتی، ئەمەش کاتێك ڕوودەدات کە ڕووناکبیر نایەوێ هەڵەی تر بخاتە سەر ئەو هەڵانەی بە هۆی گریمانەو ڕاڤە کردنەکانیەوە دەیکات، چونکە هەمیشەو هەردەم ڕووناکبیر دەبێت بەرژەوەندی باڵای هەموان ڕەچاو بکاتو ڕێزی لێبگرێت. ئەمەش هەڵبژاردنێکی تراژیدییە، کە لە مێژووی کۆنو نوێدا چەندین نموونەی لەبەرچاومان هەن، هەر لەم هەڵبژاردنەدا زۆر کەس بینران کە بەرەو مردن ڕۆشتوون، بە دوای مەرگا گەڕاون، دیارە ئەمەش لە ساتەکانی خەباتێکدا کە بڕوای تەواویان پێی نەبوە، چونکە هەرگیز نەیانتوانیوە جیاوازی لە نێوان وەفادارییو حەقیقەتدا بکەن. بەلام وەفاداریی خەسڵەتێکی ئەخلاقییەو حەقیقەت، خەسڵەتێکی زانستی تیۆرییە.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە وەزیفەی ڕووناکبیری لە ئەخلاق جیاکراوەتەوە، بەلکو خۆی لە خۆیدا هەڵبژاردنی مومارەسە کردنی وەزیفەی ڕووناکبیریی، هەڵبژاردنێکی ئەخلاقییە، بەهەمان شێوەی ئەو هەڵبژاردنە ئەخلاقییەی دکتۆرێکی نەشتەرگەر کاتێ بڕیاردەدا لە پێناوی ژیاندا، بکەوێتە نەشتەرکردنی گۆشتو پێستی زیندووی نەخۆشەکەی. بەلام لەو ساتەوەختەدا کە سەرقاڵی نەشتەرگەرییەکەیە، دکتۆرەکە نابێت بە هیچ شێوەیەك بکەوێتە ژێر کاریگەریی سۆزو بەزەییو عەتفەوەو نابێ بشڵەژێ، تەنانەت لەو حاڵەتەشدا نابێ تووشی ئەمانە بێت، کە دڵنیایە نەخۆشەکەی پەکی کەوتوەو کار لە کار ترازاوەو دەبێ بە هەمان گیانەوە نەشتەرگەرییەکە بدوورێتەوە. وەزیفەی ڕووناکبیری، دەکرێت هەندێ جار بگاتە ئاکامی بنبەستو پڕ بەزەییو دڵ پڕ بوون، کە هیچ کەسێکی دیکە ئامادە نیە قبوڵی بکات، چونکە پێویستە هەندێ کێشە بەو شێوەیە چارەسەر بکرێت، کە لای هەموان ئاشکرا بکرێت هیچ چارەسەرێکی نیە. ئەمەش هەڵبژاردنێکی ئەخلاقییە کە بەبێ شاردنەوە دەرئەنجامەکانی خۆت بخەیتە ڕوو -یان لێی بێدەنگ بیت- بەو هیوایەی نەبادا بەهەڵەدا چووبیت.

ئائەمە درامای ئەو کەسەیە، کە تەنانەت بۆ یەك چرکە، بڕیاردەدات ئەرکی "خزمەتگوزاریی مرۆڤایەتی" بخاتە ئەستۆی خۆی.

لە بارەی هەڵوێستی *پاپا*وە لەم شەڕە، بەوپەڕی توانجو تەنزەوە باس لە ڕاو بۆچوونەکانی کرا، تەنانەت هەندێ سەنتەری ئاینیش پلاری تێگرت، پاپا وتی نابێ شەڕ بکرێت، بۆ ئەمەش زۆر پاڕایەوە، هەروەها پێشنیارێکیشی کرد کە بە شێوەی قەرەبووکردنەوەی زەرەرو زیانەکان -کە لە چاو گەورەیی کارەساتەکەدا قەرەبووکردنەوەیەکی زۆر نزمو بێمانا بوو- ئاو بکرێ بە ئاگری ئەم جەنگەدا. بۆ پاساو هێنانەوەی ئەم هەڵوێستە، دۆستو دوژمنەکانی پاپا هەر هەموویان پێکەوە بەو شێوەیە کۆتاییان پێهێنا کە پیاوچاکێکی وەکو ئەو داماوو بەستەزمان هەوڵی داوە کارەکەی خۆی جێبەجێ بکات، لەمەش زیاتر هیچی تری نەوتوە.

ئەمە ڕاستە چونکە پاپا لە بۆچوونی خۆیەوە (کە تۆزێکی ئەوێ بۆ حەقیقەت) مومارەسەی وەزیفەی ڕووناکبیریی کردوەو ڕایگەیاندوە نابێ ئەو جەنگە هەڵگیرسێت. بەلام ئەگەر بمانەوێ پاپا لە سەدا سەد

کتێبی پیرۆزی ئینجیل جێبەجێ بکات، دەبوایە کە زللەیەکیان لەلای ڕاستت دا، لای چەپیشیان بۆ بکەرەوە. بەڵام ئەی ئەگەر یەکێك هات و ویستی بم کوژێت چی بکەم؟ "خۆت ڕزگار کە"، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا پاپا دەبوایی بڵێ: "ئەمەیان موشکیلەی خۆتە". لە دواتردا، هەر بە ڕێکەوت، مافی بەرگریکردن لەخۆ، تەنها لەو کاتەدا دێتە مەیدان کە پارسەنگی ئەو ناسکییە مرۆڤ پەروەرییە بکرێتەوە، هەر لەبەرئەمەشە کە چیدی هیچ کەسێك ئامادە نیە موماسەرەی وەزیفەی قارەمان و پاڵەوانێتی بکات، بارو زرووفەکە هێندە ئاشکراو چەسپاوە کە ئەگەر (پاپا) هەندێ قسەی تری بخستایەتە سەر هەڵوێستەکەی و ئەمەش وەك ئامارەکردنێکی پراکتیکی لەم کێشەیەدا بۆ بدرایەتە قەڵەم، ئەوە مانای ئەوەی دەگەیاند کە پاپا واز لە وەزیفەی رووناکبیری خۆی دەهێنێ و هەڵبژاردنێکی سیاسی دەکات، (ئەمەش موشکیلەی خۆیەتی).

ئەگەر ئەمانە وابن، دەبێ بڵێین توێژی ڕووناکبیران ماوەی چل و پێنج ساڵە لە بارەی کێشەی جەنگەوە بێدەنگ نەبوون و قسەی زۆریشیان کردوەو بە شێوەی ئەرکێکی ماندوونەناس و ڕادیکاڵ توانیویانە شێوەی بینینی دنیا بۆ جەنگ بگۆڕن. هەرگیز وەکو ئەمجارە خەڵکی ئاوا لە نزیکەوە هەستیان بە مەترسی و ئاڵۆزیی و نادیاریی ئەو کارەسات و گرفتانە نەکردوە کە ڕوودەدەن. جگە لە چەند شێت و بێ ئەقڵێك، هیچ کەسێکی تر کەمترین بیروبۆچوونی، تەنانەت بە ڕەش و سپیش، لەو بارەیەوە نەبوو. مەسەلەی هەڵگیرسانی جەنگیش سەرەڕای ئەو هەموو وتن و نووسینە، نیشانەی ئەوەیە کە گفتوگۆو لێکدانەوەکانی ڕووناکبیران ئەو کاریگەرییە زۆرەی نەبوە لەسەر خەڵك، واتە بەقەد باڵا پێداویستییەکان نەبوە، یان لەوانەیە نەیانتوانیبێ پانتاییەکی مێژوویی پڕبەپڕی خۆیان بدۆزنەوە.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارەساتە. جیهانی ئەمڕۆ بە دیدێکی جیاوازتر لە دیدی سەرەتای سەدەی بیستەم دەڕوانێتە جەنگ. ئەگەر ئەمڕۆ یەکێك باسی جوانی شەڕەکان بکات وەك تەنیا ڕێگایەك بۆ پاکسازیی ئەم سروشتە، ئەوا ئاشکرایە ناوی ناچێتە مێژووی ئەدەبەوە، بەڵکو دەچێتە مێژوویی نەخۆشییە ئەقڵییەکانەوە. چونکە گۆڕانێك بەسەر {جەنگ}و {تێگەیشتن لە جەنگ}دا هاتوە، یەکسانە بەو گۆڕانەی بەسەر {مافی کوشتنی بەرامبەر لە پێناوی پاراستنی شەرەف}دا هاتوە، یان ئەو گۆڕانەی بەسەر {یاسای تۆڵەکردنەوە لە تاوانبار}دا هاتوە: ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەمڕۆ هیچ کەسێك نیە ئامادە بێت لە پێناوی شەرەفدا یەکێك بکوژێ یان تۆڵە لە تاوانبارێك بکاتەوە بە هەمان تاوان کە کردوویەتی، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە جاران کۆمەڵگاکەمان ئەو کارانەیان بە {چاك} پێناسە دەکردو ئەمڕۆ هەر هەمان ئەو ماف و کارو یاسایانە بە {خراپ} هەڵدەسەنگێنێ.

ئەمانەی باسمانکردن سەرتاپا کاردانەوەیەکی ئەخلاقی و عاتفی بوون ((هەندێ جار هەمان {ئاکار} خودی یاسا قەدەغەکراوەکان ڕێگە پێدەدات و چاوپۆشی دەکات، بۆ نموونە: لە یاسای کوشتن، بە هەمان ئاست هوشیاری کۆمەڵایەتی، هەندێجار قوربانیدان و ماڵوێرانی قبوڵ دەکات لە پێناوی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی گەورەترو باڵاتر))، بەڵام بە پێچەوانەی ئەمانەوە، لە جیهانی سەردەمدا، شێوەیەکی ڕادیکاڵتر هەیە بۆ بیرکردنەوە لە جەنگ، نەك بە تەنها لە سنووری چەمکە فۆرمالییەکاندا، بەڵکو لە لێکدانەوەی هەلومەرجەکانی ئەو گریمانەیەدا، دەرئەنجام دەگەینە ئەو بڕوایەی کە ناتوانرێ چیدی جەنگ هەڵگیرسێنرێ، چونکە لە کۆمەڵگایەکدا دەژین هۆیەکانی ڕاگەیاندن و گەیاندنی هەواڵ و زانیاری چالاکانە کاردەکەن و چرکە بە چرکە

دەنگوباسەکان بڵاو دەبنەوە لە کۆمەڵگاکەماندا شەپۆلی کۆچ و هیجرەت سنووری کیشوەرەکان دەبڕێت و بەردەوامەو لە لایەکی تریشەوە تەکنەلۆژیای نوێ تا دێت بە شێوەیەکی شۆڕشگێڕانە گەشە دەکات و هەنگاو لەدوای هەنگاو، باشترو سەرکەوتوانەتر لەگەڵ سروشتدا خۆی دەگونجێنێ، هەموو ئەمانەی باسمان کردن، کارێکی وایان کردوە کە هەڵگیرساندنی جەنگ نەك زەحمەت بێت، بەڵکو مەحاڵ بێت. لە هەلومەرجێکی ئاوادا هەرچی شەڕێك هەڵبگیسرێ لە کۆتاییدا دەکەوێتە هەڵوێستی دژو پێچەوانەی ئەو مەبەست و نیازانەی لە پێناویدا هەڵدەگیرسێ.

دەبێ لە خۆمان بپرسین ئاکامی شەڕو جەنگەکان لە درێژایی سەدەکانی ڕابردوودا چی بوە؟ جەنگەکان لە پێناوی سەرکەوتندا هەڵگیرساون، بۆ مەبەستی بە دەستهێنانی کۆمەڵی بەرژەوەندی و وەرگرتنی چەند دەسکەوتێك لە لایەنی دۆڕاو بەرپا بوون. لەو جەنگانەدا بە شێوەیەك ئامانج و ئەنجامەکانمان دادەڕشت -کە بەهۆی هەڵوێست و شێوەی مامەڵەو هەڵسوکەوتی دیاریکراوەوە دەمانتوانی ئەو ئامانجانە دیاری و مسۆگەر بکەین- ئەو ئامانجانەی دامان دەڕشتن دەبوو لە ڕووی تەکنیکی و ستراتیژییەوە شیاوی ڕاپەڕاندن و جێبەجێ کردن بن و بە شێوەیەکی وا بکەونە بەرچاو کە ئامانج و مەبەستەکانی لایەنی بەرامبەر لە لایەك پوچەڵ و لە لایەکی ترەوە مەحاڵ بکەن و وایان لێبکەن قابیل بە جێبەجێکردن نەبن، بۆ گەیشتن بەم ئاکامە دەبوایە بەوپەڕی تواناوە بچینە مەیدان، دەرئەنجام لە نێوانی ئێمەو ئەوانی تردا، یارییەکە بە ئەنجام دەگەیشت. لە جەنگی جاراندا ئەو لایەنانەی هەڵوێستی بێ لایەنیان هەڵدەبژارد دەبوایە ئێمەو لایەنەکەی تر کارێکی وا بکەین ئەو بێلایەنانە زەرەرمەند نەبن {بەڵکو بە شێوەیەك لە شێوەکان دەبوایە ڕێگەیان بۆ خۆش بکەین سوودمەند بن}، چونکە ئەم ڕێگەپێدانە مەرجی سەرەکی بنچینەیی بوون بۆ ئازادیی هەڵسوکەوت و جوڵەی ئێمە. تەنانەت خودی {جەنگی ڕەها}ی {کلاوسیڤیتس- Clausewitz}یش نەیتوانی لەم هەلومەرجانە خۆی ڕزگار بکات یان پشت گوێیان بخات.

بە تەنها لە سەدەکەی ئێمەدا (واتە: سەدەی بیستەم. و) فیکرەی {شەڕی جیهانی} سەری هەڵدا، شەڕێك کەلە توانایدا بوو هەموو جیهان تێوە گلێنێ، تەنانەت توانی کاریکاتە سەر کۆمەڵگا بێ مێژووەکانی وەك کۆمەڵگای پۆلینیزیا. شانبەشانی داهێنانی وزەی ئەتۆمی، داهێنانی تەلەفزیۆن، داهێنانی فڕۆکەی بارهەڵگر، پەیدابوونی چەندین شێوەی جیاجیای کەپیتالیزمی فرەنەتەوەیی، هەندێ لە هەلومەرجی {مەحاڵ بوونی شەڕکردن} گۆڕانی زۆریان بەسەرداهات:

1-چەکی ئەتۆمی توانی هەموو لایەك بگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر جەنگێکی ئەتۆمی ڕوویدات هیچ کەسێك تیایدا براوە نابێ، بەڵکو دەرئەنجام تەنیا یەك دۆڕاو دەبێت، ئەویش ئەم ئەستێرەیەمان دەبێت (گۆی زەوی). بەڵام بەر لە ڕوودانی ئەم کارەساتە، گەر کەمێك لەم ئاستەدا بوەستین و بیر بکەینەوە کە جەنگی ئەتۆمی دژی ژینگەیە، ئەوا یەکسەر دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە هەموو شەڕێکی دژە ژینگە، بە شەڕی ئەتۆمی پێناسە بکەین، واتە هەموو جەنگێك بە کارێکی نەگونجاوی دژە ژینگە دەناسین. کەواتە ئەو کەسەی بۆمبێکی ئەتۆمی دەهاوێژێ {یان ژینگەی دەریاکان بە پاشەڕۆی پیشەسازی ژەهراوی دەکات} هەردوکیان جەنگێکی وێرانکەر ڕادەگەیەنن نەك تەنها دژی بەرژەوەندی بێلایەنەکان، بەڵکو دژی سەرتاپای ئەم گۆی زەوییە دەبن بە هەموو لایەنەکانیەوە.

2–جەنگ چیدی لە نێوان دوو لایەن یان دوو بەرەی جیاوازدا هەڵناگیرسێ. ئەو گێژاوەی ڕۆژنامەنووسە ئەمەریکییەکانی تێکەوتن لە شاری بەغدا، هیچی کەمتر نەبوو لەو گێژاوەی کە ملیۆنەها موسڵمانی لایەنگرو دۆستی عێراق تێکەوتن کە لەو وڵاتە هاوپەیمانانەدا دەژیان -دیارە بە پانتایی و قەبارەیەکی گەورەتر– لە جەنگی جاراندا. هەموو دوژمنێك، یان هەموو کەسێکی بزێوی لایەنگری لایەك لە دوولا شەڕکەرەکە، ئەگەر لەلایەن لایەکەی ترەوە بەردەست بکەوتایە زیندانی دەکرا -یان لەناودەبرا– خۆ ئەگەر لە سنووری خاکی لایەنێکدا هاو نیشتمانیەکی لایەکەی تر لە بەرژەوەندی نیشتمانەکەی خۆیدا قسەیەکی بکردایە، ئەوا دەستبەجێ زیندانی دەکراو لە کۆتایی جەنگەکەشدا لە سێدارە دەدرا، بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی پێکهاتەو سروشتی کەپیتالیزمی فرە نەتەوەییەوە، هیچ جەنگێك ناتوانرێ و ناکرێت لە نێوان دوو بەرەی جیاوازدا هەڵگیرسێ کە وڵاتێکی وەکو عێراق بە بەرهەمی پیشەسازی خۆرئاوا پرچەك بوبێت، ئەمە هەر بە ڕێکەوت ڕووی نەداوە، بەڵکو ئەم حەقیقەتە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە لەنێو لۆژیکی کەپیتالیزمی کامڵدا شتێ نیە پێی بوترێ کۆنترۆڵی تاکە تاکەی وڵاتان. لە ناوخۆی خودی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا، حوکمەت کاتێ پێیزانی کۆمپانیاکانی تەلەفزیۆن بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە ساحەی دوژمندا یاری دەکەن، وایزانی لە بەرامبەری ئەو کۆمۆنیستانەدایە کە دەیانەوێ پیلانێك بگێڕن، لەبەرئەمە بوو سەرجەم کۆمپانیاکانی تەلەفزیۆن کەوتنە هەڵخەڵەتاندن و لە هەندێ حاڵەتی دیکەشدا کەوتنە بازرگانی کردن بە هەواڵ و دەنگوباسەکانەوە. بەڵام بە ڕاشکاوی هاتنە قسەو ڕایان گەیاند کە فرۆشتنی هەواڵ و دەنگوباس شیاوترین کاری لۆژیکی پیشەسازی کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەی دەنگوباسە.

بێگومان چەند هەواڵەکە درامی و تراژیدی بێت، هێندە پارە زیاتر دەکات. هۆیەکانی ڕاگەیاندن زۆر باش و شارەزایانە کەوتنە ژەندنی زوڕنای خۆیان بۆ ئەم جەنگە: ئەمەش وەك ئەو (پیانۆلە– Pianola)یەیە کە پێشتر لە سەر شریتی کارتۆنی، پارچەمۆسیقای بۆ تۆمار دەکرێ و دواتر بە پێی پێویست لێدەدرێت. بەمشێوەیە لە جەنگدا هەموو کەسێك لە بەرەکانی دواوە دوژمنی تایبەتی خۆی هەیە کە پەلاماری دەدا. دیارە ئەم حەقیقەتە هەرگیز لە لایەن (کلاوسیڤیتس)ەوە قبوڵ نەکراوە.

3–ئەگەر بتوانرێ هۆیەکانی ڕاگەیاندن– ماس میدیا Mass Media– دەمکوت بکرێت، ئەوا کەناڵە تەکنەلۆژیە نوێکان لە بواری کۆکردنەوەو گەیاندنی هەواڵ و دەنگوباسدا، دەتوانن بە خێراترین و ڕێکوپێکترین شێوە، هەواڵ و دەنگوباسە گرنگەکان بگەیننە هەموو کونجێکی ئەم دنیایە– تەنانەت هیچ دیکتاتۆرێکیش ناتوانێ لە بەردەم ئەم تەکنۆلۆژیایەدا هیچ ئاستەنگێ دروستبکات. دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەزگاو ئامێرە تەکنیکیە گچکانەی کە خودی دیکتاتۆریش هێندە پێویستی پێیانە، ناتوانێ بەبێ ئەوان کارەکانی ئەنجام بدات. شەپۆلی بەردەوامی کۆکردنەوەو گەیاندنی هەواڵ لە دنیای ئەمڕۆدا، هەمان وەزیفەی دەزگا جاسوسیەکان دەبینن کە لە شەڕە تەقلیدیەکاندا بینیویانە: کە دەتوانێ پەردە لە ڕووی هەموو کارو بەرنامەیەکی کتوپڕ هەڵماڵێ -ئەمەش واتا: چیدی ناتوانرێ هیچ جەنگێك ئەنجام بدرێت، چونکە ناتوانرێ بە کتوپڕی پەلاماری دوژمن بدرێت. کردەی جەنگ، جۆرە هوشیاریەك بەرهەمدێنێ، بەڵام کەناڵەکانی هەواڵ و دەنگوباس هوشیاریکی فرەتر بەرهەم دێنن: ئەم کەناڵانەی هەواڵ و دەنگوباس، بەردەوام بواری قسەکردن بە دوژمن دەدەن (کەچی وەکو هەمووما‌ن دەزانین ئامانجی هەموو سیاسەتێکی شۆڕشگێڕانە

ئەوەیە کە پڕوپاگەندەکانی دوژمن بێبەست بکات)، ئەم بڵاوبوونەوەی هەواڵو ڕێگەدانە بە دوژمن بۆ قسەکردن، جەماوەری هاولاتیان تووشی گومانو دڵڕاوکە دەکات بەرامبەر بە خودی حوکمەتەکانیان ((کەچی -کلاوسیڤیتس- زوو زوو ئەوەی دووپات دەکردەوە کە سەرکەوتن گرێدراوە بە ورەو یەکگرتوویی نێوان جەنگاوەرەکانەوە)). سەرتاپای جەنگەکانی جاران لەسەر ئەو پرنسیپە دامەزرابوون کە هاولاتیان بە جەنگێکی ڕەوای بزانن، گەرچی لەوانەشە لە زۆر حاڵەتدا بێهیوا بووبن لە ڕووخاندنی دوژمن، بەلام جەنگ لە جیهانی ئەمڕۆماندا بە پێچەوانەوە، بەهۆی کەناڵەکانی هەواڵو دەنگوباسەوە نەک تەنها بڕواو متمانەی هاولاتیان ئیفلیجدەکات، بەڵکو لە ڕووی ئینسانییەوە وایان لێدەکات بە مەرگی دوژمنەکانیان نیگەران بن و بەزەییان بجوڵێ -چونکە لە جاراندا زۆر بە زەحمەتو تەنها بە هەواڵێك مەرگی ئەوانیان دەبیست، بەلام ئەمڕۆ بەوپەڕی وردەکارییەوە کارەساتەکان دەبینن، چیدی گومانیان لەو تراژیدیایە نیە، بەڵکو وەك حەقیقەتێکی بینراوی بێوێنە بێپرس لە پەنجەرەی هەموو ماڵێکدا ئامادەیە.

4-هەموو ئەمانەی وتمان، یەك لەسەر ئەوی دیکە، ڕەنگدانەوەی هەیەو هەموشیان پێکەوە ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن کە (فۆکۆ) پێی ڕاگەیاندین کە: دەسەلات چیتر یەك جەستەو یەك جۆر نیە، بەڵکو پەرشو بڵاوو فرەجۆرو پارچەپارچەیە، دەسەلات لە دوالیزمێکدا کاردەکات، لەلایەك هەوڵدەدات بنەچەو جۆرو نەژادە جیاوازەکان کۆبکاتەوە، لە لایەکی دیکەوە بەردەوام خەریکی دارزاندنو بۆگەن پێکردنی ڕەزامەندی گشتیە. جەنگ چیدی دوو نیشتمان نادات بە یەکدا، بەڵکو چەندین دەسەلات دەخاتە گەرمەی ململانێو پێشبڕکێوە. لەم یارییەدا تاکە تاکەی سەنتەرەکانی دەسەلات قازانجدەکەن، بێگومان لەسەر زەرەری سەنتەرەکانی دیکەی دەسەلات. ئەگەر جەنگەکانی جاران بازاڕی چەكو تەقەمەنی گەرم کردایە، ئەوا قازانجو دەستکەوتی ئابوری ئەم پیشەسازیە، دەبوە خۆ سەپاندنی جۆرە گەمارۆیەکی کاتی بەسەر بازرگانیو ئالوگۆڕی هەندێ کەلوپەلی تردا، بەلام جەنگی ئێستا ئەگەر بازاڕی چەكو تەقەمەنی گەرم کات، ئەوا سەرتاپای بازاڕی کۆمەڵێ بەرهەمی دیکە تووشی قەیران دەکات (دیارە ئەمەش لە سەرتاپای دنیادا) بۆ نموونە: هەڵگیرسانی جەنگ دەبێتە هۆی سستیو هەندێجار لەکارکەوتنی پیشەسازی گواستنەوەی ئاسمانی (هاتوچۆی ئەفەر بە فڕۆکە)، یان پیشەسازی گەشتوگوزار، یان چاپو بڵاوبوونەوەی هۆیەکانی ڕاگەیاندن (چونکە پڕوپاگەندەی بازرگانی -ڕێکلام- یان لە کیس دەچێت)، هەر جەنگە کە دەبێتە هۆی لەکار وەستانی سەرجەم پیشەسازییە گچکەو مامناوەندییەکان -کە ئەمانە بڕبڕەی پشتی سیستەمەکەن- وەك بازاڕی خانووبەرە، ئۆتومبیل....هتد. هەر کە هەواڵی گریمانەی جەنگێك بڵاودەکرێتەوە بۆرسە-Borsa تەکانێکی گەورە بۆ پێشەوە دەچێ، پاش مانگێك لە شەڕ، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی یەکەم گریمانەی ئاشتیو وەستاندنی جەنگ، دیسانەوە بۆرسە تەکانێکی دیکە بۆ پێشەوە دەڕوا. نە لە حاڵەتی یەکەمدا "بەدگومانی" و نە لە دووەمدا هیچ "ڕاستیو حەقیقەتێك" لە ئارادایە. بۆرسە تەنها هەڵبەزو دابەزی یاریەکانی دەسەلات تۆماردەکاتو بەپێی ئەمانەش هەڵوێست وەردەگرێ. لە جەنگدا هەندێ دەسەلاتی ئابوری لەگەڵ هەندێکی دیکەی هاوشێوەی خۆیدا دەکەونە ململانێوە، لۆژیکی ئەمان لە جەنگدا بە دڵنیاییەوە زاڵ دەبێت بەسەر لۆژیکی دەسەلاتە نەتەوەییو نیشتمانیەکاندا. ئەگەر خەرجیە دەوڵەتیەکان بۆ چەكو تەقەمەنی ببنە هۆی نیگەرانی، ئەوا خەرجی تاکەکانی کۆمەڵگا

پێویستی بە کامەرانی هەیە، بەمشێوەیە جەنگ لە قاڵبو سنوری چەمکە ئابوریەکاندا یاریدەکات.

5-دوابەدوای هەموو ئەو ڕاستیانەی سەرەوە، جەنگ چیتر وەک جەنگەکانی جاران لە سیستەمێکی هوشیاریی زنجیرەیی ناچێت، بەڵکو دەتوانین بڵێین: جەنگ لە جیهانی ئەمڕۆماندا هاوشێوەی سیستەمێکی هوشیاریی تەریبیە. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، دەبێت هەندێ نموونە بێنینەوە: سیستەمی هوشیاریی زنجیرەیی، ئەو سیستەمەیە کە بەکارهاتوە بۆ دروستکردنی ئەو ماشێنانەی تەرجەمە دەکەن، یان ئەوانەی دەتوانن بە پێی ئەو زانیاریانەی تیایاندا تۆمارکراون، وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە. دیارە ئەمەش لە لایەن کەسێکی پرۆگرامەرەوە، پاش چەندین ڕاهێنانو مەشق، هەندێ یاساو ڕێسای تایبەتی دارێژراوە بۆ کارکردنی ماشێنەکە. ئەم ماشێنە لە هەموو چرکەیەکدا بە پێی ئەو زانیاریانەی پێشتر تۆمارکراونو دوابەدوای ئەو پرسیارەی دەکرێت، وەڵامێک دەداتەوە کە وابەستەشە بەو بڕیارو بەهاو نرخانەوە کە لە دواتریشدا دێن. ئەمەش بە تەواوی بە پێی ستراکچەرێک کە لە شێوەی درەختێکدایە، پێکهاتوە لە چەندین زنجیرەی لە یەکتر ترازاوی دوفاقی (دوو سەرە). ستراتیژە شۆڕشگێڕییە دێرینەکان، ئا بەمشێوەیە کاریاندەکرد: ئەگەر دوژمن هێزەکانی خۆی ڕوەو خۆرهەڵات بجوڵێنێ، دەبێ پێشبینی ئەوە بکەین کەلە داوتردا دەیەوێو مەبەستێتی بەرەو باشوور بیانبات، لەم حاڵەتەدا، بە پێی هەمان لۆژیک، من هێزەکانی خۆم بە ئاراستەی باکوری خۆرهەڵات دەجوڵێنم، دیارە ئەمەش مەبەستم لەوەیە کە بە شێوەیەکی باکوری خۆرهەڵات دەیجوڵێنم، مەبەستم لەوەیە، بە شێوەیەکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراو، لە ئاراستەیەکی تردا ڕێ لە هێزەکانی دوژمنم بگرم. یاساو فۆرمو ڕێساکانی ئێمەو دوژمن هەمان شت بوون، وەک ئەوەی یاری شەترەنج بکەین، هەریەکەیان لە سەرەی خۆماندا داشی خۆمان دەجوڵاند.

بە پێچەوانەوە، سیستەمێکی هوشیاریی تەریبی، بڕواو متمانە دەبەخشێتە یەکە یەکەی خانەکان لە سنووری تۆڕێکدا، بۆئەوەی هەریەکەیان بڕیاری خۆی بدات بۆ ڕیزبەندکردنی خۆی پێبەپێی دابەشبوونی قورساییەکان، دیارە ئەمەش بۆ ئەوەیە لە کۆتاییدا هەر هەموو خانەکان پێکەوە یەکشێوە بۆ تۆڕەکە پێکبێنن. ئەم شێوە کۆتاییەی تۆڕەکەو دابەشبوونی قورساییەکان کارگەلێك نین لە لایەن خودی کارگێڕی تۆڕەکەوە بتوانرێ بڕیار یان پێشبینی بکرێت، چونکە تۆڕەکە دەموەست خۆی دەگونجێنێو بە پێی قورساییەکان هەندێ یاساو فۆرم بۆ خۆی دادەنێ کە پێشتر لە هیچ شوێنێکەوە بۆی نەچوە، بۆئەوەی بگات بە ئاکامێك. ئەوەی جێی ئاماژە بۆکردن بێت، ئەوەیە کە ئەم سیستەمە هیچ جیاوازیەك ناکات لە نێوان زانیاریو (یاسا)دا. هەروەها ئەوەش ڕاستە کە دەتوانرێ ئەم سیستەمە کۆنترۆڵ بکرێت بەهۆی ئەو وەڵامانەوە کە دەدرێنەوەو ئەوانەشەوە کە چاوەڕوان دەکرێت (بەم سیستەمە دەوترێ "پێکەوە لکاندنی نوێ" یان "تۆڕی دەمارە هەستییەکان") دیارە لە دواتردا بەهۆی ئەزموونە پێشینەکانەوە دەتوانرێ سەرلەنوێ دابەشبوونی قورساییەکان ڕاستبکرێنەوە. بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارەش پێویستە:

1- کارگێڕی تۆڕەکەت (کات)ی زۆری هەبێت.

2-نابێ دوو کارگێڕی تۆڕ هەبن کە ململانێ بکەن یا بەردەوام دابەشبوونی قورساییەکان لە گۆڕانی دژ بە یەکدا بن.

3-دەبێت تاکەتاکەی خانەکانی تۆڕەکە، وەك (خانە) بیربکەنەوە، نەك وەکو کارگێڕی تۆڕ، واتا نابێت خانەکان بڕیارێك بدەن لەژێر کاریگەری

هەڵسوکەوتو شێوەی مامەڵەی کارگێڕی تۆڕەکاندا. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر نابێت خانەکان بەرژەوەندیەکی نامۆیان بە لۆژیکی تۆڕەکەیان هەبێت. ئەمە لە کاتێکدا لە سیستەمی پارچەپارچەبووی دەسەڵاتدا هەر خانەیەك بە پێی بەرژەوەندیەکانی خۆی هەڵوێست وەردەگرێ، کە بە دڵنیا جیاوازن لە بەرژەوەندیەکانی کارگێڕی تۆڕەکەو هیچ پەیوەندیەکیان بە ڕێبازەکانی خۆ بزواندنی تۆڕەکەوە نیە.

لە کۆتاییدا، تەنها وەك نموونەیەك، ئەگەر جەنگ سیستەمێکی پێکەوەلکانی نوێ بێت، ئەوا جەنگ لە دەرەوەی ویستو ئارەزووی دوو لایەنە شەڕکەرەکە پەرەدەسێنێو پەل دەهاوێو خۆی ئاراستەدەکات.

ئارنۆ پێنتسیاز- Arno Penzias لە بارەی سیستەمی هوشیاری تەریبیەوە، بە تایبەتی لە بارەی شێوەی کارکردنی تۆڕە دەمارییە هەستییەکانەوە، شوبهاندنێکی زۆر شۆڕشگێڕانەی بە ئەنجام گەیاند کە بوە مایەی سەرسوڕمانی هەموان، ئەو دەیزانی کە یەکەیەکەی شادەمارە هەستیەکان، بە شێوازی تەزووی ئەلەتریکی چالاك دەبن (واتە: دەسترێژ ئەکەن) دیارە ئەمەش کاتێك دەبێت کە لە ڕێگەی کێبڵەکانی (Input- ئینپوت)ەوە (کە زۆر بە وردی پەلوپۆیان بڵاوبۆتەوە) هانبدرێن (واتە: فەرمانیان پێ بکرێت). لە ساتەوەختی (دەستدرێژکردن- تەقەکردن)دا یەکێك لە شادەمارەکان بە درێژایی زنجیرە کتێبەکانی (Output- ئاوتپوت) ئاماژەی ئەلەتریکی دەهاوێژێنە دەرەوە جا لەبەرئەوەی *تەقەکردنی* هەر شادەمارێك پەیوەستە بەکارو چالاکی ژمارەیەکی ئێجگار زۆری دەماری ترەوە، هەروەها هیچ شێوازێکی سادەو ساکار نیە بۆ ژماردنی هەموو ئەو گریمانانەی کە دێنە پێش، گریمانەی چێتی شتەکانو گریمانەی کاتی ڕوودانیان. (...) بە پێی سیستەمی ئاماژە تایبەتیەکانی پێکەوەلکانی جومگە هەستییەکان، هەریەك هاندان (یان با بڵێین هەریەك فەرمان) کە بگاتە تۆڕێکی دەمارە هەستیەکان، کە گریمان (100 دەماری گەورەی تێدابێت) ئەوا بۆ دۆزینەوەی (هاوتایی- توازن)ەك لە دۆخی دەمارەکاندا، پێویستی بە کۆمەڵێك گریمانەی لە ژمارە نەهاتوو هەیە، دیارە ئەمەش مەبەستمان لە گریمانەکانە لە ناوخۆی سنووری کۆی گشتیاندا، کە دەگاتە هەزار ملیارد ملیارد ملیارد، یان دەگاتە ($10^{30}$- دە توان سی لە گریمانەی ڕەها).

ئەگەر جەنگ سیستەمێکی پێکەولکانی نوێ بێت، ئەوا چیتر زانینو ناسینی مەبەستو ئامانجەکانی لایەنە شەڕکەرەکان نابێتە دیاردەیەکی بەنرخو بگرە هیچ بەهایەکی نامێنێ. ژمارەی لەبن نەهاتووی ئەو دەسەڵاتانەی بەشداری یارییەکە دەکەن، بە پێی ڕێژبەند بوونی کۆتاییش بە شێوەیەك بێت کە لە بەرژەوەندی تەنیا لایەکی جەنگەکەدا بێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، لەبەرئەوەی سەرجەم پێشبینیو بڕیارەکان پوچەڵ دەبنەوە، ئەوا شەڕەکە بۆ هەردوو شەڕکەرەکە دەبێتە مایەی زەرەرو دۆڕاندن، چونکە بەپێی نمونەکەی باسمانکرد، کارگێڕی تۆڕەکە، ماندوونەناسانە کاردەکات بۆ کۆنترۆڵکردنی تۆڕەکە، بەڵام ئەگەر هاندانێك (یان فەرمانێك)ی دژە ئاراستەو پێچەوانەی پێبگات، ئەوا سەرتاپای سیستەمەکە لەبەریەك هەڵدەوەشێو هەپروون بە هەپروون دەبێت. ئەو ئاکامەی لە هەموو جەنگێك چاوەڕوان دەکرێت چیە، جگە لە پەککەوتنو لەکارکەوتن؟ جەنگی جاران وەك یارییەکی شەترەنج وابوو، نەك تەنیا هەر یاریکەر بۆی هەبوو بە مەیلی خۆی نیشانە لە داشەکانی بەرامبەرەکەی بگرێتەوەو هێندەی دەتوانێ داشەکان بخوات، بەڵکو (بەهۆی کەشفکردنی ئوسلوبی یاریکردنی بەرامبەر) دەیتوانی بەرامبەرەکەی ڕووبەڕووی (کش مەلیك) بکاتەوە.

بەڵام بە پێچەوانەوە {جەنگ}ی هاوچەرخ دیسانەوە هەروەکو یاریەکی شەترەنج وایە، بەڵام هەردوولا (هەردوو یاریزان) لە یەك ساحەدا، لەسەر یەك ڕەنگ یاری دەکەن، (هەردوولا لەنێو یەك تۆڕدا یاری دەکەن). هەردوولا داشەکانی یەك ڕەنگ دەجوڵێنن، لە یەك ڕەنگ دەخۆن (یاریەکە چیدیکە ڕەش‌و سپی نیە، بەڵکو تاك ڕەنگە). ئەمەش بێگومان یارییەکی خۆ لەناوبردنە، (خۆکوژی)یە.

لە لایەکی ترەوە، ئەگەر لە ساتەوەختێکی دیاریکراوی جەنگێکدا، پەردە لە ڕووی ئەو ڕاستیە هەڵماڵین کە ئەو جەنگە بۆ کەسێکی دیاریکراو بۆتە مایەی سوودو قازانج، ئەوا لە کۆتایی جەنگەکەدا تووشی قەیرانێك دەبین کە ناتوانین بەراوردی سوودو قازانجی جەنگەکە بکەین لە ساتەوەختەکانی تردا وەك ئاکام‌و دەرئەنجام چی بوە؟ گەر جەنگەکە لە شێوەو جۆری دیکەدا بەردەوام بێت؟ هەروەك چۆن کلاوسیڤیتس خوازیاری ئەوەبوو شەڕ لە شێوازی دیکەدا بەردەوامی سیاسەتی جەنگ بێت (هەر لەبەر ئەم حاڵەتەیە کە ئەوکاتە بڕوا بە کۆتایی شەڕ بهێنین کە دۆخەکە ئاسایی بووبێتەوە، وەزعەکە شێوەیەك لە یەکسانی بەخۆوە ببینێ‌و ئاشتی سەقامگیر بێت‌و لایەنەکانی جەنگ گەڕابێتنەوە بۆ مومارەسەی سیاسەت)، بەڵام لەم سەدەیەی ئێمەدا، بەردەوام ئەوە سیاسەتی پاش جەنگە، بە هەموو شێوەو شێوازێك بەردەوام دەبێ لە چوارچێوەی دروستکردنی چەندین گفت‌و بەڵێن. جەنگ، هەرچۆنێ بووبێت ئاکامەکەی، توانیویەتی ببێتە هۆی سەرلەنوێ ڕیزبەند کردنەوەی قورساییەکان، کە بێگومان هەرگیز تەبا نیە لەگەڵ ویست‌و ئارەزوەکانی لایەنە شەڕکەرەکاندا، بەم بۆنەیەوە شەڕ درێژ دەبێتەوەو بەردەوام دەبێ لە شێوەی نائارامییەکی سیاسی‌و ئابوری‌و سایکۆلۆژی زۆر دراماتیکیدا بۆ چەندین دەیەی دواتر، کە هەرچییەك بێت، جگە لە {سیاسەتێکی شەڕخوازانە} ناتوانێ هیچی تر بەرهەم بێنێ..

لەم حاڵەتەدا، دەبێ بپرسین، ئایا ئەوە ڕاستە کە لە هیچ شوێنی لەوەی باسمانکردن زیاترو جیاوازتر ڕوویندەداوە؟ ئایا لێمان حەرام کراوە بیر لەوە بکەینەوە کە کلاوسیڤتیس بە هەڵەدا چوە؟ زانستی مێژوو گەر جارێکی دیکە جەنگی {واتەرلۆ} بخاتەوە بەر سەرنج‌و ڕاڤەکردن، ئەوا بە دڵنیاییەوە وەك پێکدادانی دوو هوشیاری جیاواز ڕاڤەی دەکات (چونکە توانی بگاتە ئاکام‌و ئەنجامێك)، بەڵام کەسێکی وەك {ستێندهاڵ– Stendhal} درکی بەوە کردبوو کە ئەو جەنگە لە سنووری چەمکی {ڕێکەوتن}دا بخوێنێتەوە. گەر شەڕە کلاسیکییەکان بەوە پێناسە بکەین کە ئاکام‌و دەرئەنجامی ڕاست‌و دروستیان هەبوە، واتە لە کۆتاییدا گەیشتوون بە شێوە یەکسانیەك -ئەم بۆچوونەمان لە پێشبینییەکی {هیگڵ}ەوە سەرچاوەی گرتوە کە گوایە مێژوو ئاراستەیەکی هەیەو لە نێوان گومان‌و دژە گومانەکاندا دەرئەنجام دەگەینە حەقیقەت، بەڵام نە بەڵگەی زانستی‌و نە لۆژیکیمان لەبەردەستدا نیە بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی وڵاتانی دەریای سپی {بە شێوەیەکی یەکسانی} بۆ پاش جەنگی قەرتاجیەکان، یان وڵاتی ئەورووپا پاش زنجیرە شەڕەکانی ناپلیۆن. بە پێچەوانەوە نایەکسانی‌و ناهاوتاییەك بەدیدەکرێت، کە ئەگەر جەنگ نەبوایە مەحاڵ بوو ڕوویبدات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە درێژایی دەیان هەزار ساڵ جەنگی کردوە بە تاکە چارەسەرێك بۆ یەکسانکردنەوەی دۆخە نایەکسانەکان، بەڵام دەرئەنجام هەر نایەکسانی خوڵقاندوە، ئەمە کتومت لەو لایەنەدا بەرجەستە بوە کە لە هەمان قۆناغدا، مرۆڤایەتی بۆ چارەسەرکردنی دۆخی نایەکسانی سایکۆلۆژی تاکەکان پەلاماری مادە بێهۆشکەرەکان‌و کحولی

بردوەو ئەمانەش زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە مرۆڤیان داتەپیوو شرو بێهۆش کردوە.

جێی خۆیەتی ئا لێرەدا بابەتی {تابو (حەرام) Tabu} بێنینە پێشەوە. بەر لە ئێمە {موراڤیا} دەستپێشکەری بۆ کردوە، کاتێك سەرنجی ئەو ڕاستییەی داوە کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پاش تێپەڕبوونی چەندین سەدە بڕیاریدا کە هەموو جۆرە پەیوەندیەکی سێکسی لەنێوان ئەندامانی یەگ گروپ (یەك خێزان)دا حەرامبکات، چونکە بۆیان ئاشکرابو کە ئەو پەیوەندییە سێکسییە ئاکامی زۆر نێگەتیڤی لێدەکەوێتەوە. لەوانەیە ئێستاش کاتی ئەوە هاتبێ کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بۆیان ئاشکرا بوبێت کە بەهۆی ئاکامە خراپەکانیەوە، بە شێوەیەکی گشتی ئەو بڕیارە ڕابگەیەنن کە شەڕکردن {تابو-حەرام} بکەن. ئەم ڕاوبۆچوونە، بەوپەڕی ڕیالیستییەوە وەلامدرایەوە کە {تابو- حەرام}کردنی هیچ شتێك بانگەوازی بۆ ناکرێت، واتە ڕاناگەیەنرێ، بەڵکو هەموو بڕیارێکی ئەخلاقی زەمەنێکی دوورو درێژی دەوێتو پێویستە بۆ چەندین سەدە لە کونو کەلەبەرە تاریكو نادیارەکانی هوشیاری کۆمەلایەتیدا بمێنێتەوە، ئینجا ئەو حەرامکردنە دەبێتە مەسەلەیەك کە هەموان لایان ئاشکرا بێت {هەر لەبەر ئەمەیە کە لە سستەمێکی تۆڕی دەمارە هەستییەکاندا دەتوانێ بە تەنیا بگاتە ئەو حەقیقەتەی کە یەکسانیو هاوتایی بەرهەم بهێنێ}. ئەمەش هیچ گومانی تیا نیە کە حەرامکردنی هەموو شتێ، بەرلەوەی ڕابگەیەنرێ، خۆی خۆی ڕادەگەیەنێ، بەلام لە توانای ئێمەدایە کە تەمەنی ئەو پێگەیشتنو کامڵبوونە خێراتر بکەین. بۆ تێگەیشتن لەوەی کە جووتبوون لەگەڵ مێینەکانی خێزاندا دەبێتە گەورەترین ئاستەنگ لە بەردەم ئاڵوگۆڕ لە نێوان بنەماڵەو خێزانەکاندا، هەزاران ساڵی ویستوە- بەهەمان شێوە، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی زەمەنێکی دوورو درێژی ویستوە بۆ جیاکردنەوە لە نێوان پەیوەندیە ڕێکەوت کردەکانو عاتفییەکان لە سنورەکانی کردەیەکی سێکسیو دەرئەنجامێکی سکپڕبووندا، بەلام لە جیهانی ئەمڕۆماندا بۆ تێگەیشتن لەو ڕاستییەی کە بە هۆی جەنگەوە کۆمپانیاکانی فرۆکەوانی لەکاردەکەون، تەنها دوو هەفتە ئەو زەمەنە زۆرەیە کە هەموان نەك لە ڕاستییەکە تێدەگەن بەڵکو هەست بە کاریگەریەکانیشی دەکەن. کەواتە کارێکی دروستو گونجاوە لەگەڵ وەزیفەی ڕووناکبیریماندا بە هاوتەریب لەگەڵ هەستی کۆو هوشیاری کۆمەلایەتیدا کە {حەرامکردنی جەنگ} ڕابگەیەنین، چونکە دەبێ هەموومان دلنیابین کە هیچ کەسێك دەسەلاتی ئەوەی نیە تەمەنی کامڵبوونو پێگەیشتنی ئەم حەرامکردنە دیاری بکات.

دەرئەنجام ئەرکێکی گرنگو پڕبایەخی ڕووناکبیریە کە بە دەنگێکی بەرز، حەرامکردنی جەنگ ڕابگەیەنین. گەرچی هیچ ڕێگەچارەیەکی ئەلتێرناتیڤی ئەم کێشەیە شك نابەین. ئەوەندە بەسە کە ئەو ڕاستییە بخەینە یادی هەموان کە لەم سەدەیەی ئێمەدا (واتە: سەدەی بیستەم .و.) بلندترینو پڕکشۆترین ئەلتەرناتیڤمان بۆ {جەنگ} پیادە کردوە، کە ئەویش جەنگی {سارد}ە. کارەساتە تۆقێنەرەکان، نادادپەروەریی، نائارامی، شەڕو پێکدادانە ناوچەییەکان (لۆکاڵەکان)، بلاوبوونەوەی مەترسیو دلەڕاوکە، هەموو ئەمانە لە کۆتاییدا دەمانگەیەننە ئەو بڕوایەی کە شەڕی سارد باشترینو گونجاوترینو سەرکەوتووترین چارەسەر بوە، تا ڕادەیەك ئەفسانەییش بوە، تەنانەت توانیویەتی براوەو دۆڕاو لە کۆتاییدا ئاشکرا بکات، بەلام ئەوەیان (واتە: ڕاگەیاندنی جەنگی سارد) بە هیچ شێوەیەك ئەرکو وەزیفەی ڕووناکبیر نیە. دەگەڕێمەوە بۆ سەرەتای ئەم وتارە، ئەو

بێدەنگییەی هەندێ لە ڕووناکبیران لەوانەیە ئەو ترسە بووبێ بۆ قسەکردن لە بارەی جەنگەوە بە هەمان گەرمو گوڕی هۆیەکانی ڕاگەیاندن. جا لەبەرئەوەی ئەم هۆیانەی ڕاگەیاندن بەشێکی گرنگی ئامێرەکانی شەڕن، گەورەترین هەڵە ئەوەیە بە بێلایەنیان بزانیت. لە سەروو ئەمەشەوە، لەبەرئەوەی زەمەنی هۆیەکانی ڕاگەیاندنو زەمەنی لێکدانەوەو ڕەخنەگرتنو ڕاڤەکردنی جەنگ، دوو زەمەنی جیاوازنو هاوشانی یەك نین، کەواتە هەر هەڵەیە خۆ بخەیتە نێو ئەو زوڕنا ژەنینەوە بۆ جەنگ. ئەرکو وەزیفەی ڕووناکبیری یان پێش ڕووداو دەکەوێ، یان پاش ڕووداو، لە یەکەمیاندا پێشبینی مەترسییەکان دەکاتو لە دوەمیاندا ڕووداوەکە ڕەخنەو ڕاڤەدەکات.

زۆر بە دەگمەن وەزیفەی ڕووناکبیری لە بارەی ئەو شتانەوە بوە کە ئێستا ڕوودەدەن، چونکە ڕیتمی ڕووداوەکان هەمیشە خێراترن لە ڕیتمی ڕەخنەو ڕاڤەکردنی ڕووداوەکان. واتە هەمیشە ڕووداوەکان زۆر خێراتر لە لێکدانەوەو ڕاڤەکردنەکان دەقەومێن. هەر لەبەر ئەم مەسەلەیەش بوو کە کاتی خۆی ((کۆزیمۆ پیۆڤاسکۆ))ی خەڵکی ((ڕۆندۆ)) دەچوە سەر بەرزایی درەختەکان، نەك بۆ هەڵاتن لە ئەرکی خۆی وەك ڕووناکبیر، بەڵکو بۆ ئەوە بوو باشتر لەو ساتەوەختە تێبگاتو چاکتر ببینێو بە گونجاوترین شێوە بڕیاری بەشداریکردن بدات تیایدا، بەڵام لە کۆتایدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە بکەین، کە کاتێك ڕووناکبیر بێدەنگیی هەڵدەبژێرێ، دەبێ بە بەرزترین دەنگ ئەم هەڵوێستە ئاشکرا بکات، گەرچی بێدەنگ بوونەکەی وەك تاکتیك بێت. هوشیاری گوتاری دژ بە بێدەنگیی، دەسەڵاتی قەناعەت هێنان بە بێدەسەڵاتی، ئەمانە لە مەسەلەی مومارەسەکردنی لێکدانەوەو ڕەخنەگرتنو ڕاڤەکردنی ڕووداوەکاندا، هەرگیز نابنە پاساوی ڕاستەقینە بۆ لێبوردن لە هەڵاتنو خۆشاردنەوە لە بەرپرسارێتی، بەڵام یەکەمین ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە کە ئەمڕۆ ڕای خۆمان ئاشکرا بکەین کە {جەنگ} هەموو جۆرە پێشنیارێکی مرۆڤانە پوچەڵ دەکاتەوە، تەنانەت کۆتایی جەنگەکە وەك ئاکامێکی حاشا هەڵنەگر (کە سەرکەوتنی حەتمی یەك لایە لە دوولا شەڕکەرەکە) ناتوانێ چیتر یاریەکە بوەستێنێ، چونکە ئەو یاریە تازە خودموختاری خۆی لە سنووری قورساییە گیرخواردوەکانی تۆڕەکەدا وەرگرتوە، چونکە دەبێ دڵنیا بین کە هەموو بارستاییەك چەند قورس بێت، دەتوانێ هێندە بەلای خۆیدا شتەکان ڕابکێشێ، هەموو قەبارەیەکیش چەند بتوانێ ڕاکێشرێت هەر هێندە ڕاکێشراو دەبێت.. هەروەها ئەو قورساییە هەرچەندێك بێت دەیەوێت دابەزێت، بە شێوەیەك کە ئاستی وەستانی ئایندەی نزمترە لە ئاستی وەستانی ئێستای، کەواتە هیچ قورساییەك ناتوانێ لە ئاستێکیدا ببێتە جێی متمانەو باوەڕ.. (ئەم قسانە لە یەکێك لە گفتوگۆکانی *مێشێل ستێیدتێر*– Michel staeder وە وەرگیراون.. ئەم نزمبوونەوەو هاتنە خوارەوەیە ناتوانرێ بە هیچ شتێ پاساو بدرێتەوە، چونکە بە پێی یاساو چەمکەکانی بنەچەی جۆرەکان ئەمە لە تاوان خراپترە، چونکە بە فیرۆدانو خراپ کردنە..

# سایکۆلۆژیای هونەر

■ دێنی هۆیسمان

● و. لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید



بندیتۆ کرۆچە دەیوت: "جوانی بوونێکی فیزیکی نییە". واتە بابەتی جوانی (لە خودی خۆیدا) بایەخی نییە، بەڵکو ئەو خودە بایەخی هەیە کە هەست بە جوانیەکە دەکا. بۆیە ئەگەر پێمان نەکرا لەڕێی هەندێ میتۆدی بابەتییەوە هونەر بناسین، ئەوا (دەکرێ بپرسین) لە کوێوە بگەینە هەستیاریی ئیستاتیکی؟ بەتایبەتی سەبارەت بە سایکۆلۆژیای بەرهەمهێنو بەرخۆر، ئەو کەسەی کاردەکاو ئەو کەسەی سوود لە بەرهەمی کار وەردەگرێ.. هەروەها سەبارەت بە ئەڵقەی پەیوەندی نێوانیان: نێوەند؛ وەرگێڕ یان دەربڕ (جا ئەگەر کەسێکی داهێنەر بێت لە هونەرەکەیدا یان تەنانەت گەر بازرگانێکی کڕین و فرۆشتنی تابلۆش بێت). بە مانایەکی تر، پێویستە لە پرۆسەکانی: ئەفراندن *Creation*، تێڕامان *Contemplation* و نواندن *Execution* بکۆڵینەوە کە پەیوەندییان بە بەرهەمی هونەرییەوە هەیە. بەڵام (پێشتر) با لەو ئایدیایەی کانت بگەین کە ڤیکتۆر باچ گوزارشتی لێکردووە بەوەی کە "جوانی شتێك، نابێتە خەسڵەتێکی ئەو شتە، بەڵکو چالاکیەکی خودییە، هەڵوێستێکە بەرامبەر ئەو شتە وەریدەگرین". لە ڕاستیدا بابەتی هونەری، یان بەرهەم، جۆراوجۆرە (وێنە یان سیرامیك، شیعر یان

سەمفۆنیا..) تا ئەو ئەندازەیەی ناتوانین بەشێوەیەکی بەکانگیر، یان گشتگیر لێیان بکۆڵینەوە، چونکە ناسینی ڕۆحی شتێك بەتەنهاو ناسینی ویژدانی ئیستاتیکی لە بەرامبەر بەرهەمی دروستکراودا، دەرفەتمان پێدەبەخشێ بگەینە ئاستی گشتی و ئاستی پێویستی شیکردنەوەی ئەو بەرهەمە.

ئاشکرایە سایکۆلۆژیای هونەر لە سێکوچکەی ئەو سێ زەمەنە ئیستاتیکیەدا گیر ناخوا: تێڕامان، ئەفراندن، نواندن. بەڵکو سەدان شێوازی چێژوەرگرتن لە هونەردا هەیە؛ بەڵام ئەو کەسەی بەرامبەر شتێك ڕادەمێنێ خۆی سەرلەنوێ بەرهەم بە خواستی خۆی دروستدەکاتەوە، ئەفرێنەریش ئەو کەسەیە کە لە بەرهەمەکەی ڕادەمێنێ پێش ئەوەی ڕەنگی بکا.

ئێمە لای خۆمانەوە، وەك ئەرکێکی پێویست و وەك میتۆدێك بۆ پۆلێنکردن، کە باشتریش وایە ڕەمەکی بێت، پێڕەوی ئەو سێکوچکەیە دەکەین.

### ١-تێڕامان

ئاوازی کەمانچەیەك خەمبارمان دەکا.. دیمەنی تولەڕێیەك لەژێر سێبەری چەند درەختێکدا شاگەشکەمان دەکا.. چەند دێڕە شیعرێکی مالارمێ سیحرمان لێدەکا. ئەمانە چەند سەرنجێکن لە ڕووی چۆنایەتیەوە، وا ڕۆیشتوون ناویان لێبنرێ "هەستی ئیستاتیکی" کە لێیان دەکۆڵینەوە وەك ئەوەیە لە "هەستی ئەخلاقی" یان "ئاینی" بکۆڵینەوە. مەحاڵە لە هەموو گەردووندا نموونەیەك لە خەڵکی هەبن ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم هەستانەیان لا دروست نەبووبێ، بەڵام هەموو کەسێك لای خۆیەوە پەنا بۆ ئەو چێژە دەبا کە دەیبینێتەوە، ئارەزووە جیاوازەکانیش هەموویان پێکەوە تۆڕێکی هەمەڕەنگ و هەمەجۆر پێکدێنن.

لەوانەیە مەحاڵ بێت لەو چێژە بکۆڵینەوە کە عاشقێکی هونەر هەستی پێدەکا: چونکە تەنها چێژێك لە ئارادا نییە، بەڵکو دەیان هەزار چێژ هەن. لە کاتێکدا دامێنەرەکان سایکۆلۆژیایەکی هاوبەشیان هەیە کە بە ئاسانی ئاشکرا دەبێ، ئەوانەی کە لە هونەر ڕادەمێنن هەریەکەیان لای خۆیانەوە بە ئارەزووی خۆیان بەبێ بنەمایەکی هاوبەش هەست بە هونەر دەکەن. گەر بمانەوێ خاوەنی دیدی خۆمان بین بۆ ئاشکراکردنی هونەر، ئەوا پێویست دەکا لە شتە تایبەتەکاندا بەدوای ئاستە گشتیەکاندا بگەڕێین، قوڵایی هەموو دامێنانێك هەڵبکۆڵین لەپێناو دەرهێنانی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە دەکرێ بابەتی بن و لەپێناو داماڵینیان لە فۆرمەکانیان. بۆیە ئێمە بێسڵەمینەوە نکوڵی لەو بڕیارەی (سۆریۆ) دەکەین کاتێ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە "کۆششەکانی فیکر لە پێناو ئەفراندندا تاقە شت و گرنگترین شتن". گومان لەوەدا نییە کە هەستی هونەریی لای ئەفرێنەر ئاسایی ترە تا لای وەرگر، بەڵام لە پرۆسەی ئەفراندندا بایەخێکی ئەوتۆی نییە چونکە دەبێتە شتێکی هەڵێنجراو. هونەرمەند، هەروەکو ڤیکتۆر باچ دەبێژێ، دیاردەیەکی ناوازەیە.. چونکە ئەو بوونەوەرە سەیرو سەمەرەیە، خۆی لە خۆیدا، بەدەست هونەرەکەیەوە ئازار دەچێژێ و سەرەتا وەك (وەرگرێك) لە هونەرەکەی ڕادەمێنێ پێش ئەوەی وەك ئەفرێنەرێك دروستی بکا. سەرەتاش کردار لەئارادا بوو نەك ئەفراندن، دەبوو مرۆڤ پێش ئەوەی تواناو لێهاتویی خۆی تاقی بکاتەوە، تەماشا بکاو هەوڵی تێگەیشتن بدا: هونەرمەندی دڕندە (سەرەتایی) پێش ئەوەی گوڵێك لەسەر پێشی خۆی بکوتێ، لە سروشت وردبۆتەوە، پێش ئەوەی لاسایی وێنەی گوڵەکانیش بکاتەوە لەسەر پێستی خۆی نەخشاندوونی. واتە لە بیرکردنەوەدا ئەفراندن گرنگە بەڵام لە تێڕاماندا وا نییە، چونکە چێژوەرگرتن و



شاگەشکەبوون لەپێش کردارەوە دێن بە مەودایەکی زۆر. دواجار ئەو تێڕامانەش حاڵەتێکی گشتگیرە چونکە هەموو مرۆڤەکان هەستی پێدەکەن، تەنانەت ئەفرێنەرەکان و خاوەن دڵە ساویلکەکان و ئەوانەی کە توانای بیرکردنەوەیان نییەو مرۆڤە سەرەتاییەکانو منداڵەکانیش بە جۆرێکی تایبەت هەستی پێدەکەن. لەمبارەیەوە هەستی هونەری هیچ بایەخێك بە خۆشی و ناخۆشی بابەتەکە نادا: جا ئەگەر ئەو بابەتە فیلمێك بێت لە فیلمەکانی کاوبۆی، یان ڕۆمانێکی پۆلیسی، یان چەند وێنەیەکی ڕووت، یان پارچە مۆسیقایەکی بێکەڵك بێت، جیاوازیەك نییە.

بەڵام ئەم سۆراخکردنە ڕیشەییە بەردەوام نابێت، چونکە هەموو ئەزموونەکان قبوڵ دەکاو هەموو ئارەزووەکان دەسەلمێنێ: داخۆ ئەو گورزەی کە لە چەندین هەستی هونەریی جۆراوجۆر پێکهاتووە خاوەنی چ خەسڵەتێکی تایبەتە؟ تۆ بڵێی دەربازگەیەکی هاوبەش لەنێوان مرۆڤی عاشق و ئەزمونکەری جوانیو مرۆڤی گەمژەدا هەبێت.. یان لە نێوان ئەو مرۆڤە درندەیەی کە پڕ بە گەروی دەلورێنێ وەك ئەوەی گۆرانییەك بە ئاوازەوە بچڕێ و ئەو شاعیرە ڕەمزییەی کە پێی وایە دانراوەکەی پوختەیەکی سروشتامێزە؟ بەڵێ، بێگومان. بەڵام هەردووکیان هەست بە چێژێکی هونەری دەکەن. بۆیە ئەو بیرۆکەیەی ڤیکتۆر باچ بیرۆکەیەکی گەوهەرییە. بە بڕوای ئەو، وەك دەزانین، پێنج هەڵوێستی بنەڕەتی هەن، دواهەمینیان کە هەڵوێستی ئیستاتیکییە جیاوازە لە چوارەکەی دیکە، چونکە خاوەنی سەربەخۆییەکی قووڵە. ئەو پێی وابوو هەڵوێستی ئیستاتیکی دوو ڕووی هەیە: تێڕامان، کە پشت ئەستوورە بە فیکرو هەستی هونەریی و لەسەر کارلێکردن دامەزراوە. (لە حاڵەتێکی وادا) ئەگەر بڕوا بە گریمانەی دووەم بهێنین، ئەوا هەمان پرسیار لە فۆرمێکی تردا خۆیمان پێشکەش دەکا؛ چونکە سێ شێواز لەئارادا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هونەردا، لەپێناو بەدەستهێنانی هوشیارییەکی هونەریدا:

1-یان دەبێ خەمسارد بین بەرامبەر شتەکان، بێبایەخانە بەختەوەرییەکی پەتی بەرامبەر کاریگەرییان دەربڕین، تەواو وەك ئەو ئارەزومەندانەی کەمبایەخانە، بەڵام بە ڕێزێکی ساختەوە، (تەماشای شتەکان دەکەن).

2-یان دەبێ هەست بە چێژێکی ڕاستەقینە (بەهێز یان لاواز) بکەین بەرامبەر بەرهەمی هونەری. ئەوکات تیشکێك بەسەر شتەکەدا پەخش دەبێ و وەك کوڵکە زێڕینە ڕەنگاوڕەنگی دەکا، ئەمەش خۆی لە خۆیدا باڵابوونێکە لە ئاستی سروشت و ئەو شتەدا. بەمشێوەیە ئەو بەرهەمە بێکەڵك و کەمبایەخە دەبێتە شتێکی جوان و ڕازاوە، دیمەنە خۆڵەمێشییە ناشرینەکە سەرلەنوێ دەبریسکێتەوە، ڕۆمانە ئەڵقە ئەڵقەکەش دەبێتە شتێکی جوان و سەرنجڕاکێش. دەکرێ ئەو کارمەندە هونەرییەی (دەیخەنە نێو ئەم تێڕامانەوە) هەمان هەستی هەبێت بەرامبەر کارەکەی خۆی لە بەرگتێگرتندا، یان ئەو کیژۆڵەیەی کە ئاستێکی دیاریکراوی ڕۆشنبیریی هەیە

بەرامبەر ترازیدیایەکی میللی لە شانۆدا، یان مرۆڤێکی سەرەتایی لە بەرامبەر شوشەیەکی ڕەنگاوڕەنگدا. (واتە) ئەو چێژە تا ئاستێکی زۆر زاتییەو بەندە بە هەواو ئارەزووەکانی ئێمەوە. ڕەنگە پاش چەند هەفتەیەک بێزاربین بەرامبەر ئەو سۆناتەیەی کە ئەمڕۆ کارمان لێدەکا، چونکە کارتێکردنی ئیستاتیکی تەنها لە خودی خۆمانەوە سەرچاوە دەگرێ. ئێمەش لای خۆمانەوە "فەرماندەرکەرو خاوەن سەروەریین لەم بوارە ئیستاتیکییەدا". بەلام هەستکردنمان (بەرامبەر شتەکان) وەک هەستێکی سۆراخکار دەمێنێتەوە.

3-یان دەکرێ لە ڕێگای ئەو تێڕامانەوە هەست بە خۆشنودییەکی ناوەکی بکەین (لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوونبکرێتەوە کە ئەم حاڵەتە جیاوازە لەوانەی پێشوتر لە ڕووی سروشت و ماهیەتەوە)، خۆشنوودییەک کە ئێمە دەیخوازین و لە هونەردا لە دۆخێکی سرکدایە، بە شێوەیەک ئاسان نییە بڵێین چەند گروپێکی هونەریی خاوەن ئەدگاری ئاشکرا هەن: وەک پایەبەرز، ڕۆحسووک، گاڵتەجاڕ.. هتد. ئەو دابەشکردنە جگە لە چەند تایبەتمەندییەکی تایبەت هیچی تر نییە، بە هەمان شێوە پۆلێنکردنەکانی شارل لالۆ بەسەر نۆ گروپدا (بڕوانە: خشتەی ژمارە -1-) و شەش فۆرمەکەی وۆلف (بڕوانە: خشتەی ژمارە -2-) ڕووبەڕووی هەمان ڕەخنە دەبنەوە. چونکە تەنها یەک فۆرمی هەستیاریی هونەریی لەئارادایەو هەموو هەستەکان لە یەک کارلێکردنی پۆزەتیڤانەدا کۆدەبنەوە: کە ئەویش ئاسودەییە. بەلام ئایا ناکرێ بڵێین چەندین کەس هەن لە حاڵەتی تێڕاماندان و ئازاریش دەچێژن، ئارەزوی هونەر دەکەن و ڕەشبینیشن، عاشقی جوانین و دەمارگرژیشن؟ نەخێر ئێمە هەرگیز گومانی لەمجۆرە ناکەین. چونکە ئەو کاتەی لە هونەردا دەروون ئازار دەچێژێ تێڕامان لەئارادا نامێنێ.



ئەلبەتە ئەو هەستە نێگەتیڤانە وەهمی و دەمامکدار دەردەکەون و لە خودی خۆیاندا هەستی ڕووکەشین: ئەوە هەواو ئارەزووی ئەو ئەکتەرانەیە کە بینائاکان لە خودی خۆیان، دەمارگرژ نین بەلام خۆیان وا نیشاندەدەن، بە کورتی هەواو ئارەزووی کەسانێکە کە درۆ لەگەڵ خۆیاندا دەکەن.

کەواتە من کاتێک لە تابلۆیەک ڕادەمێنم: یان خەمساردانە تەماشای دەکەم و هەست بە هیچ هەڵچون و چێژێکی هونەریی ناکەم. یان خۆشحاڵم دەکات، واتە خەمسارییەکەم دەبێتە چێژێک، تا زیاتریش لە تابلۆکە ڕابمێنم ئەو چێژە زیاتر دەبێ. یان هەڵچوونم دەگاتە ئاستی خرۆشان، بە ئەندازەیەک هەست بە دڵڕفێنییەک دەکەم کە دەمگەیەنێتە ئاستی هەستکردن بە هەر شتێکی مومکین، تەنانەت هەستکردن بەخەم و ئازارێکی قووڵیش.

من گوێ بۆ کۆنسێرتی شەشەمی (براند بۆرجۆ) ڕائەدێرم: دەنگی جیاجیای زوڕناکان تێڕامانی من پەرت ناکا کاتێ لەو ڕاخەرە دڕاو و کۆنانەی هۆڵی پەیمانگای مۆسیقا ڕادەمێنم. بەلام لەناکاو، لە تاقە چرکەیەکدا، هەموو شتەکان کۆتاییان دێت.. نە هۆڵ،

نە جەماوەر، نە هیچ شتێکی تر نامێنێ جگە لەو دەنگەی کە ئامادەیی (باخ) بەرجەستە دەکا، ئیدی هەست ناکەم تەنهام.. ئەمە ئەو دیالۆگەیە کە دەمفڕێنێ و لە بوونی دەرەکی دوورم دەخاتەوە.. داخۆ هۆڵەکە چی بەسەرهاتووە؟ لای منەوە کۆتایی پێهاتووە، واتە ماتریالەکان دەچنە دۆخی غەیب بوونەوە.. بینینی مۆسیقاژەنەکان، بیستنی ئامێرەکان، لەگەڵ جوانییەکی باڵاو ڕیشەییدا، دەبنە مۆزێك کە من دەگوێزێتەوە بۆ ژووری خودی خۆم: سەرسامبوون.

واتە ڕاچەنینێك ڕوویداوە: ئەو هەستە مەزنەی لێدەکەرێتەوە. وردتر ئەمە ئەو شتە بوو کە برۆست هەستیپێکرد بە چەند ساتێك لە دوای تەواوبوونی سۆناتەی ڤنتیۆل *Vinteuil*: واتە هەست بە دابەشبوون دەکەین بە دوو مانا؛ لە لایەکەوە هەست بە خۆشی سەقامگیربوون دەکەین کە ئەوپەڕی ڕەزامەندییە، لەلایەکی تریشەوە هەستدەکەین لە جێی خۆمان هەڵکەنراوین، ڕفێنراوین و دوورخراوینەتەوە لە کاروباری ژیان.. بەڵام هەردوو ئەم مانایە لە بنەڕەتدا یەکێکن. چونکە لە دۆخی ئاسودەییدا دەبێ ڕووبەڕووی ئەو داڵغانە ببینەوە کە دووچاری دەبین، واتە حاڵەتی خەیاڵ ڕۆشتن کە وامان لێدەکا هەست بەو شتەی بەرامبەرمان نەکەین، چونکە ئاسودەیی بریتییە لەوپەڕی پڕبوون و موڵکدارێتی، هەروەکو پێشتریش بینیمان قابلی دابەشبوون نیە. تاکەکەس هەندێ جار بە ئەندازەیەك ئاوێزانی ئاسودەیی دەبێ کە خودی خۆی بە شێوەیەکی ڕەها دەبێتە ئاسودەیی، هەرچەندە خۆی هەست بەوە ناکا بەڵام ناشتوانێ هەست بە ئاسودەییەکی نیوەناچڵ بکا. چونکە تێڕامان حاڵەتێکی گشتگیرە بە تایبەتی لەکاتی دەستنیشانکردنیداو دواتر خۆی لە خۆیدا کۆتایی پێدێ. (واتە) هیچ هەستێکی هاوتەریبی قبوڵ نییە، واتە هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی لەسەر خودی خۆی قبوڵ نییە. بە چەند ڕێگایەکی جیاواز ئەو دۆخە جوانە دەبەخشین بە تێڕامانەوە: لەمبارەیەوە، بە بڕوای ژان کلفیچ پارچە مۆسیقای "سرودی ئاسودەیی" هەرگیز توشی ئاسودەییمان ناکا چونکە پێی وایە "هونەرێکی تێکەڵە، هەستی مرۆیی و کۆمەلایەتی و غەیبی لەخۆدەگرێ و، پەیوەندییەکی نەپساوەی بە ژیانەوە هەیە" بەڵام لە هەمان کاتدا حەز بە ڕافیل و فۆرێ دەکا؛ کەسانێکی تر ئاسوودەیی لە *Beatitude* ی فرانکدا دەبیننەوە، کەسانێکیش لە باخ، یان لە ئۆفنباخ، یان لە مۆسیقای پێشانگاکاندا دەیبیننەوە. سروشتی ئەو تێڕامانە خۆی لە خۆیدا جێگیرو نەگۆڕە، ئاسودەییش شێوەیەکە لە پرسە بەڵام لە هەموو پرسەکان زوڵاڵترە؛ چونکە هونەر یان پرسەئاوەرە یان هونەر نییە.

## 2– ئەفراندن

پرۆسەی ئەفراندن پێش هەموو شتێك پرۆسەی لەدایکبوونە: ئەگەر دۆخی لەدایکبوونی مرۆڤێکی زیندوو لە گۆشت و ئێسك لە مندالبوونی مرۆییدا لە ئاکامی ئەو ژانە جەستەییەدا بێت کە هاوکاتە لەگەڵ مندالبوونی، ئەوا ئەفراندن (لە هونەردا) هاوکاتە لەگەڵ ئاسودەییدا، ئاسودەییەك کە تێکەڵە لە دڵتەنگی و گومان و دڵەڕاوکێ وەك سەرەتایەکی خرۆشانی مرۆڤ بەوەی سەرکەوتنێکی بەدەستهێناوە. برگسۆن لە یەکێك لە لاپەڕەکانی "وزەی ڕۆحیدا" وتویەتی: "ئاسودەیی هەمیشە پێمان دەڵێ ژیان لە چنگکەوتنی زەمینەیەکی تازەدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە؛ لە هەر شوێنێك ئاسودەیی هەبوو ئەفراندنیش هەیە. بە ئەندازەی دەوڵەمەندیی ئەفراندن ئاسودەییش قووڵە". ئەگەر ئەم فرێزە هەڵگێڕینەوە ئەوا دەڵێین: لەهەر شوێنێك

ئەفراندن هەبوو ئاسودەییش هەیە، تەنانەت لای ئەو کەسە ڕۆمانسیانەی کە لەوپەڕی خرۆشاندان و لای ڕەشبینەکان و بێئومێدەکانیش ئاسودەییەکی پەنهان دەمێنێتەوە، یان هەروەکو (جید) دەربارەی شۆپان دەڵێ: "لە کاتی دڵتەنگیداو لە پشت ئەو دڵتەنگییەوە، دواجار شۆپان دەگاتە ئاسودەیی". بتهۆفن ڕاشکاوانەتر جۆرە ئاوازێکی ناونابوو گۆرانیە ئاسودەکان *Durch Leiden Freude*. لە بەرامبەر بیرۆکەکەی ئەلفرید دی مۆسێ-شدا کە دەڵێ: "هیچ شتێك وەك ئازارە مەزنەکان پاکمان ناکاتەوە.. جوانترین گۆرانیش ئەو گۆرانیانەن کە بەناو بێئومێدیدا قووڵ دەبنەوە" دێرە شیعرێکی کیتس ئۆفەر هەیە کە دەڵێ: "شتە جوانەکان دڵرفێنی تاهەتایین".

کەواتە ئاسودەیی لای هەموان وەك یەکە. سەرسامبوونیش لای هەموان لە دۆخێکی سرکدا دەردەکەوێ، جا ئەگەر وێنای "کۆیلە زامدارەکە" بکەین یان مەرگی ئیما بوڤاری یان وێنای "ئاسودەییەك لە ئاسمانەوە". ئاسودەیی بەشێوەیەکی سروشتی لە ئەفراندنەوە لەدایك دەبێ. هەموو ئەفراندنێکیش پێویستی بە جۆرێك لە سەرسامبوون هەیە، جا ئەگەر ناوەڕۆکەکەی هەرشتێك بێت. ئەو کەسەیشی کە ئەگەری ئەفراندنێکمان پێدەڵێ بەبێ ئاسودەیی، ئەوە نکوڵی لەوە دەکا کە لێکچوونێکی ڕەها هەبێت لەنێوان سروشی ئیستاتیکی و سروشی ئاینی.

لە "ڕۆژمێری شاعیرێکدا" هاتووە: "ئاسوودەبوون لەکاتی سروشدا ئەو دۆخی مەستیەیە کە زۆر بەرزترە لەو مەستیە جەستەییەی کە لەکاتی ئاوێزانی ئافرەتێکدا هەستپێدەکەین. چێژی ڕۆح زیاتر قابلی مانەوەیە.. سەرسامبوونی مەعنەویش بالاترە لە سەرسامبوونی فیزیکی". ئەو ئاسودەییەی لە هونەرەوە سەرچاوە دەگرێ کەمتر نیە لەو ئاسودەییەی کە لە ئاینەوە سەرچاوە دەگرێ. لێرەدا با ئاوڕێك لە دۆلاکراوا بدەینەوە کە خاوەنی "سایکۆلۆژیای هونەر"ەو کتێبێکی زۆر کلاسیکی و جێگیرە لەنێو هەموو ئەو کتێبانەی کە لە فەرەنسا دەرچوون: ئەو بڕوای وایە "نزیکییەك لەنێوان سروشی ئاینی و سروشی هونەریدا هەیە" کە پەیوەستە بە هاوسەنگیی هاوبەشی نێوان "هەستکردن بە کەینونە لەنێو دڵی بوونەوەر" و ئەو هەستکردنەدا کە "ئێمە هەموو شتێکین" یان "حەتمیەتی ئەوەی کە ئێمە هیچ نین"، "کاریگەریی هەستکردن بە مەزنی و کاریگەریی بێداری لە یەك کاتدا". واتە ئاسودەیی لە یەك کاتدا سڕبوون و چالاکییەکی فراوانیشە: موڵکداریێتی و لەدەستدانیشە، کامڵبوون و هەستکردنە بە کەموکورتیش، پڕبوون و بۆشاییشە.. یاریکردنە لەسەر پەتی ئەو دژبوونانەی کە لە هەناویدا هەیە. ئاسودەیی لە هونەردا هەروەکو لە ئایندا سەرکەوتنە بەسەر زەمەندا، تا هەتایی کردنی چرکەیە، تێپەڕاندنی شتە کاتیەکانە، هەڵکەندنی (خودە) لەو دۆخە ماتریالییەی کە لە ژیانی دەرەکیدا هەیە. شاعیران و پیاوانی ئاینی هەمیشە یەك بانگەواز دووبارە دەکەنەوە: "ئەی زەمەن! فڕینت ڕاگرە".

ئەفراندنی هونەری، ئەو پراکتیسە پڕ بەهایەی سەرزەمینە کە باسکاڵ لە یاداشتەکانیدا باسی لێوە دەکا، لە ڕێگایەوە دەگاتە ئەو ئاسودەییە، یان ئەو فرمێسکانە، فرمێسکی شادمانی، شادمانی تاهەتایی. سۆریۆ یەکێتی نێوان تەجەللای ئاینی و سروشی هونەریی لە سەرنجێکدا کورت دەکاتەوە کە دەڵێ: "تەنها هونەرە دەتوانێ تەعبیر لەو شتە بکا کە مەحاڵە تەعبیری لێبکرێ".

فاکتەرەکانی ئەفراندن: "هونەرمەندەکان لایان گرنگە باوەڕ بێنن بە ختورەی لەناکاو، یان ئەو

شتەی پێیدەوترێ ئیلهام". لە ڕاستیدا هەروەکو نیچە-ش وتوویەتی "خەیاڵدانی هونەرمەندی گەورە بەردەوام شتی گەورە، مامناوەندی، یان خراپ بەرهەمدێنێ. بەڵام بەهرەی (بەرهەمهێنانی) ئامانجی دوا حوکم دەپوکێتەوە، دادەڕمێ، یان ئاوێزان دەبێ". بەڵام ئەم پوکانەوەو داڕمان و ئاوێزانبوونە چۆن ڕوودەدا؟ دواتر لە گەڕانەوەدا بۆ هێزی دۆلاکراوا هەوڵدەدەین وەڵامێکی خێرا لەمبارەیەوە گەڵاڵە بکەین، هەرچەندە بە بڕوای ئێمە چارەسەرکردنی مەحاڵە. هەموو ڕەچەتەو تاقیگاکان بێهودەن لە ئەفراندنی بەرهەمێکی ئەوتۆدا ئەگەر ئەو فاکتەرە بەرایییە، ئەو خورپەیەی لە ناخەوە دێت، لەئارادا نەبێت کە پێی دەڵێن سروش- ئیلهام. بەڵام پێویستە خۆمان بەدووربگرین لە سەفسەتەی زۆرو زەوەندی بلیمەتەکان، وەك ئەو قسەیەی لامارتین: "من بیرناکەمەوە، فکرم لە بری خۆم بیردەکاتەوە" یان وەك سارتینی وتەنی "سۆناتەی شەیتان"ی لە خەوندا داناوە، یان دیکارت گوایا وێنەی کۆجیتۆ-ی لە خەوندا بینیوە، یاخود ئەو قسەیەی گۆتە کە وتویەتی لە دانانی ڕۆمانی "ئازارەکانی ڤارتەر"دا هیچی نەکردووە جگە لە گوێهەڵدێران بۆ دەنگی زاتی خۆی. بە هەمان شێوە جۆرج ساند دەربارەی شۆبان وتویەتی: "ئەفراندن لای ئەو خۆڕسك و سەرسوڕهێنەر بوو، بێئەوەی هەوڵی بۆ دابێت یان بەدوایدا گەڕابێت خۆی لەناکاو بە شێوەیەکی مەزن پەیدابووە". هەروەها کۆلریدج بڕوای وابووە کە لە نوسینی*Khubla Khan* دا لە خەودا بووە وەك ئەوەی سیحری لێکرابێت. ژمارەیەکی زۆریش لە نوسەران پشتگیریی ئەو ئیعترافەی شاتۆبریان دەکەن کە وتویەتی: "لە ڕۆژێکی دڵڕفێندا ڕادەکشێم، بە تەواوی پێڵووم لێکدەنێم و، هیچ کردەوەیەك ناکەم، وازدێنم کردەوەکان خۆیان بە شاشەی زەینمدا بگوزەرێن. خۆم لە هەموو دەستێوەردانێك دەپارێزم، لە ناخی خۆمەوە چاودێری شتەکان دەکەم بۆئەوەی خۆیان خۆیان دروستبکەن.. ئەوە خەونە.. بێئاگاییە".

ڕەنگە پۆل ڤالێری یەکەمین داهێنەر بوبێت کە بە شێوەیەکی پتەو و دوور لە جوینەوە باسی پرۆسەی ئەفراندنی هونەریی کردبێ. لە پێشەکی میتۆدی لیونار دافنشی-دا وتویەتی: "خواوەند نیعمەتی دێڕی یەکەمی شیعرمان پێدەبەخشێ بەبێ هیچ بەرامبەرێك: دواتر پێویستە لەسەر ئێمە دێڕی دووەم دابنێین"، ئەو دێڕەی کە "پێویستە لەگەڵ ئەوی تردا بگونجێ و، شایستەی برا گەورە بەهێزەکەی بێت". ئالان لە دەنگدانەوەیەکدا وەڵامدەداتەوە: "یاسای باڵای داهێنانی مرۆیی بریتیە لەوەی کە هیچ داهێنانێك نایەتەگۆڕێ بەبێ کۆشش". بەڵام چۆن بە شێوازێکی بەسوود کاربکەین؟ فەیلەسوف و زاناکان وەڵامدەدەنەوە بەوەی کە پێویستە بیربکەنەوە، بەڵام هونەرمەندەکان پێویستە زیاتر هەستبکەن. ڕەنگە ئێمە پڕبین لە هەست و سۆزو نەشتوانین تەعبیر لە هیچ شتێك بکەین. چونکە هاوزەمان لەگەڵ ئەوەی پێویستە بە قووڵی هەستبکەین، پێویستە بە ڕوونیش هەستبکەین، چونکە هیچ هونەرێك نایەتەدی ئەگەر پەیوەندییەکی پتەو (لە نێوان پێکهاتەکانیدا) لە ئارادا نەبێت. "ئەگەر وڕێنەیەکیش لە هونەردا هەبێت، ئەوە هەمیشە وڕێنەیەکی دەستەمۆکراوە". ڕەنگە ئەفراندنی خۆڕسك هەر لە منداڵییەوە لە مرۆڤدا بتەقێتەوە: مۆزار لە سێ ساڵیدا، هایدن لە چوار ساڵیدا، ماندلسن لە پێنج ساڵیدا، ڕافایل لە هەشت ساڵیدا، جیوتۆ و ڤان دیك لە دە ساڵیدا و شوبەرت و هاندل و ڤیبەر لە دوانزە ساڵیداو.. هتد. دواجار کارکردن هێندە لق و چڵی لێدەبێتەوە، تا ئەو ئەندازەیەی دەرفەتێك نامێنێتەوە بۆئەوەی بە وردی لەبارەیەوە بکۆڵینەوە. (بۆ نمونە) بیهێنەرە بەرچاوت: میلتۆن و ڕوسێنی لەکاتی داهێناندا

ڕادەکشان، مۆزار هەنگاوی بڵاوی دەنا، بۆدلێرو ڤێرلین پەنایان دەبرد بۆ مادە بێهۆشکەرەکان، بەلزاك پەنای دەبرد بۆ قاوە، برایانی گۆنکۆر تا کاتێکی درەنگ شەونخونیان دەکرد، شیلەرو گریتری-ش قاچیان بە سەهۆڵاو دەشت!.

پۆڵ سۆریو لە کتێبی "تیۆری داهێنان"دا دەڵێ: "لەپێناو دۆزینەوەدا، پێویستە گۆشەگیرانە بیربکەینەوە"، بەڵام نیوتن لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە چۆن توانیویەتی تیۆری کێشکردن بدۆزێتەوە وتویەتی: "لە ڕێگای بیرکردنەوەی بەردەوامەوە توانیومە". کەواتە ئایا بە پشتبەستن بەم قسانە دەتوانین خەسڵەت یان فاکتەرە گشتیەکانی ئەفراندن بدۆزینەوە؟ هنری دۆلاکراوا ئاماژەی بە نۆ فاکتەر لەو فاکتەرانە داوە.. هەرچی فاکتەرە گشتیەکانە سیانن: ڕەسەنایەتی (بەوەی کە مرۆڤ لە خۆی بچێت و لە کەس نەچێ)، خۆڕسکی یان عەفەویەت (بەوەی کە مرۆڤ ئەو شتانە ببینێ کە کەس نەیبینیون، گومان لە بینینی واقع بکا، چونکە هونەر پێویستە چالاکیەکی کودەتاگێڕ بێت)، (سێیەمیشیان) بەرهەمهێنان. بەلام سێ مەرجە سەرەکیەکەی ئەفراندن، ئەو مەرجانەی کە مەحاڵە هیچ داهێنانێك بێ ئەوان ڕوویدات بریتین لە: بایەخدان بەوەی دروستی دەکەین، خەیاڵدانێکی داهێنەرانە (وەك هێزێك بۆ گۆڕینی واقع) هەروەکو لایلۆر-یش دەڵێ: "پێویستە واقع ببینم وەك ئەوەی خۆم لە ئارادا نەبم"، خەیاڵدانێکی لاوەکی، وەك لایمنز دەڵێ (چونکە خەیاڵدانی یەکەم ناتوانێ گەرمایی بیرۆکەکە بۆ ماوەیەکی پێویست بهێڵێتەوە تا ئەندازەیەکی ڕاستەوخۆی ئەفراندن) بۆ هێشتنەوەی کاریگەرییەکی بەردەوام و ڕێکخراو کە لە هەموو ئەزموونەکانەوە سەرچاوە دەگرن و هاوتەریبن لەگەڵ فراوانبوونی ناوەڕۆکی هۆشیاری یان ناوەڕۆکی ویژدان. بەڵام ئەو سێ فۆرمەی بەرهەمهێنان کە دۆلاکراوا

تایبەتمەندییان پێدەبەخشێ بریتین لە: توانای ئامادەکردنی (بیرۆکە یان خەیاڵ) *Actualisation* بەشێوەیەکی سەخت و لەناکاو، جوینەوەی نائاگا یان نیمچە نائاگای کارەکانی ئاگایی، بەرهەمهێنانی ئەقڵئامێز (تێفکرین). لەم بوارەدا پێویستە باس لە "فەلسەفەی نوسین"ی ئەدگار ئالان پۆ بکەین کە یەکێکە لە فەلسەفە بەناوبانگەکان، ئالان پۆ لەوێدا دێڕ بە دێڕی دەزگای ڕاستەقینەی قەسیدەکەی (قەلەڕەش) لە یەکدەترازێنێ و شییان دەکاتەوە: "وەك ئەوەی نوسەر وەك زانایەك یان ئەندازیارێك بەرهەمەکەی خۆی بەپێی ڕەچەتە سۆزداری و فێڵە ئەدەبیەکان دروستبکا". بلیمەتییش پرۆسەیەکی ئەقڵانییە لە داهاتودا دەردەکەوێ نەك لاپەڕەیەکی ڕاستەقینەی ئەفراندن چونکە ئەقڵ لە خودی هونەردا ئامادەیە. هەروەها ڕێکخستنی ماتریالیانە (پرۆسەیەکە) لە تەکنیکەوە سەرچاوە دەگرێ. سایکۆلۆژیای ئەفراندنی هونەری بە تاقە نیگایەك دەتوانێ شارەزایی دەربارەی ویژدانی ئەفرێنەر بەدەستبێنێ، بێنەوەی هەوڵی پارچە پارچەکردنی پێکهاتەی بەرهەمەکە بدا، چونکە لەو شوێنەوە کە خۆراکسازی (سنعەتسازی) دەستپێدەکا جوانیی کۆتایی دێت تەنانەت گەر کردەیەکی فریشتەییانەش بێت.

### 3-نواندن

تا ئەم دواییانەش ئیستاتیکا بڕیاری ئەوەی نەدابوو کە لە ئەنجامدانی بەرهەمی هونەریدا (فاکتەری) کات لەبەرچاوبگرێ. خاتو جیزیل برێلێ توانیویەتی لە ڕێگای کارە مۆدێرنەکانیەوە کە پشتئەستوورن بە داهێنانی مۆسیقی بەشداریی لەم بوارەدا بکا. هەروەها کارەکانی میکال دوفرین ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە لە چەسپاندنی سێکوچکەی تێڕامان، ئەفراندن، بەشداریکردن. لە شانۆی کلاسیکیدا زەینمان بۆ لای سەرۆك تیپ دەچوو، کە وەزیفە

سەرەکیەکەی بریتی بوو لە ڕۆشنکردنەوەی بابەتەکە، لەپێناو گەیاندنی پەیامی ئەفرێنەر (واتە شانۆنووس لە دۆخی ئێستادا) بۆ جەماوەر، تەنانەت ئەوانەیشی کە لێی دووربوون و مانای شانۆنامەکەیان لا ئاشکرا نەبوو. بەڵام ئایا ئەکتەریش (بە ئەندازەی سەرلەنوێ وردکردنەوەی بەرهەمی هونەری) ڕۆڵی ئەفرێنەر نابینێ؟ ئایا ئەکتەر خۆیشی ڕۆڵی (وەرگرێك) نابینێ کە وەك تاکەکەسێ لە بەرهەمەکە ڕادەمێنێ؟ داخۆ سایکۆلۆجیای ئەکتەر دەتوانێ چ ڕۆڵێك بگێڕێ بۆ دەوڵەمەندکردنی مەعریفەی ویژدانی ئیستاتیکی بە توخمێکی نوێ؟ ئاخۆ دەکرێ جیدکۆنگ سەرلەنوێ بیتهۆڤن بنیات بنێتەوە، وەك چۆن جۆڤێ توانی ئارتۆف و کریستیان بیرار-یش توانی جیرۆدۆ سەرلەنوێ بنیات بنێتەوە. دەتوانین بڵێین لەم پرۆسەی وەرگێڕانانەدا ڕەسەنایەتییەکی ئەوتۆ هەیە، کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی شێوازی نواندن، ئەفراندن وەك خۆی بە کاملی دەهێڵێتەوە. بە دیوەکەی تردا کەسی وێنەکێش یان ئەکتەر یان پیانۆژەن خۆیان لەگەڵ ئامێرەکانی تۆمارکردندا دەبیننەوە، ئەو ئامێرانەی کە تەنها ئارەزوی ئەوان تۆماردەکەن و هیچی تر: لە دۆخێکی لەمجۆرەشدا هیچ شتێك بۆ سایکۆلۆژیای هونەر زیادناکەن. لێرەوە شنابیل یان باخۆس تەنها لە هەوڵی (دیدار)ی بیتهۆڤن-دان، هەروەها مارشا یان لۆدو تەنها لە هەوڵی (بەرهەمهێنان)ی مۆلیێر-دان. ئەڵبەتە کارل گرۆس و دواتر مۆلەر فرێنفلز جیاوازییان لە نێوان سایکۆلۆژیای "هاوڕێی گەمە" یان مێتسبلر لەلایەك و سایکۆلۆژیای بینەر یان ***Zuschauer*** و ***Einfublung*** لەلایەکی ترەوە دەکرد، یان (جیاوازی نێوان تێڕامانی کارا لەگەڵ بەتاڵکردنەوەی خودی ئاکتڤداو تێڕامانی بەکاوەخۆ لەگەڵ لەیادکردنی خودی نێگەتیڤدا. ئەو نموونانەی کە فرینفلز دەیهێنێتەوە ئەم بوارە ڕوناك دەکاتەوە بەو مەرجەی وشەی بەشداریکەر *Participant* ببێتە وشەی ئەکتەری گەیەنەر *Interprete*. "من بەتەواوی ئەوە لەیاد دەکەم کە لەسەر تەختی شانۆم، بوونی کەسایەتی خۆم بە تەواوی لەیاد دەکەم.

تەنها هەست بە هەست و سۆزی کەسایەتی ڕۆمانەکە دەکەم. هەندێ جار لەگەڵ ئۆتێللو وڕێنە دەکەم و، هەندێ جاریش لەگەڵ دێدەمۆنە مووچڕکم پێدادێت، هەندێ جاریش دەمەوێ بە ئەسهێنی بیاندوێنم. خێرا لە دۆخێکەوە دەچمە سەر دۆخێکی تر، دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردنی خۆم لەدەست دەدەم؛ بە تایبەتی لە شانۆگەریە هاوچەرخەکاندا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دواجار تێبینیم کرد کە لە (شالیر)دا لە ترساندا پەنام بردووە بۆ یەکێك لە هاوڕێ کچەکانم".

بە پێچەوانەوە ئەو بینەرە لەسەرخۆیەی کە سەرقاڵی تێڕامانەو بەڵام بە ساردییەوە تەماشا دەکا دەڵێ: "من لەسەر کورسیەکەم لە شانۆگەریەکەدا دانیشتووم وەك ئەوەی لە بەرامبەر تابلۆیەکدا دانیشتبم؛ هەموو چرکەیەك دەزانم ئەوەی کە دەیبینم ڕاستی نییە. هیچ ساتێك ئەوە لەیاد ناکەم کە من لە هۆڵێکدا دانیشتووم. ئەڵبەتە هەست بە سۆزی کەسایەتی ڕۆمان و ئارەزووەکانیان دەکەم. بەڵام تەنها وەك بابەتێك بۆ هەستی ئیستاتیکی تایبەتی خۆم، واتە هەست بە سۆزی هاوبەش و بگرە ئەودیوی هەست و سۆزی هاوبەشیش ناکەم. بەهرەی حوکمدان لای من هەمیشە بێدارو ئاشکرایە، هەستەکانم هەمیشە بە ئاگان. هەرگیز لەگەڵ ڕەوتەکەدا ناڕۆم و ئەگەر بشڕۆم ئەوا نیگەرانم دەکا، چونکە هونەر ئەوکاتە دەستپێدەکا کە چی ***Was*** لە یاددەکەین و تەنها گرنگی بە چۆن ***Wie*** دەدەین".

کەسی بەشداریکەر کەسێکە وەك دیونیزی، کە بزوێنەرە، کاری تێدەکرێ، سەرەتاییە، لە جیهانی گەمەیەکی کارای ئاکتڤدا دەژی. بەڵام ئەو کەسەی

ڕادەمێنێ، بە پێچەوانەوە، خودێکی پەتییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئایا ئەکتەری گەورە، لەیەك کاتدا ئەقڵانی و کارتێکراویش نییە، هەستیارو هەست بەخشیش نییە، ساردو لەسەرپێش نییە؟

"ئەمەیە ئەو جیاوازییەی کە لە پەیپێبردنی ئیستاتیکیدا هەیە: ڕادەمێنین و بەشداریدەکەین.. بەڵام هەرگیز بەشدارییەکەمان گشتگیر نییە". بینەری چێژوەرگریش لە نێوان هەڵوێستی باوەڕدارو هەڵوێستی بێباوەڕدا لەو کەش و سروتەدا هەڵوێستی خۆی وەردەگرێ. بە بڕوای یەکەمیان هەموو سروتێك مانای خۆی هەیە، بە بڕوای دووەمیش تەنها جوولەیەکی بێمانایە. با ئێمە دوور لە بۆچوونێکی دۆفرین ئەوە بڵێین کە کەسێك بەڕاستی لە شتێك ڕادەمێنێ لە ئیماندارەوە نزیکە نەك لە بێ ئیمان، وەك ئەو داهێنەرەی لە بواری نواندنو دەرهێنانو سەماو مۆسیقاو وێنەدا سروشی بۆ دێ. یان وەك ئەو عاشقە ڕاستەقینەیەی ئاواز کە بە بیستنی لویس ئارمسترۆنگ یان شۆنبرگ لە ڕووی مەعنەوی و جەستەییەوە تووشی حاڵەتێك دەبێ کە زیاتر لە حاڵەتی ئیستاتیکای نارەزوومەندە ئاساییەکانەوە نزیکترە کە بەزۆر لەخۆکردن بایەخ بە شتێك دەدەن. باشتر وایە (کاری هونەری) مرۆڤ ڕاپێچ بکا بۆ لای خۆی. چونکە جەماوەری کەشخە جەماوەرێکە زۆرجار لەگەڵ کاری هونەریدا کارلێك ناکا، خاوەنی فۆرمێکی سەیرو ناوەڕۆکێکی بەتاڵە. لەم چوارچێوەیەدا خراپترین ئەکتەر ئەو کەسەیە کە ڕۆڵی خۆی وەك ڕۆڵی ڕۆژی یەکشەممە دەبینێ، یان کچی ئەو خێزانەی کە لەنێو بازنەی خزم و کەسوکارەکانیدا ناچار دەبێ ناسکی و جوانیی خۆی دەربخا؛ بە بەراورد لەگەڵ ئەو پیانۆژەنە بچکۆلەیەی کە خاوەنی "پەروەردەیەکی ئەورووپی"یە لای ڕۆمان گاری، کە تەنها بۆ مۆسیقاکەی دەژی، بەم شێوەیەش دەکرێ وێنای ئەکتەری ڕاستەقینە بکەین.

لێرەوە لە هەرسێ ساتە سایکۆلۆجیەکەی هونەردا، ئەو دۆخە ئیستاتیکییەی کە چەندین جار بە شێوەیەکی حەتمی ڕووبەڕووی دەبینەوە بریتیە لە ئاسودەیی، دۆخی دواتریش ئەو دۆخی هەستکردن بە خۆشیەیە کە هەریەك لە تێڕامان و ئەفراندن و نواندن پەیوەستن پێوەی.

دیدرۆ دەربارەی ئەکتەری کۆمێدی دەیوت: پێویستە کارتێنەکردنی ڕەها خەسڵەتی هەموو ئەکتەرێکی مەزن بێت؛ هەروەها ئیگۆر ستراڤنسکی لە کتێبی شاعیریەتی مۆسیقیدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە خەسڵەتی زاڵ لە مۆسیقاژەن بریتیە لەوەی کە دەچێتە ژێر کاریگەرییەوە؛ ڤالێری-ش زۆرجار دەیوت: "حەماسەت دۆخێکی سایکۆلۆژی نوسەر نییە".

بەڵام داخۆ ئەمانە سێ فرێزی ئینشایی نین کە خاوەنی دەربڕینێکی ناسك و تەمومژاوین و سەر بە قوتابخانەیەکی باڵان، یان داخۆ سێ بانگەشە نین؟.. ئێمەش وەك ستاندال بڕوامان وایە کە "کەسانێك هەن حەزیان لە مۆسیقای خراپەو، لە هەمان کاتیشدا زەوقیان جوانترە لەو حەکیمانەی کە بە شێوەیەکی ئەقڵانی و میانڕەوانە مۆسیقایان خۆش دەوێ، ئەمەش کاملترین حوکمە کە تا ئێستا لەم بوارەدا خرابێتەڕوو".

ئاسوودەیی مانای ئامادەیی حەتمیی هونەر دەگەیەنێ، بەڵام ڕەنگە دەسبەجێ نارەزاییەك لە زەینی ئەو کەسانەدا دروست ببێ کە فیلمی خەمبارو ڕۆمانی ڕەشبینی و گۆرانیی بێئومێدییان حەزلێیە، یان ئەو کارە میللییەی کە تیایدا مارگۆی دەگری".

ئایا باشتر نیە بڵێین "سەرسامبوون" لەبری ئەوەی بڵێین "ئاسودەیی"؟ داخۆ بۆچی سایکۆلۆجیای هونەر هەر دەبێ بەرەو سروش ڕاپێچمان بکا، مەحاڵە فیکری مرۆیی لە بەردەم

کارێکی سەرکەتودا هەست بە خەم و پەژارە بکا. ئەگەر وەك *Erostrate* نەبین کە هەست بە لەزەتێکی ڕاستەقینەو خەمۆك دەکا، ئەوا ناتوانین بەرامبەر بریسکانەوەی کارێکی مەزن خەمبار بین. بێئومێدی لای هەندێ لەو کەسانەی کە چوونەتە ژێر باری سۆزەوە بێئومێدییەکی ڕواڵەتییە؛ ئەگەر ڕۆچینە ناو قولاییەکان ئەوا ئاسودەیی لە دووتوێی هەموو دەسکەوتەکاندا بەدیدەکەین، تەنانەت ئەوانەش کە بابەتەکانیان تراژیدییە. سەدەیەك لەمەوبەر ئاد هانزلیك دەپیرسی: "کەس لە توانایدا نییە ڕووبەڕووی ژیان ببێتەوە، ئەگەر "نوێژی مردوو" و "کەژاوەی بەخاکسپاردن" و پارچە مۆسیقا شیوەن ئاساکان خەم و خەفەت لە دەروونماندا بچێنن؟"بەلام "با بەرهەمێکی مۆسیقیی ڕاستەقینە (یان هەر بەرهەمێکی تر) بە دروچاوی ڕۆشن و پڕ لە جوانییەوە لێمان بڕوانێ، ئەوسا هەست دەکەین بە جوانی خۆی دیلمان دەکات، تەنانەت گەر بابەتەکەی لە کۆی ئازارەکانی جیهانیشەوە سەرچاوەی گرتبێ".

ئەو تۆ گرووپە ئیستاتیکییەی کە شارل لالۆ لە کتێبی "بنەما ئیستاتیکیەکان" یان "ڕەگەزە ئیستاتیکیەکان"دا نمایشی کردوون. (پوختەیەك دەربارەی فەلسەفە-*1925*).

**خشتەی (*1*)**

| بەهرە | هارمۆنی | | |
|---|---|---|---|
| | بەمولککراو | خواستراو | ونبوو |
| هێزی تێکەیشتن | جوان | پایەبەرز | دلگیر |
| هێزی کاروکردار | مەزن | کارەساتبار | کۆمیدی |
| هێزی هەستیاری | ڕۆح سووك | تراژیدی | گالتەجاڕ |

شەش بەها ئیستاتیکیە سەرەکیەکە، وەك ئەوەی (ۆلف) ئاماژەی بۆ کردووە:

**خشتەی (*2*)**

| بەها پۆزەتیڤەکان | بەها بەرامبەرەکان |
|---|---|
| پایەبەرز | گالتەجاڕ |
| جوان | ناشرین |
| ڕۆح سووك | کۆمیدی |

## سەرچاوە


*دنی هویسمان، سیکولوجیة الفن-علم الجمال، ت: ظافر الحسن، (بیروت: منشورات عویدات، 1983)، 128- 151.*

# چۆن بووم بە شاعیر

■ مارگرێت ئاتوود

● و. لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد


مارگرێت ئاتوود

## لە بارەی نووسەرەوە

مارگرێت ئاتوود ژنە نووسەرێکی ناوداری کەنەدایییە، ساڵی 1939 لە شاری (ئانتاریو) لەدایك بوە، زۆربەی سەردەمی منداڵی لەناو سروشتی خۆڕسك و سامناکی کەنەدادا بەسەربردووە، باوکی لە ساڵێکدا هەشت مانگی لەناو جەنگەڵەکاندا خەریکی لێکۆڵینەوە بوە دەربارەی مێروەکان و، لەو ماوەیەدا خێزانەکەی لە کوختێکدا دەژیا بە وەجاخێك و چەند چرایەکی نەوتیەوە. لە جەنگەڵێکدا کە ورچ و گورگ و کەڵەکێوی و لون (جۆرە باڵندەیەکە)ی تیا دەژیا. ئەم جۆرە ژیانە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئایندەی مارگریت دانا و، تاقە هۆی کات بەسەربردنی خوێندنەوەی کتێب بوو. هەر لە منداڵیشەوە دەستی بە نووسین کرد، ئەگەرچی یەکێك لە هاوڕێکانی دایکی زۆری هانداوە بۆ نووسین بەڵام باوك و دایکی وانەبوون و حەزیان دەکرد کچەکەیان ڕوەك ناسێك دەربچێت و نەیاندەویست نووسین بکاتە پیشەو لە برساندا بمرێت. ئاتوود ساڵی 1961 بڕوانامەی ئەدەبیاتی ئینگلیزی لە کۆلیژی ڤیکتۆریا لە زانکۆی تورینتو وەرگرت، پاشان بڕوانامەی پسپۆڕی باڵای لە کۆلیژی روکلیف لە کامبرج وەرگرت کە دەکەوێتە ویلایەتی ماساچوستەوە.

ئاتوود لە دیوانە شیعرییە بەراییەکانیدا کە سالآنی 1961–1964–1968 بڵاوی کردنەوە لە کردارەکانی مرۆڤ قووڵ دەبێتەوە، خۆشیی لە سروشت دێت و مادیەت مەحکووم دەکات.

بەرهەمەکانی بەوە ناویان دەرکردوە کە بەرگری لە فیمینیزم و ناسیونالیزمی کەنەدایی دەکات.

ئاتوود لەگەڵ گریم گیبسون Greame Gibsonدا کە وەك خۆی نووسەرە، بوە هاوسەرو سێ منداڵی گەورەو دوو پشیلەیان هەیە. ئێستا لەگەڵ کچەکەیاندا جیس Jess لە تورنتو دەژین.

ئەگەرچی ئاتوود لە کەنەدا گەورەبوەو ئێستایش هەر لەوێ دەژی لە زۆر شاری تری دنیادا ژیاوە، لە کەنەدادا وەك ئوتاوا، ئانتاریو، مونتراڵ، ئادمونتون، ئالیستون و ڤنکوور. لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا لە شاری بوستن ماساچوست و ولایەتی ئالا باما (خواروی خۆرهەڵاتی وڵاتە یەکگرتوەکان) ژیاوە، هەروەها لە ئینگلتەرە، فەرەنسا، ئیتالیا و ئەڵمانیاشدا ژیاوە. ئێستا مامۆستای زمانی ئینگلیزیە لە زانکۆی بریتشی کۆلۆمبیا لە ڤنکور، هەروەها لە زانکۆی سیرجورج ویلیامز مونتراڵ زمانی ئینگلیزی وتۆتەوەو، لە زانکۆی ئالاباماییشدا کورسی شانازی هونەرە جوانەکانی هەبوە. لە سالآنی 1981–1982 سەرۆکی یەکێتی نووسەران و لە سالآنی 1984–1986 سەرۆکی PENی کەنەدا بوە.

شێوەیەکی نادیار لەخۆ دەگرێت، وەلێ بەهەرحاڵ دەمەوێت پێتان بڵێم کە کەی و چۆن بوومە شاعیر.

تازەگی راپۆرتێکم لەبارەی کۆمەڵە نووسەرێکەوە خوێندەوە، راپۆرتەکە دەیویست ئەوە بسەلمێنێت کە نووسەران لە تەمەنێکی تایبەتیاندا هەوڵدەدەن ژیانی خۆیان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لەگەڵ چیرۆکەکانیاندا تێکەڵ بکەن و، لەو رێگایەوە چیرۆکەکانی خۆیان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. ئەگەرچی ئەمە لە تایبەتمەندیەکانی تەمەنی ئێمەیە کە ئەگەر چیرۆکێکت نووسی هەموو وای بیر لێدەکەنەوە کە کەسەکان و رووداوەکان بە هەندێك گۆرینەوە بەشێکن لە ژیانی خۆت. ئەگەر ژیاننامەی خۆت بنووسیت هەموو وای بۆ دەچن کە درۆگەلێکیان لەگەڵدا دەکەیت، رەنگە ئەمە بۆ شاعیرەکان راستی تیابێت، وەك ئەفلاتون دەڵێت: "دەبێت شاعیر لە کۆمارە یوتۆپیاکەیدا نەبێت" چونکە شاعیر درۆزنەو من کە خۆم شاعیرم لەم قسەیە داکۆکی دەکەم و بە راستی دەزانم، تەواو لەوە دڵنیابن کە شاعیرەکان لە هیچ بابەتێکدا بە ئەندازەی بابەتی ژیانی شەخسی خۆیان درۆ ناکەن. من خۆم شاعیرێك دەناسم کە پێنج جار ژیاننامەی خۆی نووسیوە کە هیچیان لەویتر ناچێت و هیچیشیان راست نین، هەڵبەتە من کە رۆماننووسیشم لەوەی کە شاعیرم راستگۆترم، بەڵام لەبەرئەوەی کە شاعیر درۆزنە چۆن دەتوانن بروا بەم قسەیەی دواییم بکەن؟ وا ئێستایش وەك شاعیرێك باسی ژیانی خۆمتان بۆ دەکەم.

**مارگریت ئاتوود لە بارەی چۆنێتی بونی بە شاعیرەوە بەم شێوەیەی خوارەوە دەدوێت:**

دەمەوێت ئەمڕۆ لەبارەی پەیوەندی نێوان ژیانی خۆم لەگەڵ شیعرو شاعیریدا باس بکەم، هەرچەندە پێشەکی ئەوە دەزانم کە گێرانەوەی ئەو پەیوەندیە

سەردەمانێك من قژێکی زەردو لوتێکی کورت و پانم هەبوو، ناوم بتی بوو، لەبارەی کەسایەتیەوە رووقایم و سەرکێش و سەرۆکی تیپی فوتبۆڵی پەیمانگا بووم، حەزم لە رەنگی پەمەیی بوو، پاشان بووم بە شاعیر، لەپرا قژم رەش و لووتم درێژ بوو، وازم لە فوتبۆڵ هێناو کەوتمە سوراخی ڤیولن سل،

ناوێکی دی جێگای ناوە ڕاستەقینەکەمی گرتەوە تا بەخت یاریم بکات و لەلایەن ئەدیب و کەسانی ناسراوەوە قبووڵ بکرێم. ڕەنگی جلەکانم لە پەمەییەوە بوو بە ڕەش، وریتگە وریتگی گۆرانیەکانی ئوکلاهامایم وازلێهێناو کەوتمە نەقلکردنی ڕستەکانی کی یرککارد، دیارە کار هەر بەمەندە کۆتایی نەهات، هەموو پێڵاوە پاژنە بەرزەکانم وەك سیحری لێکرابێت تەخت بوون و، پێویست بەوەیش ناکات کە بڵێم گەلێك لە کوڕە هاوڕێکانم بە بینینی ئەم حاڵەتە سەیرو پێکەنین هێنەرە وام لێدوورکەوتنەوە دەتگوت پێیان لەسەر ئاگر ناوە، بێگومان سروشتیە کە ئەوانیش بگۆڕێن، کوڕە هاوڕێ تازەکانم هەموو ڕیشیان هەبوو، ئیتر باوەڕ بکەن یان نا، لەم چیرۆکەدا کەمەکێك ڕاستی هەیە، لە تەمەنی شانزە ساڵیدا بووم بە شاعیر، هەڵبەت خۆم مەبەستم نەبوو، بەلام بوو. خەتای من نەبوو، ڕێگام بدەن ئەم لایەنەتان بۆ ڕوون بکەمەوە. ساڵی *1956* لە قوتابخانەکاندا دەرگای فێربوونی سەمای ڕۆك ئەندرۆلیان کردبووەوە کە زۆر بەجۆش بوو. لەپێکردنی پانتۆڵی جینسیش لە قوتابخانەی کچاندا قەدەغە بوو. تەنیا ئەو ڕۆژانە نەبێت کە بڕیار بوو بۆ تەماشاکردنی یاری فوتبۆڵ لەسەر کورسی دابنیشن. با لێرەدا ئەوەیش بڵێم کە دەشێت هیچ کام لەم شتانە بۆ دروستبوونی شاعیرێك لە دیدی ئێوەدا گرنگ نەبێت. ئەگەر کەسێك ساڵێك پێش ئەوە بە منی بوتایە کە من لەپڕێکدا دەبم بە شاعیر لە پێکەنیندا ڕیخۆڵەم دەبڕا. کەچی وایش دەرچوو.

لە ساڵی چوارەمی دواناوەندی بووم، قوتابخانەکەم لە تۆرینتو بوو، ئەو جێگایەی کە لەبەر یاسای پاکژخوازی (پیورتی) کە خواردنەوەی ئالکولیان تیا قەدەغە کردبوو ساڵی *1956* بە تۆرینتوی خێر ناوزەدکرا. ئەوسا تورینتو شەش سەدو پەنجا هەزارو پێنج سەدو نۆ دانیشتووی هەبوو، زۆرێك لە ژمێریارانی ڕەسمی و وەزیرێکیش لەو قوتابخانەیەی مندا خوێندنیان تەواوکردبوو، بەلام هیچ شاعیرێك نە لەپێش من و نە لەدوای من لەو شارەدا هەڵنەکەوتبوو.

ئەو ڕۆژەی کە بوومە شاعیر ڕۆژێکی هەتاو بوو، هەڵبەتە هیچ نیشانەیەکی تایبەتی لە نەحسی و بەدبینی لەو ڕۆژە بەدی نەدەکرا، هەموو ڕۆژێك بەلای گۆڕەپانی فوتبۆڵدا تێدەپەڕیم، نەك لەبەرئەوەی کە زەینی وەرزشکارانەم هەبێت یان بمەوێت جگەرەیەك دابگیرسێنم، بەلکو ئەوێ هەمیشە سەرەڕێگای بەینی ماڵ و قوتابخانەی من بوو. بە هەنگاوی کورت و خێرا دەمویست بەو شوێنەدا تێپەڕم کە لەپڕا قامکێکی گەورە کە قابیلی بینین نەبوو لە ئاسمانەوە داهاتە خوارێ و گوشاری لەسەر سەرم ناو، شیعرێك دروستبوو. شیعرێکی تەواو خەمگین، لەو شیعرانەی کە ئاسایی لاوەکان دەینووسن، ئەم شیعرە دیاریەك بوو -دیاریەك لە لایەنێکی بێ ناوەوە پێشکەشم کرابوو- لە هەمانکاتدا شیعرێکی خرۆشێنەرو شەیتانی بوو.

وا هەست دەکەم کە ئەمە هەمان ڕێگایە کە گشت شاعیرەکان بۆ هۆنینەوەی شیعر لە سەرەتادا لەبەری دەگرن، بەلام نایانەوێت وای بڵێن و مەبەستیانە ڕوونکردنەوەی لۆژیکیانەتر دەربڕن. بەلام ڕوونکردنەوەی واقیعی ئەمەیە کە من دەیلێم. ئەو شیعرەی لەو ڕۆژە پڕ لە کارەساتەدا وتم، لەگەڵ ئەوەیشدا کە تەواو لە هەر جۆرە ئیلتزام و تەکنیکێك دوور بوو، بەلام تایبەتمەندی خۆیشی هەبوو، ئەو شیعرە خاوەنی کێش و سەروا بوو، چونکە لە قوتابخانە فێری کێش و سەروایان کردبووین، شیعری ئەوسای من لە شیعری لۆرد بایرۆن، ئەدگار ئالان پۆو کەمەکێکیش لە شیعری شیلی و کیتس دەچوو، زۆر کەمم لەو شیعرانە خوێندبووەوە کە دوای ساڵی *1900*

نووسرابوون، لە مۆدێرنیزم و شیعری نوێ هیچم نەدەزانی. ئەوەی کە نەمدەزانین هەر ئەمانە نەبوون، بۆ نموونە: من نەمدەزانی هەنگاو بەرەو دنیایەك دەنێم کە حوکمی پێشینەو داب و یاسای کۆمەلایەتی وا لەخۆ دەگرێت کە لەگەڵ مەسەلەگەلێکی وەك: دەبێت شاعیرەکان چۆن بن، چۆن ڕەفتار بکەن و چ بەرگێك بپۆشن، پەیوەندی هەیە.

بێجگە لەمانە، ئەوەیشم نەدەزانی کە تازە ئەم یاسایانە بە نیسبەت ژنانەوە بەتەواوی پێچەوانەی حاڵەتە ئاساییەکەیانە. نەمدەزانی کە "شاعیرە" وشەیەکی سووکایەتی پێکردنە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو وشەیە منیش دەگرێتەوە. کە تەمەنم شانزە ساڵ بوو هەموو شتێکم بە سادەیی دەهاتە بەرچاو، ئەو قامکە هەبوو کە شاعیری دروستدەکرد. بۆیە دەبوو چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی بنووسرێت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هیچ کەسێك بە منی نەوتبوو لەبەر هەزارو یەك هۆ نەدەبوو بینووسم. ئەوەی لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونی شیعرەکانمەوە نووسیم، لە سەرەتادا کەمەکێك بۆ ڕوونکردنەوەو باسکردنی هاتنە خوارەوەی ئەو قامکە گەورەیە بۆ شیعرو شاعیریی کارێکی بەسەرمەوە هەبوو. بەلام لێگەڕێن با ئەوە ڕوونبکەمەوە کە چۆن شیعرو شاعیریی من سەریهەڵدا.

من لە هەژدەی نۆڤەمبەری ساڵی *1939*دا، واتە ڕێك دوای دوو مانگ و نیوی پاش دەستپێکردنی شەڕی جیهانی دووەم لە زایشگا (خەستەخانەی لەدایکبوونی منداڵ)یەکی ئۆتاوادا لەدایکبووم، لەدایکبوونم لەو سەرەتای شەڕەدا بوو بەهۆی ئەوەی کە سروشتێکی تێکەڵ لە ئاڵۆزی و نیگەرانی و ترس و سامیشم تیا دروستبێت کە بۆ شاعیرێك زۆر بەکەڵکن. لەدایکبوونم لە سەردەمێکی وادا مانایەکی تر دەبەخشێت کە من دووچاری بەدخۆراکی -سوء تغذیە- بووم، لەبەرئەوەیە کە کورتە بالام. ئەگەر لەبەر بەدخۆراکی نەبوایە بالام دەبوە شەش فووت.

شەش مانگ دوای لەدایکبوونم منیان لە کۆڵەپشتێك ناو بەرەو کولێتێکی دوور کە دەکەوتە باکوری خۆرئاوای کیبك *Quebec*ەوە بردیانم. باوکم لەوێ وەك مێژووناسێك سەرگەرمی لێکۆڵینەوە بوو، دەبێت ئەوەیش بڵێم کە لە سەردەمی خۆیاندا باوك و دایکم کەسانێکی نائاسایی بوون، هەردووکیان حەزیان بەوە بوو چەندیان لە توانادا بێت لە ژیاری -تمدن- بەدووربن. چونکە دایکم لە کاری ناوماڵ و میوانی چا بێزارو باوکیشم عاشقی داربڕین بوو. منداڵیی من دەکرێتە دوو بەشەوە. یەکەمیان ژیانی ناو دارستان لە گەرمترین وەرزی ساڵداو دووەمیش ژیانی ناوشارە جۆراوجۆرەکان لەکاتی سەرمادا. لەم ڕێگایەوە توانیم سەرەتایەك لە بنەمای کەسایەتیەکی دوولایەنە کە بۆ شاعیر پێویستە بۆخۆم دروست بکەم. هەروەها دەرفەتێکی باشم هەبوو بۆ ڕامان و بیرکردنەوە. لەنێو شەخەلاندا، شانۆ، سینەماو تەنانەت ڕادیۆییش وجودی نەبوو، خەڵکی زۆریشمان لە دەور نەبوو، ئەنجامەکەی وا شکایەوە کە زۆر زوو فێری خوێندن بووم، بۆ خۆشبەختی من دایکێکم هەبوو بە دەنگی بەرز کتێبی دەخوێندەوە. وەلێ لەبەرئەوەی کە نەیدەتوانی هەمیشە ئەو کارە بکات، ناچار بووم خۆم سەرگەرمی شتێك بکەم، لەسەر خوێندنەوە ڕاهاتم و تا ئێستایش ئەو خووەم هەر لەگەڵدایە. هەر بەو شێوەیەی کە نورتروپ فرای ڕەخنەگری ناسراوی کەنەدایی دەڵێت: "ئێمەی شاعیر هەموو شتێك بەشێوەیەکی ئەزمونگەری فێردەبین، یان ڕێك وەك ئەو منداڵانەی کە شیعری منداڵانە بەدەم هەڵبەزو دابەزیانەوە فێردەبن" شیعر بە زەرورەت گوفتاریەو زەمانیەو لە ئاوازو ئاهەنگەوە نزیکە، سەروا لەپێش ماناوەیە، سەرەتای ئەزموونی شیعرو شاعیریی من شیعری منداڵانە بوو کە زیاترین شیعری سوریالیستیە لە زمانی ئینگلیزیدا، هەوەڵین کتێبی شیعریم لە پێنج ساڵیدا دروستکرد، بۆ دەستپێکردن، بە بڕینی چەند پەڕە کاغەزێك و پێکەوە دورینیان کتێبەکەم دروستکرد. پاشان هەر شیعرێکم بیر بکەوتایەتەوە

لەو کتێبەدا دەمنووسی، کە چەند پەڕەیەکی بمایەتەوە شیعری خۆمم تیادەنووسی. ئەم کتێبە بۆ من شتێکی نهێنی و تەواو گێژی کردبووم، تا ئەوەی کە هەستمکرد ئیدی لەوە زیاتر شتێکم بۆ وتن پێنەماوەو، بە گشتی پانزە ساڵ شیعرم خستەلاوە.

کە لە دواناوەندی بووم مامۆستای زمانی ئینگلیزیم ساڵی *1955* وتی کە لە پۆلەکەیدا هەرگیز شتێکم نەکردبوو مزگێنیدەری ئایندەی شیعرو شاعیریی من بێت. ڕاستی دەکرد، تا هاتنە خوارەوەی ئەو قامکە گەورەیە هیچ نیشانەیەك لە شیعرو شاعیریی من دەرنەدەکەوت، ماوەیەکی زۆر هەروا مایەوە. بەلام من لەوە بێئاگا بووم، پاشان دەرکی ئەوەم کرد کە بوون بە شاعیر مانای ناتاگایی ئیرادەیشە. ئەگەر لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە هوشیاری و هەستی تەواوم هەبوایە، بە کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی قوتابخانەم کە لە کافتریادا دانیشتبووین نەدەوت دەمەوێت ببمە نووسەر. "نووسەر" نەك "شاعیر" تارادەیەك دەمزانی دەبێت چی بکەم، بەلام ئەم قسەیەی من لەپڕ گفتوگۆی منداڵەکانی وەستاند، بۆ چرکەساتێك، هەموو لە خواردن دەستیان کێشایەوە، کەس دەمی هەڵنەهێنایەوە، یەکێکیان وتی کە زۆری بەلاوە سەیرە، پرسیم بۆ؟ هیچی نەوت، تاقە شتێکی سەرنجراکێش لەو بارەیەوە کە من وەك نووسەرێك لە کەنەدادا خۆم ناوزەد کرد ئەوەیە کە کەس بە منی نەوت لەبەرئەوەی کچم ناتوانم ببمە نووسەر، بەلای ئەوانەوە تێکڕای مەسەلەکە پێکەنینهێنەر بوو، چونکە نووسەرەکان یان ئینگلیز بوون و هیچیان لە ژیاندا نەمابوون. یان ئەمریکاییەکی پیر بوون. بەلام هیچیان تەمەن شانزە ساڵ و کەنەدایی نەبوون. هەرچەندە، ئەگەر من کوڕیش بوومایە ڕەنگە خراپتر بوایە. با لەوەیش گەڕێین کە هەموو ئەو شیعرە خرۆشێنەرانەی لەو سەردەمەدا خوێندمەوە دەربارەی ڕەشەکوژی، بێسەرو بەرەیی، تێکەو لێکەیی و مەرگ بوو. ئەوسا شیعرو شاعیریان لە خانەی ناسکیی خانمان و شتێك لە گوڵچنین و بە گوڵ ڕازاندنەوە دادەنا، ئەگەر کوڕیش بوومایە دەبوو لەناو قوڕو لیتەدا خۆم بتلاندایەتەوە.

لەو شیعرە خراپانەی کە لە دواناوەندیدا چاپم کردن دەگەڕێم و تەنیا بە کورتی دەچمە سەر ئەو قسە دلگیرەی کە مامۆستای ئینگلیزی ساڵی چوارەمی دواناوەندیم خاتوو بسی بیلینگز پێی وتم: خۆشەویستم، من شتێکی لێتێناگەم، کەواتە دەبێت شیعری چاك بن.

بەلام چۆن دەمتوانی بە شیعر نووسین خۆم بژێنم؟ شیعرو شاعیری بازاڕی نەبوو، بەسەرما هات بڕۆم و پێش خزمەتی بکەم و پاشان هەر کردیشم. بەلام زۆر ماندوو لاواز بووم و پاشان بڕیارم دا بۆ خوێندنی ئەدەبیاتی ئینگلیزی بڕۆمە دانشگا. کە بۆ یەکەمجار شیعری تی ئێس ئەلیوتم بینی بەتەواوی گۆڕام و دڵم ساردبووەوە، هەستمکرد کە ئیتر هەرکامێك لەو شیعرانەی کە دەیخوێنمەوە سەروایان نییە. کەوتمە یادی ئەو ڕستەیەی کە شتێکی لێ تێناگەم، کەواتە دەبێت شتێکی باش بێت. دوای یەك یان دوو ساڵ کە سەرقاڵی کاری خۆم بووم و دەکۆشام خۆم وەك کەسێکی ئاسایی پیشانبدەم، لە دانشگا لەگەڵ پێنج کەسی تردا کە شەیدای نیگارکێشان بوون پەیوەندیم بەست. لە ڕێگای ئەوانو هەندێك لە مامۆستاکانمەوە بەشێکی زۆری ئەو نووسینە کەنەداییانەم خوێندنەوە کە لە بەرچاوی هەموو خەڵك بەدوور بوون. فرۆشتنی دووسەد دانە لە دیوانی ژنە شاعیرێکی کەنەدایی و هەزار دانە لە ڕۆمانێکی حسابیکی گەورەو گرانی بۆ دەکرا، لەو سەردەمەدا تەنیا پێنج گۆڤاری ئەدەبی هەبوون کە سەرنووسەرەکانی زۆر بە ناخۆشی و خوێنی دڵ خواردن ژیانیان بەسەردەبرد.

هەندێك جار ناوی کەسانێکم لێدەپرسن کە کاریگەرییان لەسەرم هەبوە. تا ڕادەیەك شاعیرە کەنەداییە هاونەسڵو کەمێکیش لەوانەی پێش خۆم کاریگەرییان لەسەرم داناوە. هەندێك لەوانە ئەمانەن:

*Margaret Avison- Jay*
*Macpherson- James Reaney*
*P.K. Page- Leonard Cohen*

ئەمانە هەندێکن لەو شاعیرانەی کە دەمناسین و بەرهەمیانم دەخوێندەوە. ئەوانەی لەو دەمەدا لەسەر شیعری کەنەدی دەیاننووسی، زیاتر لەبارەی ئەوەوە دەدوان کە پێویستە ئەدەبی کەنەدایی دروست بێت، بۆیە شیعر بە فۆرمێکی بنەڕەتی دەدرایە قەڵەمو زۆر زوو سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. ئەوسا شیعرەکانم لە گۆڤارە بچووکەکاندا چاپ دەکردو دوای ماوەیەکی کەم دەستم کرد بە ڕەخنە نووسین لەسەر بەرهەمی کەسانی دی. لە سەرەتادا نەمدەزانی لەبارەی چیەوە دەدوێم، چوار ساڵی تەواو، هەموو ساڵێك شیعرەکانم کۆدەکردەوەو دەمکردە دیوان و دەمدایە بنکەیەکی بڵاوکردنەوە بۆ چاپکردنی. بۆ ئەوەندە پەلەی چاپکردنیانم بوو؟ وەك هەر شاعیرێکی بیست ساڵانە بیرم دەکردەوە کە لە سی ساڵ زیاتر ناژیم.

شوێنی دانیشتنم قاتی سەرەوەی ئاپارتمانێك بوو، شتومەکی تەواوم نەبوو، بەڵام دیمەنگایەکی واڵام بەسەر بەندەری ڤنکوردا هەبوو کە دەبوو هەموو شەوێك لەوێدا بنووسم. بە درێژایی ڕۆژ وانەم دەوتەوە، خۆراکی ناو قوتوم دەخوارد و تا هەموو دەفرەکانم پیس نەبوونایە نەمدەشتن، شەوانە تا سەعات چواری بەیانی نەدەنووستم، لەو ساڵەدا یەکەم دیوانە شیعرم بە ڕەسمی چاپکراو یەکەمین ڕۆمانیشم تەواوکردو هەروەها کۆمەڵێك کورتە چیرۆکو فەسڵە بەراییەکانی دوو ڕۆمانی تر کە پاشان تەواو کردن هێنایە بەرهەم. ئەو ساڵە، بۆ من ساڵێکی پڕ کارو بەپیت بوو، هونەر نرخی خۆی هەیە.

ناوی یەکەم دیوانە شیعرم *The Circle Game* بوو، سکێچی بەرگەکەیش هی خۆم بوو. ئەم بەرهەمە مایەی سەرسوڕمانی گەلێك و خۆیشم بوو، چونکە خەڵاتێکم بەناوی *The Governer General Award* کە خەڵاتێکی گەورەی کەنەدایی بوو وەرگرت. بردنەوەی خەڵاتی ئەدەبی وەك یاری قومار وایەو منیش خۆشبەختانە بەرکەوتم. دیسان گەڕامەوە دانشگای هارڤارد تا تێزی دکتۆراکەم تەواوبکەم کە هەرگیز تەواوم نەکرد. ئیتر هەستم بەوە نەدەکرد کە لە تەمەنی سی ساڵیدا دەمرم، ئێستا شەست ساڵم، وای بۆ دەچم ئەم سنووردارکردنەی کە قەناعەتی خۆمانی پێدێنین، لەڕاستیا ڕێگایەکە بۆ تەعبیر لە وەختناسیو تەواو کەڵك لێوەرگرتنی. ئێستایش هەر دەنووسم، شیعر دەهۆنمەوەو هێشتا ناتوانم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە بۆ ئەم کارە دەکەم. دەمەوێت سوود لە کاتم وەربگرم. ورد زورس وتەیەکی بەجێی هەیە کە دەڵێت: "شاعیرەکان گەنجیی خۆیان بە خۆشحاڵی و ئومێدەوە دەستپێدەکەن، بەڵام بە دڵساردی، نائومێدی و شێتی کۆتایی پێدێنن" بێجگە لە هەندێك شاعیر کە ئەو قۆناغی یەکەمە -خۆشحاڵیو ئومێد-ە تێدەپەڕێنن و ڕاستەوخۆ دەکەونە گەڕان بەدوای بەشی کۆتایی -دڵساردی، نائومێدی و شێتی-یەوە. ئەمە بۆ وایە؟ تا ڕادەیەك لەبەر ئەو هەلومەرجانەیە کە شاعیر کاریان تێدەکاتو هەندێکیشی لەبەر چاوەڕوانی و پێشبینی ڕوناکبیریە. شکسپیر دەڵێت: "شێت، عاشق و شاعیر" تکایە بە وردی لە ڕیزبەندی ئەم وشانە بڕوانە. بە بڕوای من شیعرو شاعیریی لە بەشی مالیخولیایی مێشکدا دروست دەبێت و، ئەگەر کارێك ئەنجام نەدەیت، دەشێت بگەیتە ئەوەی کە لە حاڵەتی لەسەرخۆ بڕینی تونێلێکی تاریك و دوورودرێژدایت کە ڕێگای چوونە دەرەوەی نییە. هەڵبەتە من ئازایانە خۆم لەو بەڵایە دەرباز کردووە. ڕۆمانیش دەنووسم. بەڵام هەر جارێك کە شیعر دەهۆنمەوە، سەرسامیی ئەو بەهرە چاوەڕواننەکراو و نادیارەی یەکەم شیعرم هەر لەگەڵدایە.

**سەرچاوە**

گۆڤاری گولستانە

ساڵی سێیەم: ژمارە 29 ل 8-10

# لە ئەدەبی گەلانەوە

• منداڵەکان لە شەقامە گوندیەکاندا — فرانز کافکا

• دوو پارچە شیعری بۆرخس — خورخێ لویس بۆرخس

• بمهێنەوە دڵەکەم، بمهێنەوە — نیڤا ماتسۆن





# منداڵەکان لە شەقامە گوندیەکاندا

■ فرانز کافکا

● و. لە فارسییەوە: کاوە سەعیدی




گوێم لە دەنگی گالیسکەکان بوو کە لەپێش حەساری باغچەکەوە تێدەپەڕین. هەندێ جاریش شنەبایەك لقوپۆپی دارەکانی دەلەراندەوە. دەمدیتن. لە هاوینی سووردا، تەگەری گالیسکەکان چ خرەیەکیان دەهات! وەرزێرەکان لە مەزراکان دەگەڕانەوەو، زاریان پڕبوو لە بزەی بێشەرمی.

هاتوچۆی ئەوبەری حەسارەکە تەواوبوونی نەبوو: منداڵەکان زۆر بە چالاکی دەهاتن و تێدەپەڕین؛ ئەو ژن و پیاو و، گالیسکانەیش کە بە کۆمەڵ دەهاتنەوەو سێبەریان دەخستە سەر ڕێگاکە. دەمەو ئێوارە پیاوێکی گۆچان بەدەستم بینی بە هێواشی خەریکی ڕێکردن بوو، چەند کچێك قۆڵیان لە قۆڵی یەکتردا بەرەو ڕووی دەچوون، سڵاویان لێکردو هێندێ لە ڕێگاکە خۆیان لادا.

دواتر باڵندەکان وەك تووڕەبوونی گڕکان بەرەو ئاسمان لە شەقەی باڵیان دا. سەرنجم خستە سەریان، دیتم کە بێ پشوودان بەرەو ئاسمان دەڕۆن، تا ئەو جێگایەی کە ئیدی بڕوا نەدەکرا لەوە زیاتر بەرز ببنەوە، وام بیر دەکردەوە کە ئیتر ئەوە منم دەکەومە خوارەوە.

لەبەرئەوە گوریسەکانم توند گرت و لەتاو لاوازی بە هێواشی سووڕم خوارد. دواتر کە با فێنکتر بوو لەبری هەڵفڕینی باڵندەکان ئەستێرەکان کەوتنە زریوەو بە چاوبڕکێ دەرکەوتن، بە تەوژمێکی زۆرتر کەوتمە خولانەوە.

لەبەر ڕووناكی مۆمدا خواردنیان بۆ هێنام. زۆرتر هەردوو دەستم تا ئانیشكم دەخستە سەر مەجمەعە دارینەكەو بە چاوێكی خەواڵووەوە پارووم لە نان و كەرەكە دەگرت. بایەكی گەرم دەكەوتە نێو پەردە كوندارەكانەوەو هێندێ جار ئەگەر ڕێبوارێك بكەوتایەتە بیری كە چاوم لێبكاو بۆ قسەكردن ڕاوەستێ، پەردەكانی لەدەست دەگرت و بە خێرایی مۆمەكە دەكوژایەوە و پۆلی میشوولەكان بۆ چەند ساتێك لەنێو دوكەڵی ڕەشی مۆمدا بێ مەبەست دەسوڕانەوەو، ئەگەر لەولای پەنجەرەكەوە كەسێك پرسیارێكی بكردایە، بە شێوەیەك چاوم لێدەكرد وەكو ئەوەی بڵێی لە كوێستان یان لە ئاسمان دەڕوانم و، ئەو كەسەیش زۆر چاوەڕوانی ئەوە نەبوو كە وەڵامێك وەربگرێتەوە.

ئەگەر یەكێك لەپێش پەنجەرەدا هەڵدەبەزییەوەو هەواڵی دەدا كە ئەوانی تر لەبەر دەركەی ماڵ كۆبوونەتەوە، بە ئاهو ناڵەوە لەسەر جێگا هەڵدەستام.

"چی بووە، بۆچی دەناڵێنی؟ كارەساتێك ڕوویداوە كە لە بەرانبەریەوە بێهێز ماویتەوە؟ كارەساتێك كە لێ ڕزگاربوونی دژوارە؟ یانی بەڕاستی هەموو شتێك لە دەستت دەرچووە؟"

شتێك لە دەس نەچووبوو، دوو كەس بە هەڵاتن بۆ لای دەركەی ماڵەوە دەڕۆیشتن، "شوكر بۆ خوا كە ئاخرەكەی هاتن!" - "تۆ هەموو جار دێر دێیت!" - "بۆچی من؟" - "بەڵێ تۆ. ئەگەر پێت خۆش نیە لە ماڵەوە دانیشە." - "نە لێخۆشبوونو نە لێبوردن!"

- "چیت وت؟ نە لێخۆشبوون و نە لێبووردن؟ چی ڕوویداوە كە ئاوەها قسە دەكەی؟"

بە خێرایی بەرەو دڵی تاریكی ڕێمان دەبڕی. نە ڕۆژ بوو نە شەو. هێندێ جار قۆپچەی هێلكەكەمان وەكو ددان بەسەر یەكدا دەكۆروان، زۆر بە خێرایی لە مەوداگەلێكی ڕێكدا هەڵدەهاتین، ئاور لە زار، وەكو ئاژەڵەكانی ناوچە گەرمەسێرەكان. وەكو سوارە زرێپۆشەكان لە شەڕەكانی كۆندا، بە لاق لە عەرزدان و تلخواردن لە كۆڵانە كورتەكانەوە بەرەو خوار، سەرمان لە سەری یەكتر دەناو بە خێراییەك كە لە هەنگاوەكانماندا بوون لەوپەڕی كۆڵانەوە بەرەو سەر دەمانهێنا. هێندێك دەڕۆشتنە نێو چاڵەكانەوەو، لە سەرەولێژایی تاریكی ئەوێ بۆ چركەیەك ون دەبوون و، پاشان بێ ڕاوەستان وەكو نەناسراوەكان لە سەرەوەی ڕێگا بیاوانیەكەوە سەریان هەڵدێناو چاویان لە خوارەوە دەكرد.

"وەرنە خوارەوە!" - "لە پێشدا ئێوە بێنە سەرەوە!" - "بێینە سەرەوە تا ئێوە بمانخەنە خوارەوە؟ نە، بە هیچ شێوەیەك ناكرێ و گەر عەقڵمان لەدەس داوە". - یانی ناوێرن. یا الله وەرن، وەرن!" "بە ڕاستی؟ ئێوە دەتانەوێ ئێمە بخەنە خوارەوە؟ ئێوە؟ نە، ئەم كارە لە ئێوە ناوەشێتەوە".

هێرشمان دەبرد، پاشەكشەیان پێدەكردین، لەسەر شینابییەكانی چاڵەكە ڕادەكشاین، بەسەر زەویەكەدا دەتلاینەوە، خۆبەدەستەوەدان، هەموو شتێك وەكو یەك گەرم بوو. لەنێو شینابییەكەدا نە هەستت بە سەرما دەكردو نە گەرما، بەس ماندوو بوویت و حەزت دەكرد بخەوی.

ئەگەر بۆ لای ڕاست دەسوڕایتەوەو دەستت دەخستە بن سەرت، حەزت دەكرد بخەوی. سەرەڕای ئەوەیش هەوڵت دەدا كە سەرت هەڵێنی و هەستیتەوە، بەڵام بە جێگای هەستان، پێت خۆش بوو بۆ چاڵێكی قووڵتر تل بخۆیت. پاشان دەستت لەسەر چاوت دادەناو لاق گەڵت بەرز دەكردەوەو لە هەوادا كایەت پێدەكردو، حەزت دەكرد دیسان تل بخۆی بۆ چاڵێكی قووڵترو ئیتر واز لە تل خواردن نەهێنی.

لەم نێوەدا لەسەر پشت ڕادەکشای، بە پەژارەو غەمەوە، وەکو نەخۆش، کەمتر لە بیری ئەوەدا بووی کە لە دوایین چاڵدا چۆن بە مەبەستی خەو، لەشی خۆت، بە تایبەت لاقەکانت، ئازادانە درێژ دەکەیەوە.

پاشان ئەگەر کوڕێك دەستی لەنێو قەدی ئاوەو، بە پاشنەی ڕەشەوە، لە سەرەودی کۆمەڵەکەوە، لە سەرو لێژاییەکەوە بۆ لای ڕێگاکە دەڕۆیشت، چاوت دەکردەوەو لەسەریەکت دادەناوە.

مانگت لە ئامێزی ئاسماندا دەدیت. گالیسکەی هەواڵبەر لەپێش تیشکی مانگدا دەهات و تێدەپەڕی. با لەسەرخۆ هەڵیدەکرد. لەنێو چاڵیشدا هەڵبوونی بات هەستپێدەکردو لەو نزیکانەوە، جەنگەڵ دەکەوتە غەڵبە غەڵب، لە ئاوەها کاتێکدا کەس بەدوای ئەوەوە نەبوو کە تەنیا بێت.

"لە کوێن؟" - "وەرن بۆ ئێرە!" - "هەموو پێکەوە" - "بۆچی خۆت شاردۆتەوە، چ کارێکی گەوجانە، وازبێنە!" - "مەگەر نازانن کە گالیسکەی هەواڵبەر تێپەڕی؟" - "نە، ئیمکانی نیە! بەڕاستی تێپەڕی؟" - "بەڵێ، کاتێ نووستبوی، تێپەڕی" - "من نووستبوم؟ چ قسەیەك!" - "بێدەنگ بە، لە سیماتدا دیارە" - "وازبێنە" - "وەرن!".

بە تەنیشت یەکەوە دەکەوتینەڕێ. هێندێکیان دەستیان پێکەوە حەڵقە دەکرد، نەتدەتوانی بە باشی سەرت بەرز بکەیتەوە، لەبەرئەوەی ڕێگاکە لێژ بوو. یەکێك وەکو سووربێستەکان هاواری شەڕی سەردەدا، لاقەکانمان وا دەکەوتە غاردان کە مەپرسە. لە کاتی هەڵبەزیندا، با دەکەوتە نێو گەلمانەوە، هەڵدەستاینەوە بۆ ئاسمان. شتێك پێشمانی نەدەگرت. وا هەڵدەهاتین کە لە کاتی پێشکەوتن لەوی تر، دەمانتوانی دەستمان لە پشتمان دانێین و بێ غەم تەماشای دەوروبەر بکەین.

لەسەر پردی "ویلدباغ" ڕادەوەستاین، ئەوانەش کە پێشکەوتبوون دەگەڕانەوە. لە بن پرد، ئاو بە شێوەیەك خۆی لە داروبەرد دەدا وەکو ئەوەی کە پێ نەزانێ کاتی درەنگانی شەوە. هۆیەکی نەبوو کە یەکێك لەنێو کۆمەڵدا خۆی هەڵنەداتە سەر نەردەکانی پرد.

لە دوورەوە، شەمەندەفەرێك لەنێو دارەکانەوە دەردەکەوت، کووپەکانی شەمەندەفەر هەموو ڕووناك بوون. بێ شك جامەکانیشیان داداوەتەوە. یەکێك لە ئێمە گۆرانیەکی دەسپێدەکرد، هەروەها ئەوانی تریش حەزیان دەکرد گۆرانی بێژن. هەموومان خێراتر لە ڕۆیشتنی شەمەندەفەرەکە گۆرانیمان دەچڕی و دەستمان دەجوولاند. لەبەرئەوەی دەنگەکانمان بەس نەبوو، دەنگمان لە دەنگدا تێکەڵ دەکردو خۆشبووین. کاتێ دەنگی خۆت لەگەڵ دەنگی ئەوانی تر تێکەڵ دەکەی، وەکو ئەوە وایە کە دەڵێی بە قولاپی ماسیگرەوە بەندکراوی.

لە ئاوەها حاڵ و کەشێکدا، پشت لە جەنگەڵ، ڕوو لە مسافرەکان، گۆرانیمان دەخوێند. لە گوندا، گەورەکان ئێستاش بەخەبەربوون، دایکەکان نوێنی خەوتنی شەویان حازر دەکرد، کاتی گەڕانەوە بوو. یەکێك کە لە هەموو نزیکتر بوو، ماچم دەکرد، لەگەڵ سێیەکانی تر بەس تەوقەم دەکردو، لەو ڕێگایەوە کە پێیدا هاتبووم دەگەڕامەوە. کەسێك بانگی نەکردم، لەسەر یەکەمین چوارڕێیان، شوێنێ کە ئیتر نەدەبینرام، ڕێگام دەگۆڕی و دیسان بەرەو جەنگەڵ دەکەوتمەوەڕێ، بۆ لای شارێك لەلای باشوور ڕادەکێشرام، شارێکە کە لە گوندی ئێمەدا لەسەری دەیانووت:

"لەوێ خەڵکانێك هەن! بیری لێبکەنەوە، خەڵکانێك کە ناخەون!"

"ئەی بۆچی ناخەون؟"
"چۆن ماندوو نابن"
"ئەی بۆچی ماندوو نابن؟"
"چۆن شێت نابن".
"مەگەر شێتەکان ماندوو نابن؟"
"شێتەکان چۆن دەتوانن ماندوو بن!".

# دوو پارچە شیعری بۆرخس

■ خۆرخێ لویس بۆرخس

● و. لە ئەڵمانیەوە: ئیسماعیل حەمە ئەمین

## گێڕانەوەی تەمەنێک[1]

وا دیسانەوە لێوەکانم، دەدوێن
ئەو لێوانەی لە ئێوە نێزیکەو تەنیان
ئەو لێوانەی باس لە من دەکەن..
منێك بەردەوام لە بەختەوەری و سنورە بڕواپێکراوەکانی ئازار نێزیك دەبمەوە
منێك کە بەنێو دەریادا تێپەڕیووم.
من زۆر وڵاتان گەڕام، لەوێدا ئافرەتێکم بینی، لە یەکێکی دیکەدا دوو پیاوم بەدیکرد.
لە وڵاتێکی دیکەدا سێ پیاوم بینی.
عاشقی کیژە پۆپەشمینەیەکی بەنازو هەیبەت بووم، بە سەبرێکی ئیسپانیەوە عەشقی بووم.
قەراغ شارەکانم بینی چۆن لەنێو نەمری خۆرئاوادا دەتوێنەوە.
من وشەکانم تامکردو لە قوڵایەوە لەو بڕوایەدام، جارێکی دیکە نە شتی تازە ڕوودەدات، نە شتی تازەش دەبینم.
من ئیدی بڕوام هێنا کە شەو و ڕۆژەکانی خواوەند، شەو و ڕۆژەکانی هەژاری و دەوڵەمەندی، بۆ مرۆ وەك یەکن.

## پڵنگە زێڕینەکان

تـا چ کـاژێرێکی زێڕینـی زەردی خۆرئـاوا مـن لـەو پڵنگـە بـەزەبرە بەنگالیانـە ڕامێنـم کـە لـەودیو قەفـەزە ئاسنینەکانیان بێئاگا،
هەستیان بە بەندێتی خۆیان نەکردووە

چــیرۆك

# بمێنەوە دڵەکەم بمێنەوە*

■ ئیڤا ماتسۆن

● و. لە سویدییەوە: عەبدوڵڵا قادر دانساز

ئیڤــا ماتســۆن، لــە ســاڵی 1940 لــە بــاوکێکی سویدیو دایکێکی بەلجیکی لە شاری یاڤلای سوید هاتۆتە دنیاوە، لە شاری لینشیۆپیگ گـەورە بـوە. هەندێك لە ساڵانی منداڵی لە بەلجیکا بردۆتە سەرو جێنشـین بوونیشــی لــەوێ، لــەنێو بەرهەمــەکانیدا جێگــەی خۆیان کردۆتــەوە. ئیڤا پێشتر لــە نەمسا، لەگــەڵ هــێزی نێــو نەتــەوەیی ئینگلتــەرادا، لەگــەڵ پەناهــەندەدا کــاریکردوە بــۆ چۆڵکردنــی ئۆردوگــای پەناهــەندەکانو نیشــتەجێکردنیان. ئیڤــا لــە ســاڵی 1967 پــــاش بەدەســــتهێنانی فیــــل کــــانیداتو باوەڕنامەی ڕۆنامەنووسی، وەکو ڕۆژنامەنووس لە تێ تــێ، ڕۆژنامــەی داگــگ نیــو هێتــەرو ڕۆژنامــەی ئافتۆن بلادیت کاریکردوە. لە نێوان ساڵانی 1967 تا ساڵی 1979 وەك ڕۆژنامەنووسێکی باری کۆمەڵایەتی ڕاپۆرتی بۆ ڕۆژنامەی ئافتۆن بلادیت نووسیوە. لە ســاڵی 1967 شــووی کــردوە بــە هۆکــان ماتســۆنی ڕۆژنامەنووسو کوڕێكو کچێکیــان هەیــە. ئیڤــا لــە ساڵی 1979دا وازی لە کاری ڕۆژنامەگەری هێنـاوەو وەکو نووسـەر کاردەکات. بەپێی ئـەو باسـانەی لـە ڕۆژنامـەکاندا خوێندوومەتـەوە، ئێسـتا ئیڤـا وانـەی نووسینەوەی کورتە چیرۆکی هونەری لە دانیشگای یۆتۆبـۆری دەڵێتــەوە. لــە ســاڵی 2002 ڕۆمــانی "لــە دوای دەنگــی پیپــی تەلەفونەکــە قســەبکە"، لــە چاپخانەی بۆنییەش، بڵاودەکاتەوە.

ئیڤا ماتسۆن، تا ئـەمڕۆ خاوەنی دوانزە کتێبـە، لەوانەش شەشیان کورتە چیرۆکن، پێنجیان ڕۆمانو یەکێکیشـیان نیمچـە یادەوەرییــەکی نووســەرەو بــە شــێوەیەکی زۆر تایبــەتی نووســیویەتیەوە. ئــەم چیرۆکــەش: *بمێنــەوە دڵەکــەم بمێنــەوە* لــە کۆمەڵــە چــیرۆکی یەکەمیانــەوە وەرگــیراوەو نێــوی کۆمەڵــە چیرۆکەکەش هەر بەو نێوەوەیە.

بەرهەمەکانی نووسەر بەمشێوەیەی خوارەوەن:

بمێنەوە دڵەکەم بمێنەوە -1979 -کورتە چیرۆک.
ڕفاندن -1980 -کورتە چیرۆک.
لە بۆ ئێلسی -1980 -ڕۆمان.
قەڵای ڕادەربڕین یاوەکو هۆمۆ ئینفۆرمیس -1981 -ڕۆمان.
من دەبێ شەو بکەم بە ڕۆژ -1984 -ڕۆمان.
دەنگە پرژاوەکان -1984 -کورتە چیرۆک.
گروچۆ بە سەوزی -1987 -کورتە چیرۆک.
خوێن بە دیوارەکەمەوە -1988 -کورتە چیرۆک.
چاوی دەریا -1990 -ڕۆمان.
پاسێپۆرتۆوت -1993 -ڕۆمان.
کورتە هەواڵی خێزان -1999 -بیرەوەری.
سەگەکانی "ئاسک" -2000 -کورتە چیرۆک.

-وەرگێڕ-

## بمێنەوە دڵەکەم بمێنەوە(*)

ئەم هاوینە دەچم بۆ دالینبۆری، ئۆری یا ترانۆس. بەو مرۆڤەم وت کە بۆ خاچی سوور کاریدەکردو هاتبوو بۆ ئێرە: *"باوەڕت بە ئامالیا بێریخوێ هەبێت، ئەگەر بێتو ئەو کارە هەر هەموو ساڵەکەش بەرێت، خۆم هەر هەمووی جێبەجێدەکەم"*. هاوینی ڕابردوو فریای هیچ لایەك نەکەوتم، من بە تەنیا ئا لێرەدا دانیشتبووم، ئای خوای گەورە ئەوە چەندە وەڕسکەر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئیدلاو بێرتیلو کچە چکۆلانەکەمو هەر هەموویان هاتبوون بۆ ئێرە. ئەم دەهاتو ئەو دەچوو. ئەوان دەڵێن، ئێستا نۆرەی تۆیە بۆئەوەی بە سواری بێیت بۆ لامان. من دەزانم ئەوان بەچی شێوەیەك بە یەکتری دەڵێن، بەڵام من هیچ گلەییەك ناکەم، چونکە ئەوە مانای ئەوە نیە کە هەموو ئەوانەی منداڵیان هەیە بەهەر شێوەیەك بوە دەبێ منداڵەکانیان سەردانیان بکەن. هەروەها من شەش دانە وەچەشم هەیە. دەبێ ئاوابێ، پیاو نابێت لە ژیاندا کۆڵبدات. من زۆر چاك دەتوانم کاری خۆم مەیسەر بکەم، ئەگەر بێتو لە خودی سەفەرەکەدا یارمەتیم بدرێتو پاشان نسان بکرێت بە دەممەوە، لە خۆشۆردنو هاتوچۆو چوونە نێو جێگاشدا یارمەتیم بدرێ.

هاوینی پێرار لەگەڵ یەکێك لەو خانمانەی کە لە سۆشیال کاردەکەن، هەتا سێترابرون لەگەڵیا چووم، ئەو دەیزانی مەسەلەکە چییە، چونکە خوشکەکەی کەمئەندام بوو. خوشکەکەی پارکینسۆنی[1] هەبوو، وەکو قەلەڕەشێکی پیر هەموو ئەندامەکانی لەشی دەجما، پاشان ڕۆژێك خوشکەکەی مردو ئەوجا ئەو وا بۆی دەچوو کە ئەو بەهەمانشێوە دەتوانێت بە باشی لە خزمەتکردنی کەفتەکاردا بەردەوام بێت، ئیتر ئەو لە جیاتی خوشکەکەی خزمەتی منی دەکرد. خوای گەورە چەندێك خۆشمان بوو لە سێترابرون. من هەر لە یەکەم ڕۆژەوە ئەوەم خستە مێشکی هەموویانەوە کە من چۆن چۆنیم دەوێت. من بە بەیانیان قەنداغ بە شیرەوە، شلەی شۆفان لەگەڵ دوو چۆرەکی ئاردی گراهام[2]م دەوێت. ئەوجا ئەوان وتیسان چای سیلڤەر[3]ت دەوێت. من گوتم، بەڵێ، ئێخۆ ناوەکەشی هەر ئاوایە، چای سیلڤەرە ئەگەر بێتو ئێوە واتان بوێت. پاشان ڕاکشابوومو گوێم لە خەڵکی بوو لە دەوروو پشتمدا شڵپوهوڕیان دەکرد، من هەرگیز خۆم دوورەپەرێز نەگرتبوو، من پرسیاردەکەمو قسە دەکەم، ئیتر بە تەنها ڕۆژێك بۆم ڕوونبووەوە کە ئەوان چ کەسێلێکن. بەشی هەرە زۆریان خانمو پیاوی بەڕێزی ستۆکهۆڵمی بوون، هەندێکیشیان خەڵکی ئێکخوێ[4]، نۆرلاند[5] و ئوپسالا[6] بوون. ئیتر من لە دکتۆرەکەش بەخت یارم بوو. من هەر لە ساباتسبێری[7]یەوە دەمناسی، هەر لەو هاوینەی کە دوا نەشتەرگەری ئاوی زەردی چاویان کردم، ئەو دانەیەیان کە سەرنەکەوت. من گوتم: *"ماندوو نەبیت*

ئەرێ ئەوە *ستێلان کالسۆن نیە، ما؟*" ، ئەویش بە ڕاستی بە هەمانشێوە منی ناسیەوە.

ئەو وتی: "*ئەم کاتەت باش ئەی بێریخۆی*" . ئۆی خوای گەورە چەندێ خۆشمان ڕابوارد. ئەو ستێلان کالسۆنە گەلێك بەسەرهاتی خۆشی لایە. پاشان دواتر لە کاتی نانی نیوەڕۆدا کچەکان دەهاتن و بە پاڵنانی کورسیە تایەدارەکەمەوە منیان دەبرد بۆ ساڵۆنی نانخواردنەکە. ئەوکاتە لە چاویندا چ سەختیەکم لەبەردا نەبوو، ئەوە ئێستایە کە من بە تەنها خواردنی تریت[8]م پێدەخورێت، ئەوکاتە دەرەقەتی خواردنی ئاسایی دەهاتم. خواردنەکان گۆشت و ماسی و هێلکەوڕۆن و هەموو شتێك بوو. پاشان ئەوان لە پاش نانخواردن بە پاڵنانی کورسییە تایەدارەکەمەوە دەیانبردمە دەرەوە بۆ ناو حەوزی مەلەکردنەکە، من بە کوپی چاکەمەوە لەسەر دۆشەکێك ڕادەکشام، ئەوان زوو شارەزای ئەوە ببوون کە من چەندێ شەکرم دەوێت بکرێتە نێو چاکەمەوە. لەوێدا ڕادەکشام و قسەم لەگەڵ ئەوانی تردا دەکرد و پاشان جوملاستیکوانی نەخۆش[9]ەکە دەهات و هەموو ڕۆژێك خۆم دەشۆرد. من حەزم لە جوملاستیکوانی نەخۆشە و هەردەم ئاگاداری ئەوەم کە هەمیشە جلەکانم بە شلی لەبەردا بێت و هەمیشەش جلەکانی ژێرەوەشم جوانبێت. من دایمە گۆرەوی ئاوریشمینم لەسەرەوە لەپێدەکرد، ئاگاداری ئەوەم دەکرد کە ئەوان گەلێ بە هێزەوە بمشێلن، چونکە حەز بەوە دەکەم ئەوان بەهێزەوە بمشێلن. دکتۆرەکەم سەری سوڕمابوو کە من ئەو هەموو تەمەنەم هەیە و قاچوقولیشم وا باریکە. منیش پێم گوت: "*کوڕی باش بۆ خۆت تەماشاکە کاتێك بواری ئەوەت بۆ لواوە*" ، کەچی ئەو قسەکەی لەدڵ نەگرت. نەخێر لەوێدا مرۆڤگەلێکی بەڕێزی لێبوو، لە پاشانیش پیاو تەندروستی شان و ملی وەکو خانزادەیەکی لێدەهات.

هەروەها خۆشمان بۆ گەڕان دەردەچووین. خانمەکانی خاچی سوورو ئەوانی دیکەی دەزگاکانی سۆشیال و کچەکانی ماڵی پیران[10]، هەر هەموویان لەگەڵمان دەهاتن. ئێخۆ لەو کاتەوەی من ڕووناکی چاوم دامرکاوەتەوە، لەوە بەدوا هیچ شتێکم نەبینیوە، بەڵام نەعلەت لە شەیتان، ئێخۆ من لەو سەردەمەدا هێشتا هەستکردن و گوێکانم بە دەستمەوە مابوون، ئیتر گلەیی کردن داوەشینە. لە دەرەوەدا لەنێو مێرگەکاندا، بە پەنجەکانم دەستم بەسەر گوڵەکاندا دەهێنا، لە پارکێکیشدا گوێم لە مۆسیقا بوو، ئەوانە ئۆرکێسترایەك بوون لە هەوای بەرەلادا لێدەدران. بەڵێ دیقەت بدە ئەوەش گۆڕانکارییەك بوو، پاشان ڕۆژێکیان منداڵەکانم بە سواری ئۆتۆمبیلەکە هاتنە لام و سەردانیان کردین. ئەوان میوەو گوڵ و گەلێك گەنوگووی دیکەیان پێبوو، من گوتم کە ئەوان دەیانتوانی کەمێکی بۆخۆیان لێ گلبدەنەوە، بەڵام چونکە ئەوان لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، ئیتر ناچار منیش خواردم، مەبەستم میوەکانە، گوڵەکانیشم لەنێو ئەوانەی هەر هیچیان نەبوو، دابەشکرد.

ئەوە بێنە پێشچاوت کە گەلێکیان تەنها شتێك چییە نەیانبوو. هەزاری قوریەسەر، هەندێك لە جێگا کەوتوەکان، ئەوانەی هەرگیز نەیاندەتوانی هێندە بکرێننەوە کە تەنانەت بەشی کیسەیەك مۆزو شتی خۆشمەزە بکات، بەڵام پیاو نازانێت، کە ئایا ئەوان دەبێ بە خۆیاندا بچنەوە لەبری کرۆزاندنەوەو گلەییەکانیان. من بەتەواوی لەوە نەگەیشتووم، چۆن پیاو خۆی تووشی ئەو بەزمە دەکات، چونکە گەر پیاو بیەوێت، ئەوکاتە دەتوانێت بکات بە زۆربەی شتەکان. بەڵام نابێ خەڵك دادگایی بکات، هەندێك لەو هەژارانە لەوێدا ڕاکشابوون و دەگریان و گلەییان دەکرد کە لەوانەیە دەسەڵاتیان بەسەر ئەو بارەدا نەبێت.

هاوینی ڕابردوو هیچ پشووییەکی ساڵانە لە بۆ ئامالیە بەڕێوەچوو لەبەر، چونکە ئەو مرۆڤانەی سۆشیال هەندە خاوو خلیچکن نەبێتەوە. خوای گەورە من بەو شێوەیە ژیام، لەکاتێکدا چاوم لێبوو پەمی لایەکدا دەشکێتەوە، داخوازیم دەنووسی، بە ئەلەفون زەنگم لێدەدا، دوو دۆشاوم تێکەڵدەکرد. پاڵەکیان داردەستی گۆپالم گرت بەدەستەوەو دەرچووم دەرەوە بۆ نێو شار بۆئەوەی کەسایەتی هەیبەتداری خۆم نیشانبدەم، کە بەڕاستی مەبەستم بوو. تا لێرەدا چووم دەرەوە بۆ نێو جادەکەو هاوارم لەو کەسانە دەکرد کە بەلامدا تێپەڕ دەبوون: "ئاییل کە من گۆپاڵی گران ڕێی دەکەم، دە کەواتە پارەتیم بدەن، یان لەبەردەمدا بە دەم بانگکردنەوە دەوەستن".

بێگومان ئەوان دۆش دامابوون، بەلام ئەوە شتێك نییە لەبارەیەوە قسە بکەم، زۆربەی جار خەڵکی کەمێك گەمژەن، ئیتر منیش ڕێم نیشاندان، کە چۆن چۆنی دەتوانن دەستم بگرن، هەروەها پێم وتن کە من دەمەوێت بچم بۆ لای پاسەکە، هەندە دوور نییە، بە تەنها تا وێستگەی پاسەکە. ئەوە پاسی ژمارە 50و شۆفێرەکەشی دەمناسێت، ئیتر شۆفێرەکە خۆی چەندی ویست، پارەی لە نێو جزدانەکەم دەرهێنا، پاشان بانگی لە منداڵێکی گەمژەڵ کرد کە لە جێگایەکدا بە پێوە وەستابوو بەوەی پارمەتیم بدات بمباتە سەر جێگایەك. ئەوجا دانیشتم، لە کاتێکیشدا کە گەیشتمە نزیك دەزگای سۆشیال، دووبارە هاواری پارمەتیدانم کردەوە. هاوارمکرد، "من گۆپاڵەو ڕۆماتیزمی قرتێنکەکانم هەیە، ئەی ئێوە"، ئەوجا پیاو فێری ئەوە دەبێت داوای یارمەتی بکات، "بۆیەکە دەمەوێت یەکێك لە ئێوەی منداڵانی نازداری ئێرە، بە ڕێکوپێکی لە دابەزینی پاسەکەدا یارمەتیم بدات". هەرکە پیاو وا بە توندی داوا بکات، ئیتر مەرامەکەی جێبەجێ دەبێت. دوو زەلام لەسەر یارمەتی دابەزاندنی من شەڕیان دەکرد. یەکێك لەو دوو زەلامە هەتاوەکو نێو دامەزراوەکەش لەگەڵم هات، لە داڵانەکە وتم ئیتر بۆ خاتری خوا، لەوە زیاتر پێویست ناکات لەگەڵم بێیت، من سەد لە سەد ئیفلیج نیم بەتەنها حەفتاو پێنج لە سەد، پاشان دەستمکرد بە پێکەنین، تا ئەم کابرایەش لێی پرسیم کە ئایا من هەردەم لە میزاجێکی ئاوا ڕەونەقداردام.

ئەندەرشون خانم کە سۆشیال یاوەرمە[11] تەریق بۆوەو گەلێك قسەی حەلەق و مەلەقی بۆ کردم لەبارەی ئەوەی کە من ناتوانم بچم بۆ سێتزابرون، چونکە پێویست بەوە دەکات کە من یەکێکم لەگەڵدا بێت و هەردەم چاودێریم بکات. توخوا شتی وا بێمانا، لەکاتێکدا خۆی دەزانێت کە من پێشتر لەوێ بوومەو لەلایەن کارمەندەکانەوە ناسراوم. ئەوجا چووم بۆ لای دکتۆر کاربلێری دێرین، ئەویش گەواهی ئەوەی بۆ نووسیم کە منیش وەك ئەوانی تر، پێویستە لە ئاپارتمانەکەم دەربچمە دەرەوە. وتم، هەروەها مانگایەکی پیریش پێویستی بە لەوەڕی تازە هەیە، ئەویش دایە قاقای پێکەنین و گوتی، "ئامالیا تۆ بێگومان هەرگیز گۆڕانکاری ناکەیت. بێگومان (ئێمە) لەم سەردەمەی دواییدا گۆڕاو بوو بە (تۆ)، ئایا تۆ دەزانی ئەوە ناوی چییە؟ ئامبرۆسیۆس[12]. ئەرێ گوێت لێیە چ ناوێکە! بڵێ ئەوکاتە هەموو کەسێ کەمئەندامی خۆی هەیە". کوڕە نەعلەتم لێدا، ئێخۆ گەواهییەکەی ئەو هیچ یارمەتییەکی نەدا، ناچار هاوینی ڕابردووم بە دانیشتوویی تا لێرەدا بەسەربرد.

ئەوە چ ڕۆژنامەیەکە ئێستاکە تۆ کاری تێدا دەکەیت؟ بەڵێ، بەڵێ ڕۆژنامەیەکی سۆشیالیستیە، بەڵێ هەر لەبەرئەوەش بوو جارێك لە جارەکان زەنگم بۆ لێدابووی، ئەی چۆن، بە خۆشم لە گەنجێتیما سۆشیالیست بووم. ئەوە پەنجا ساڵی خایاند تا لەوە

تێبگەم، بەڵام تۆ گەنجیت، دڵەکەم، ئەوجا دەنگ بدە. پیاو دەبێت هەرچەندێک باشتر پێیدەکرێت کۆششی خۆی بکات. گوێت لێمە. ئەوجا ئێستا دەبێت تۆ هەوڵبدەی لە رۆژنامەکەتدا بانگەوازێک دەربارەی ئەمە دەربکەیت، بەوشێوەیەی کە من ئەمساڵ بەردرێمە سەر لەوەڕی سەوز. لەگەڵ ئەوەشدا ئایا تۆ دەتوانیت لە شتێکی دیکەشدا یارمەتیم بدەیت، لە کاتێکدا ئێستاکە تۆ لێرەی. ئەو مەقەستەی ئا لەوێدایە دەیبینی، چکۆلانەکەی لای چەپی باڵشتی دەرزیەکەوە[13] لەلای چەپی ئەزەلیان[14]ەکەوە، بیهێنەو پاشان نینۆکەکانی پێمی پێ ببڕە. نینۆکێکم هەیەو پێم بریندار دەکات. ئێ چاکە. ئەرێ چۆن ئێمە پێشچاو؟ حەزت لە رۆبەکەم هەیە؟ ئەوە خوشکەکەم لە مالونگ[15] دورویەتی و منیش خۆشم دەوێت، چونکە ئەوە رەنگێکی سووری خۆرینی گەرمی هەیە، ئای چ جۆرێکی نایابیشە. هەروەها ئەو بەخۆی چنینەکانیشی چنیوەو ئەو دوگمە چکۆلانەشی بە باشی پێوە لکاندوە، چونکە من هەردەم دەچم بۆ شێلان و جوملاستیکی نەخۆش و بۆنەوەی جل لەبەرکردن و جل دانان، بە خێرایی جێبەجێ بێت، من هەردەم جلی کەم لەبەردەکەم. باوەڕت هەبێت، ئەوانەی ساباتسبێری گەلێک رووخۆشن. هەر هەموو ئەوانەی ئەوێ دەناسم. ئایا دەتوانی ئێستا قاوە تێبکەی، هەر ئا لەم ئانەدا کوڵی گرتوە، دەتوانم بەدەست هەستی پێبکەم. ئەوەیان کە نان و کەرەیەکی جەعفەری و تەرەتورەی لەسەر بێت هەڵگرە، سێوەکانیشم لەبەر تۆ کڕیون. من ناتوانم بیانجووم، بۆ میوانەکانم دەیانکەم بە چوار قاشەوە چوار قاش هەڵگرە.

نانی لە ماڵەوە برژاویش هەیە، ئەوە ئێدلە، کچە چکۆلانەکەم، خۆی بە تەنورەوەی کردوە. دەبێت موفین[16] و سموێرکلینگور[17] و کێکی سێو[18] و چوکلەی فینلەندی[19]، لێرەدا هەبن. بیسمیلا کچەکە، کوێراییت داماتوە وەکو کوێر لەو ناوە تەپەتەپتە، قوتوەکان بەتەنیشت گەنجینەکەوە نین. تۆ بۆ خۆت دەزانی، من ئەوانم لە ناوەڕاستی مێزەکە لەبەردەستدا داناوە بۆنەوەی دەستم پێیان بگات. ئێخۆ پێشتر من پێم وتویت. پێویستە ماڵەکە رێکوپێک بێت بۆئەوەی پیاو بزانێت چی لە کوێیە. دەزانم هەموو شتەکان لە کوێن، ئەرێ تۆ دەرمانەکانی منت بینیوە. دەرمانی نەخۆشی دڵ، دیگۆکسین[20]، لە قوتوی خڕدا، شلە رۆکەر[21]، لاسیکس[22]، لە قری چوارگۆشەدان، دەرمانی ئازار لە چوارگۆشەی چکۆلانەتردا و ئا ئەوەیان کە لەناو ئەو قوتوە گولدارەدایەو فری حەپە قسلییە چکۆلانەکانی تێدایە لە دژی گرژبوونی دەمار دەیخۆم. من بردەباری[23] هەموو ئەو کچانەی دەزگای خزمەتکاری ماڵەوەم نییە کە جێگۆڕکێ بە شتەکان دەکەن. کاتێک ئەو کیژەی پێشوو دەهات بۆلام و ئێستا نایەت، ئیدی هەرچ کەسێکی تر بێت وەك ئەوە وایە کەس نەهاتبێت. ئەگەر تۆ دەتزانی ئا ئەو کچانە چەندێک ئەم ناوەم لێدەئالۆزکێنن. جارێکیان کەنیشکێك لێرە بوو بۆ جارێکی تر موبیلەی مووبەقەکەی دامەزراندەوە، بە شێوەیەکی وا لەدوای ئەو من پەیم بە هیچ نەدەبرد. بە گریانەوە لەسەر زەوییەکەو بە دوای چاویلکە، بەدوای کوپ، بە دوای هەموو شتێکدا زگەخشێم بوو. ئەترمە ریشی ئەوەی ئەوان لە سۆشیال دەیلێن. من پێم باشترە بە تەنها خۆم جێبەجێی بکەم وەك ئەوەی کەسانێکی تەپۆلی وا خزمەتکاری ماڵ[24]، بیکەن. دوایەمین کەرەت دەڵەشرێك هات یەکسەر بە پەرۆشری ماڵسرینەوە خۆی گەیاند بە چرا نەوتییەکەم، بێگومان سەرکلاوی[25] چراکەی شکاند. ئەوە هی ساڵانی 1500 بوو، ئەوە هەندە کۆن بوو لە نێو شووشەیەکی سەوزی دلڕفێندا بوو. پاشان ئەو ئادەمیزادە خۆی دا لەوەی پارچە شووشەکان بە

گسك بماڵێت، گسكدان، ئایا تۆ شتی لەو بابەتەت بەو ژنە وتوە. وتم، گەر بێتو زەوییەكە بە گسكە كارەباییەكە پاك نەكەیتەوە، ئەوا دەرتدەكەمە دەرەوە، ئەرێ تۆ تێناگەیت ئەگەر خەڵك بە پای پەتی بەسەر زەوییەكەدا ڕێبكەن، دەشێت پارچە شوشە بچەقێتە پایانەوە.

لەم سەردەمەدا خەڵكی هەندە تەپۆڵو كاڵۆسن، ئیدی لەبەر هەر هۆیەك بێت. ئەمە هەم منداڵو هەم گەورەش دەگرێتەوە، سەیری دەوروپشتی خۆیان ناكەن. لەم ڕۆژانەدا خەریكبوو لێرەوە بەرێ كەوم، باڵەكانم وەكو باڵندەیەكی گەورە گرتبۆوە، ئا ئەوها، من ڕاهاتووم وا بكەم، تۆ لەو باوەڕەدا نیت كە زۆرتە زەلامێك بە ڕاكردن هاتو بە تەقلە لەسەر قاڵدرمەكە خستمی، چاویلكەكەم شكا. تۆ خۆت دەزانی كە من چاویلكەم لە بۆ پاراستنی چاوم بەكاردێنم، ئەوەی بایی 650 كرۆنو چوارچێوەیەكی قاوەیی ماهونی[26] هەیە.

ناتوانم لە ماڵی منداڵەكانم بم، چونكە منداڵەكانیان هیچ ئەدەبێكیان نیە. ئەوان هەر دەڵێی دڕندەن، هەر فڕكەفڕكو هاتوچۆیانەو دەبێت هەموو شتێكیان پێبدرێت. ئەوانە خۆڵی نێو ئینجانەی گوڵەكان دەخۆن، شەكەرلەمە دەدزنو قیژەقیژ دەكەن. نەخێر پێم باشترە لە ماڵەوە لەنێو جێگادا لەسەر پشت ڕابكشێمو بە تەلەفون لەگەڵ دەڵەشرەكانی خزمەتی سۆشیالو دكتۆر قسە بكەم. ئیتر لە بۆ خۆم نانوكەرەیەك لە مەعدەنوس، بەسەر نانێكی نەرمو سپیو شەكەرلەمەیەك هەڵدەگرمو بە تەواویش دەزانم تەرمۆزەكە لە كوێ دادەنێم، ئیتر گوێرادێری ڕیكۆردەرو ڕادیۆ دەبم. لەم سەردەمەدا خراپ دەژنەوم، بۆیەكە دەنگەكە تا بەرزترین پلە سوڕدەدەم. دەڵەشرەكەی تەنیشتم كەڕە، ئیتر بۆ ئەو وەك یەك وایە، ئەوانی كەش تاوەكو ئێستا هیچ گازندەیەكیان نەكردوە. زۆربەی جار بە تەلەفون قسەدەكەم. دكتۆر بێریلوند دكتۆرە تازەكەی نەخۆشیی دڵم بە ڕاستی كاتێكی باشم بۆ تەرخاندەكات لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك كاری هەیە بیكات، بەڵام سستەرەكەی، بە ڕاستی مرۆڤێكی ئێسك قورسە، هەردەم ڕووی ترشە، ئەو دەڵێت نابێت سەر لە دكتۆر بشێوێنیت، ئەوجا من دەڵێم بێگومان ئەو بەخۆی ئەوە یەكلادەكاتەوە گەر بێتو سەری لێبشێوێت یا نا، ئەوجا ئێستا ڕێگام بەردە ئەی دەنكە چكۆلانەكەم. ئەو جارەیان كە تەلەفونم بۆ كرد، خۆت دەزانی مانگی ڕابردوو بوو، ئەوكاتەی جەڵتەیەك لێدابووم.

دكتۆر گوتی، *"گوڵەكەم، یەكسەر وەرە"*. هەر یەكاویەك ئەمبولانسەكە هاتو لە كاتێكدا منیان بردە ژوورەوە، هێشتاكانێ من بێهۆش بووم، دەزانی چوومە كوێ؟ بۆ بەشێكی لەو بابەتەی لەوێدا خەڵكەكەی مێشكیان تێكچوە. لەوێدا شێتێكی لێبوو هەموو شەوەكە بۆ ئاو هاواریدەكرد، شەوی دوایی كچێكی لێبوو پەنجەی دەكرد بە چاوەكانماو ئەوجا من گوتم، پێم چاكترە لە كلیدۆرەكەدا بمرم وەك ئەوەی لەم قاوشەدا ڕاكشێم، ئیتر لە دوای ئەوە لە ژووری كەرەنتەیان خەواندم. تا لە دواییدا دكتۆرە ئاساییەكەم خۆی تێهەڵقورتاندو گەیشتمە شوێنی ڕاستی خۆم، ئای خودای گەورەم. سەرم گێژی دەخواردو هیچ هێزێك لەبەر پەنجەكانمدا نەبوو، پاڕامەوە كە لە خواردنی نانی بەیانیاندا لە بادەی لە كاغەز دروستكراو، ڕزگارم بێت. گوتم، من پێویستە شتێكی جێگیری لە فەخفوری دروستكراوم هەبێت، دەنا لە دەستم بەردەبێتەوە. لەو باوەڕەدا نەبن من پیرەژنێكی لەرزۆكی حەپۆل بم، بەڵام من هەستم زۆر خراپە، چونكە سوڕی خوێنم خراپە. پاشان فەخفوریان پێمدا، لەخوا بەزیاد بێت. مەپرسە چی نەگبەتییەك بوو لەنێو جێگادا ڕاكشێیو مێزو گوو

بکەی بە خۆتا، بەڵام دکتۆرەکە ڕێگەی نەدەدام لەنێو جێگا دەرچم. شەوێ وەکو منداڵێکی دز خۆم گەیاندە توالێتەکە، بەڵام بورامەوە. ئەی خوای گەورە دکتۆرەکە چەند بەسەرمدا هات، بەڵام ئەو فریشتەیەکە بۆ خۆی، چونکە ئەو قەعدەیەکی تایبەتی پێدام.

لە قاوشەکەدا سەرگوزشتەم دەگێڕایەوەو میوەو گوڵم بەسەر ئەوانی کەدا دەبەخشیەوە، خانمێك کە سەرەتانی سی هەبوو پرسیاری کرد، چۆن من دەتوانم هەمیشە ئاوەها شادمان بم، من پێمووت کە ئەو دەبوایە داوەشێت بەوەی تەنها گلەیی دەکاتو دەلووشکێنێ. گوتم، ئەتۆیەك کە هەموو ڕۆژێ سەردانیکەریشت هەیە. ئەوجا ئەو گوتی، سەردانیکەر، ئەوە هەر گووم تێکرد، ئێخۆ من دەمرم. من گوتم، تۆ دەبێت دابوەشێیت. تەماشای دەورووپشتی خۆت بکە لە کاتێکدا لە ژیاندا دەتوانیت ببینی، بیر لە من بکەرەوە کە کوێرم. دڵەکەم، کە من چەندێ تەعزیباری ڕووناکی چاوەکانم، بێگومان هەرچییەك هەبێت دەیدەم بۆ ئەوەی ئەوانەم بۆ بگەڕێتەوە.

لە کاتێکدا کە گەنج بووم هەرچییەك هەبوو کردم، خۆشەویستیم کرد، سەفەرم کرد، بە تەواوی ژیام. چوار منداڵم بوو، ئەوەش هەروەك سەما بەڕێوەچوو، بە تەنها لەگەڵ ئەوەی دوایان نەبێت لە کاتێکدا قوەتم دەکرد بۆ دەرکردنی ئازارم هەبوو، ئێخۆ هەروەها ئەوەشیان جێبەجێ بوو. لە نەخۆشخانەو ماڵی پیراندا کارمکرد، من کولفەتکارو چێشتلێنەر بووم. هەر ئەوەندەی منداڵەکان چوونە قوتابخانە وایان لێکرا کە بە خۆیان خۆیان بەرن بەڕێوە، بەڵام لە کاتێکدا کە چکۆلانە بوون لە ماڵەوە لە گەڵیاندا بووم. لەم سەردەمەی ئێستا ئەوە شتێکی ترە. ئێخۆ کچە چکۆلانەکەم دەیەوێت منداڵەکانی بدا بە کەسێکی دیکە، بە تەنها بۆئەوەی کە بتوانێ بجوڵێتەوە. لەم سەردەمەدا ئاوەها تەماشای ئەو شتە دەکرێت، بەڵام خۆ منداڵەکانیش وەکو دڕندەیان لێدێت. ڕەقەڵە، کە من بچکۆلەکەیان وا ناوزەند دەکەم، ئەویان لەسەر مێزی موویەقەکەوە یەکسەر خۆی هەڵدەداتە حەواوەو کارتی پاسی دایکی لەتوپەت دەکات. ئەوە چ جۆرە منداڵێکن.

بەڵێ، ئێستا من لێرەدا لەسەر قەنەفەکە ڕاکشاوم، پێشدەست بەزیوم، ئیفلیجو کوێرو ڕەقوتەق بووم، بەڵام پیاو نابێ گلەیی بکات. لە ساباتسبێری خانمێك کە لەسەر قەرەوێڵەیەك لە تەنیشتمەوە ڕاکشابوو گوتی، ئێستا ئەتۆ ئەی ئامالیا، لەکاتێکدا کە دڵت هەڵەی تێکەوت، ئەوجا پێویستە هاوار بۆ خواو فیلادێلفیا[27] بکەی، نهێنیەك ئالەوەدا هەیە. پیاو بیر لەوە دەکاتەوە بە چی شێوەیەك بمرێت خۆ ئەوە ناکرێت درێژە بە کات بدات. من لەو باوەڕەدام ڕۆژێك لە ڕۆژان ملم لار دەبێتەوە هەر بە ڕاکشاوی دەمێنمەوە، خراپترین شت بۆ کەسوکارەکەیە من بۆ خۆشم بەو خەیاڵانە ڕاهاتووم، ئەوان لە کاتێکدا کەسێك بەو شێوەیە دەبیننەوە لە هۆشی خۆیان دەچن.

کچی باش، ئەتۆ دەزانی، کە ئەوە چەندین جارە لە سەرەوە لە بەرزبوونەوەی ئەسانسۆر[28] ەکە سەرنجمداوە، وە هەر بۆیەکەشە ئەوان ئەوەندە دەمەدەم لەگەڵ سۆشیالدا دەکەن، لە بارەی ئەوەی ئایا من لەلای کچە چکۆلەکەم یاوەکو لە نەخۆشخانە بژیم. بەڵام هەرگیز نابێت ئەو گواستنەوەیە لە ژیانی مندا ڕووبدات. ئا لێرەدا من ئۆرشیدێم هەیە، ئایا تۆ دەبینی، ئۆرشیدێی چکۆلانە، ئەو کابرایەی سەرسووچەکە پێیدام، ئایا بە خەیاڵتا دێت کەسێکی ئاوا لە دڵدا شیرین. لێرەدا کاسێتەکانی ریکۆردەرەکەمو ئەلقەکولیچەی شەکراوی[29] و ئەلبومو شتەکانم هەیە. ئایا تۆ لەو باوەڕەدای پیاو

تەماشاکردنی لەبیر بچێتەوە؟ تەنانەت ئەوەش نا، من هەموو ڕۆژێك، هەموو شتێك دەبینم. ئیتر كەس بۆی نییە گلەیی بكات. لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ هەردەم زۆربەی كاتەكان گریاوە. لە كاتێكدا من دوا جەڵتەم گرت ئا لێرەدا لەسەر زەوییەكەدا كەوتبووم وەك دێڵە سەگێك دەمقروسكاند، فرمێسكەكان دەڕژان و دەڕژان و ئەگەر بهاتبایە هەر هەموو ئەوانە بمەبینایە و ببوونایە بە ئەڵماس ئەوجا هەر هەموویانم دەفرۆشتەوە تەنها بۆئەوەی دووبارە ڕووناكی چاوم بۆ بگەڕێتەوە. ناخۆشترین شت ئەوەیە، بینایی لەدەست بدەیت. ئەوی كەیان هیچ نیە. خۆ پیاو پێشتر گریاوە.

بەڵێ، ئێستاکە قاوەکەش ساردبۆتەوە، بەڵام خۆ تۆ قاوەی دیکەت ناوێت، ئەوجا بە بێنەوەی سەروژێریان بکەیت لەبەردەست لایان بدە، چونکە ماڵەکەمم بە جوانیو ڕازاوەیی دەوێتەوە. دە پێم بڵێ دڵەکەم، خۆ بێگومان تۆ ناتەوێت ئێستاکە بڕۆیت؟ کچە باشەکەم، ئێخۆ ناکرێت تۆ هەر ئێستاکە نەڕۆیت؟ بمێنەوە دڵەکەم، بمێنەوە بەڵێ، دە بڕۆ، من چاك ئەوە دەزانم، تۆ هی خۆت هەیە، خراپترین شت کە من دەیزانم ئەوەیە پیرەژن خۆی بە گەنجەوە هەڵدەواسێت. بە بیرمدا دێتەوە کە پوورێکی پیرم هەبوو، هەرگیز نەیدەهێشت ئێمەی کچ بۆ جێگایەك دەربازبین، لە کاتێکدا دەبوایە دەرچووبینایەو خەریکی کاروباری خۆمان بین، نامەوێت بەو شێوەیە بم، من ئەوەم گەلێك جار بە منداڵەکانم گوتوە، من کاری خۆم مەیسەر دەکەم. ئەوجا ئەتۆ بڕۆ ئەی دڵەکەم، وە بە ئاگادارییەوە لە داڵانەکەدا بڕۆ، بەو شێوەیەی کە نەعلەکانم بەر پێت نەکەونو لەبەردەستدا نەمێننەوە، چونکە لە کاتێکدا کە پاشتر دەچمە دەرەوە بۆ توالێتەکە، ئەوکاتە پێم هەڵدەکەوێتو هەڵدەخلیسکێم. دەبڕۆ، دڵەکەم!

## پەراوێزەکان

*ئەم چیرۆکە، لەو بەرهەمەی خوارەوە وەرگیراوە.
Stanna mitt hjarta stanna, P. 132- 140, orfattarforlaget, Uddevalla, 1979.

1-پارکینسۆن Parkinson: نەخۆشییەکی کۆئەندامی دەمارەکانە.

2-گراهام: جۆرە ئاردێکە لە گەنم یا جۆ بە توێکڵەکەیانەوە لە ئاش درابێت.

3-سیلڤەر: ناوی جۆرێکی چایە.

4-ئێکخۆئ Eksjo: شارێکە لە سوید.

5-تۆرلاند: مەبەست لە خەڵکی ناوچەی باکورە، واتا باکورو لەم ڕستەیەدا مانای باکوریین.

7-ساباتسبێری: نەخۆشخانەیەکی ناسراوە لە گەڕەکێکی نێوەندی شاری ستۆکهۆلم.

8-ترێت: خواردنێکی بە تەواوی نەرمکراو بۆ ئەو کەسانەی توانای جاوینیان نییە.

9-جوملاستیکوانی نەخۆش: ئەو وەرزش و مەشقکردنەیە بە نەخۆش دەکرێت لە بۆ گەڕانەوەی بۆ دۆخی ئاسایی یاوەکو هەندەی لە توانای نەخۆشەکەدایە فێربکرێتەوە. لەهەمانکاتدا بەو کەسەی ئەو مەشقانەیان فێردەکات دەوترێت: جوملاستیکوانی نەخۆش.

10-ماڵی پیران: بەو ماڵانە دەوترێت کە مرۆڤی بە تەمەنی تیادا دەژێت و لە لایەن هێزی فیزیاوی لەشەوە توانای جێبەجێکردنی کاروباری ژیانی خۆیان نەبێ و هەردەمیش لەو خانووانە کارمەندی لێیەو یارمەتییان دەدەن لە پێویستییەکانی ژیانیاندا.

سۆسیال یاوەر: ئەو کەسەیە کە لە سۆشیالدا ئەرکی کاروباری یارمەتیدانی تۆ بەخۆوە دەگرێت.

12-ئامبرۆسیۆس Ambrosius: خۆراکی خواکانە لە ئەفسانەی گریکییەکاندا.

13-باڵشتی دەرزیەکەوە: ئەو پارچە لباد یا پەڕۆیەیە دەرزی درومانی پێوە دەچەقێنرێت.

14- ئەزەلیان: جۆرە ڕووەكێكی ڕازاندنەوەی نێو ماڵانە.

15- ماڵۆنگ Malong: ناوی شارێكە لە سوید.

16- مولین: جۆرە كێكێكە.

17- سمولیر كلینگور: جۆرە كێكێكە.

18- كێكی سێو: جۆرە كێكێكە لە سێو و ئارد و شەكر و سێو دروستدەكرێت.

19- چوكلەی فینلەندی: جۆرە شەكرلەمەیەكی باریكی چكۆلانەیە.

20- دیگزكسین Dioxin: ناوی پێكهاتەیەكی كیمیاوییو دەرمانە.

21- شلە ڕێگەر: لێرەدا مەبەستم لەو دەرمانانەیە كە بەكاردەهێنرێت لە بۆ یارمەتیدانی لەش بۆ پاڵنان بەو ئاوانەی دڵ لە توانایدا نییە دەریانبكاتەوە دەرەوە بە شێوەیەكی ئاسایی ئەو لەخۆشانە قاچوقولیان دەپەنمێت، ئەوەش بە هۆی مانەوەی ئەو ئاوە زیادانەیە لە لەشدا، وا تێدەگەم لای خۆمان بادارێ پێدەڵێن.

22- لاسیكس Lasix: ناوی پێكهاتەیەكی كیمیاوییو دەرمانە.

23- بردەبار: تەحەمول.

24- لێرەدا مەبەست لەو كەسانەیە كە سەر بە دەزگای سۆشیالن و ڕۆژانە ماوەیەكی دیاریكراو خزمەتی ئەو كەسانە دەكەن كە لە توانایاندا نییە كاری ڕۆژانەی خۆیان ئەنجام بدەن.

25- سەركلاو: ئەو شووشەیەی دەخرێتە سەر چرای نەوتین پێی دەگوترێت سەركلاو، واتا جامی چرا.

26- ماهونی: ڕەنگی داری ماهون.

27- فیلادێلفیا: ناوی كڵێسایەكی گرووپی پینگستەو پینگستیش وەكو نیمچە مەزهەبێكی ئایینی مەسیحیی سەر بە گرووپی پرۆتستانتە.

28- ئەسانسۆر: بەرزكەرەوەیەكەو بە عەرەبی مصعدی پێدەوترێت.

29- ئەلفە كولیچەی شەكراوی: جۆرە كێكێكە.

# گفتوگۆ



## وێنەی ڕۆشنبیری کلاسیکی

گفتوگۆیەک لەگەڵ

(ژان پۆڵ سارتەر)دا

بییر بنیشۆ

# وێنەی رۆشنبیری کلاسیکی

## - گفتوگۆیەك لەگەڵ ژان پۆڵ سارتەر -

■ سازدانی: بییر بنیشۆ

● و. لە عەرەبییەوە: بروا عەلادین




**بنیشۆ: ئەو کێشەیەی باسیدەکەم لەگەڵ سەرەتای شەستەکاندا لە ئەمریکا دەستیپێکرد، لە1965یشدا هات بۆ ئەڵمانیاو پاشتر لە 1968دا گەیشتە فەرەنسا: مەبەستم شۆڕشی لاوانە. ئەم رووداوە بەئەندازەیەك کاری تێکردیت، کە جارێك وتت پێویستە لەمەودوا بەزۆربەی بۆچوونە سیاسیەکانم و هەڵوێستە ئەدەبی و فەلسەفیەکانمدا بچمەوە. دەتوانیت پێمبڵێیت چۆن گۆڕایت؟**

**سارتەر:** کاتێك ئەو رووداوانە دەستیانپێکرد، هەرگیز نەمدەزانی خەریکە کارمتێدەکەن. بەلام بایەخم پێدەدان، بەتایبەتی چونکە لاوان پرسیاریان لێدەکردم. پاشتر لە ناوەڕاستی مایۆی 1968دا چووم بۆ سۆربۆن تاوەکو قسەبکەم، ئەوەبوو زۆر بەچاکی پێشوازیم لێکرا. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی شتێك بڵێم نرخ و بەهای هەبێت، چونکە هێشتا هیچ شتێك تێنەگەیشتبووم لەوەی کە روویدەدا. هێواش هێواش لەساڵی 1969دا تێگەیشتم... تێگەیشتم لەوەی ئەو شتەی لاوان رەخنەی لێدەگرن و شۆڕشی بۆدەکەن شتێکە لەناوماندایە... هەروەها لەناو منیشدایە... ئەو شتەیش بریتییە لە: کولتور.

ئەوەش زۆر شتێکی ئالۆز بوو، چونکە ئەو لاوانەیش خۆیان بەو پێیەی قوتابی بوون و خەریکی

دوا تاقیکردنەوەی سەری ساڵ بوون، ڕۆشنبیر بوون. بەڵام ئەوان شۆڕشیان بۆ ئەو کولتورە خۆی دەکرد! ڕۆشنبیری کلاسیکی خاوەنی هێزێکەو هەر کاتێکیش بیەوێ لەژێر فەرمانی خۆیدایە. ئەو خاوەنی مەعریفەیەکەو ئەو مەعریفەیەش خۆی - زۆر ناعادیلانە - خۆی دەگۆڕێت بۆ هێز. مەبەستم لە ڕۆشنبیری کلاسیکی نوسەران نییە، بەڵکو ئەوانەی خەریکی ئیشی سەربەخۆن: پزیشکو ئەندازیارەکانو...تادوایی. ئەمانە ئەو کەسانەن کە وادەزانن لەپێناوی چاکەی جیهانیدا کاردەکەن. ئەو پزیشکەی لە نەخۆشییەك دەکۆڵێتەوە لەپێناوی مرۆڤایەتیدا ئەم کارە دەکات... لە هەمان کاتیشدا دەزانێت ئەم جیهانیبوونە لەڕێی چینە تایبەتییەکەی خۆیەوە پێیدراوە کە چینی بۆرژوازییە، دواجار ئەمەش خۆی لەخۆیداو بەشێوەیەك لە شێوەکان دەگۆڕێت بۆ شتێکی لەبەریەکهەڵوەشاو... هەربۆیە وا هەستدەکات ئەو کەسە نییە کە بووە یان دەیەوێت ببێت. بەهۆی ئەمەیشەوە خەم دەخوات، چونکە هەستدەکات ویژدانی دڵنیا نییە: لە چرکەساتێکدا بەهۆی مەعریفەو زانیارییەکانیەوە جیهانییە، لەکاتێکی دیکەیشدا بەهۆی ئامانجیەوە لە مەعریفەکەی تایبەتی یان شەخسییە... ئەم ناکۆکییەش لەناو سروشتی خۆیدا بەرەو بینینی کۆمەڵگەیەکی دەبات جیاواز لەو کۆمەڵگەیەی ئومێدەوار بووین بۆی ئامادەبکەین.

**بەکورتی:** ڕۆشنبیری کلاسیکی وەڵامگۆیە بۆ چەپاندنی ئامانجە تایبەتیەکەی تا ئەو سنوورەی کۆمەڵگە بۆی دیاریکردووەو لە ئەنجامی ئەمەیشدا دەبێتە یەکێك لە ڕەخنەگرەکانی ئەو کۆمەڵگەیە، بەڵام ئەمە ڕێگەی ئەوەی لێناگرێت ببێتە بۆرژوازی، چونکە سوود لە ویژدانە گوناهبارەکەی وەردەگرێت. ئەو دەگۆڕێت بۆ پیاوێك کە لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا قسە دەکاتو گوێبیستی چەپڵەی جەماوەر دەبێت... دەگۆڕێت بۆ نوسەری کتێبۆچکەی بچوك بچوك دەربارەی ئەو شەڕو خراپەکارییەی لە کۆمەڵگەدا هەیە... دەگۆڕێت بۆ جەنگاوەرێك کە لەپێناوی هەمووانداو لەسەر ئاستی جیهانی سەنگەری شەڕ دەگرێت... لە هەمان کاتیشدا سوود لە هەموو ئەو بارودۆخانە وەردەگرێت، سوودی ئەوە وەردەگرێت کە ڕۆشنبیرە. با بۆ ئەمەش نمونەیەك لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەمریکا بهێنینەوە، زانایەکی سروشتی یان کیمیا... با هەر واشبزانین هێشتا لەسەردەمی جەنگی ڤێتنامداین... لەڕاستیدا هەموو جیهانی ئەمریکی خەریکی کارکردنە لەپێناوی جەنگی ڤێتنامدا، واتە هەموو مەعریفەو توانا زانستییەکانی تەرخانکردووە لەپێناوی بردنەوەی مرۆڤی ئەمریکی لە جەنگی ڤێتنامدا... لە هەمان کاتیشدا گەر بۆی دەربکەوێت هەموو زانیارییە زانستییەکانی لەپێناوی ئەو جەنگەدا بەکاردەبرێت، ئەمە نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەدا بچێتە کۆبوونەوەیەکی گشتییەوەو لەبەردەمی هەمووان‌دا بڵێت دژی ئەو جەنگەم. لێرە لە فەرەنسا هەڵوێستەکە بەو ئاشکراییە نییە، بەڵام بوونی ڕۆشنبیر بەو شێوەیەی لە فەرەنسا هەیەو لێکمدایەوە، تەواو لەوە دەچێت کە لە فەرەنسا هەیە. من خۆم لەگەڵ هەندێ کەسی دیکەدا تاوەکو *1968* ڕۆشنبیری کلاسیکی بووین: لە هەندێ مانگرتندا بەشداریمانکردووە... لەزۆر کۆبوونەوەدا ئامادەبووینو وتومانە دژی جەنگین لە جەزائیر... ئێمە چووبووینە ریزی جەماوەرەوە.. ئەمەش خۆی ئەو شتەیە کە ساڵی *1968* لاوان لە دژی ڕاپەڕین. ئەوان ئەو ڕۆشنبیرەیان نەدەویست کە لەجیاتی ئەوەی خۆیان وەك خۆیان بن، وەك هەڵبژێردراو خۆیان نیشاندەداو پێشکەشدەکرد.

***بنیشۆ: لەگەڵ ئەوەشدا کە بیست ساڵ خەریکی ئەوە بوویت ڕۆشنبیران بن بەیەك یاخو ببنە هاوەڵی یەکدی... کەچی ئەوەتا ئێستا ئەو هاوەڵیو یەکبوونە ڕەتدەکەیتەوە.***

**سارتەر:** بەڵێ، بەلام بیست ساڵ بەر لەئێستا ئەوەم نەدەزانی.. مەبەستم لە وشەی بەهاوەڵبوونی یەکدی، هاوەڵێتی نێوان کاری رۆشنبیران یا هونەرمەندان بوو یەکشتی... کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وێنەی رۆشنبیری کلاسیکی ئەمڕۆ بەمشێوەیەیە: پشوویدلوەو پاڵی لێداوەتەوە... خاوەنی شوقەیە... ژیانێکی ناخۆشە خراپ ناژی... وردە بۆرژوایە... ئەم ووشەیە پڕ بەپێستی خۆیەتی، لەژێر ئەم دروشمەیشدا دەتوانێت ئەو هاوەڵبوونە بەدەستبهێنێت کە باسمکرد، ئەویش لەرێگەی ئامۆژگاریکردنی جەماوەرەوە.. بەناوی چییەوە؟ ئەی بۆچی جەماوەر بایەخ بەمجۆرە کەسە دەدات؟ ئەمە ئەو مەسەلەیەیە کە گەنجان لە دژی راپەڕین. بەلای ئەوانەوە رۆڵی رۆشنبیر ئەو رۆڵە نییە کە خۆی بۆخۆی هەڵبژاردبوە... بەڵکو دەبێت سروشتی کولتور لەژێر تاقیکردنەوەدا بێت.

***بنیشۆ: ئایا ئەو کێشانە چین کە تۆ لە پەیوەندیتدا بە جەماوەر لەلایەک و، بۆرژوازییەکان لەلایەکی دیکەوە توشی هاتوویت؟***

**سارتەر:** ئەوەت لەبیر نەچێت کە من تەمەنی هەفتا ساڵیشم بەجێهێشتووە... من لەو رۆشنبیرە کلاسیکیە دەچم کە جۆتە تەمەنەوەو هێشتا خەریکەو جێپێی ئەم و ئەو هەڵدەگرێت. ویژدانی ناڕازیم کاتی تەواوی هەبوو بۆئەوەی گەشە بکات و گەورە ببێت. هەربۆیە ئاشکرایە کە من ناتوانم بەشێوەیەکی سروشتی وەک ئەو لاوە بگۆڕێم کە لە تەمەنی بیست ساڵیدایە، بەلام لەو چرکەساتەدا کە زانیم پەیوەندییەکانم بەسنیین، ئاراستەیەکی دیکەم وەرگرت. ئەمڕۆیش من پەیوەستییەکی تەواوم بە خەلکیەوە هەیە... هەمیشە لەگەڵیانم... مەبەستم لەوەیە خۆم لەگەڵیانم... بە بوونم ئەوەک فیکرم... ئەوش ئەرکی سەرشانی هەر تاکێکە.

ئەوەش فێربووم کە کۆبوونەوەو ئیمزاکردن لەسەر بلاوکراوەکان لە ئێستادا هیچ مانایەکی نییە.

***بنیشۆ: پێتوایە ئەوەی کە باسیدەکەیت بۆ هەر دەوڵەتێکی فەرەنسی راستبێت، یان تەنها بۆ رۆشنبیری فەرەنسی دەشێت؟***

**سارتەر:** کەم تا زۆر لە هەموو شوێنێك هەر وایە. بێگومان من زیاتر ئاگاداری هەڵوێستی فەرەنسیم، بەلام هەمان شت لە ئیتاڵیاو ئەمریکایش هەیە.

***بنیشۆ: بەڕاندەیەك گۆڕاویت کە تەنانەت شێوازی جلەکانیشت گۆڕیوە. هەندێك خەڵك پێدەکەنن کاتێك دەتبینن بەم تەمەنەوە ئەو جلوبەرگە گەنجانەیە دەپۆشیت!***

**سارتەر:** ئەزانم، بەلام وێنەی رۆشنبیری کلاسیکی بە کراس و بۆینباخێکەوە، بە قاتێك جلی تەواوەوە.. ئەم وێنەیە بێزارم دەکات. ئەوساش تەنها لە هاویندا باشبووم چونکە وەک ئێستا کراس و پانتۆڵێکی ئاسایم دەپۆشی.

ئەم بڕیارەشم لەو کاتەدا دا کە لە فینیس بووم. بەخۆمم وت هەستدەکەم پاش ئەو هەموو تەمەنە دەبێت ئازادبم لەوەی حەزم لە چ جلوبەرگێك بێت بیپۆشم. جلوبەرگی بۆرژوازی... کراسی سپی و بۆینباخ و چاکەت و تادوایی... هەموو ئەم شتانەم بە کارەسات دەزانی، بەلام پێشتر نەمدەتوانی بیانگۆڕم چونکە خەڵکی بە شێتیان دەزانیم. پێشتر دەستبەرداری خۆم بوویووم، بەلام لەمەودوا هەرگیز دەستبەرداری حەزو ئارەزووەکانم نابم.

## سەرچاوە

*عبدالمنعم سليم/ جولة في العقل الاوروبي، دار ابن زيدون/ الطبعة الاولى ـ 1986 .*

# ئینسایكلۆپیدیای زاراوەی رەخنەی ئەدەبی

- ئەفلاتون
- ئەرستۆ
- ئەفسانەو ئەفسانەناسی
- هاوكێشەی بابەتی

د. بەهرام میقدادی

# ئینسایکلۆپیدیای زاراوەی ڕەخنەی ئەدەبی

● و: ئازاد بەرزنجی

### ئەفلاتون

**ف: افلاطون**

**ع: افلاطون Plato**

دامەزرێنەری تۆژینەوەی بنەماکانی ئەدەب لە ئەورووپادا ئەفلاتونە. هیچ کارێکی ئەو لەو کارانەی کە ماونەتەوە بە تەواوی بۆ ئەدەب تەرخان نەکراون، بەڵام ڕاو بۆچوونەکانی ئەو سەبارەت بە شیعرو شاعیرو شێوەو ماناو کاریگەرییەکانی لەسەر پاسەوانانی ئایندەی کۆمارە ئایدیالیستیەکەی، لەپاڵ بابەتە سەرەکیەکانیدا وەکو: خوێندن و خوداناسی و ئاکار.. خراونەتەڕوو.

تێڕوانینی ئەفلاتون بۆ هونەر بە شێوەیەکی تایبەت تێڕوانینێکی سوودخوازانەو، مامۆستایانەو توندڕەوانەیە. ئەو بڕوای وایە کە شاعیر لە کاتی داهێناندا دەکەوێتە ژێرکاریگەریی سروشی خواوەندییەوەو دەسەڵاتی بەسەر هەست و سۆزی خۆیدا نامێنێت. لە ڕوانگەی ئەفلاتونەوە: خواوەند بۆ گەیاندنی پەیامەکانی خۆی، شاعیر دەکاتە نێوەند، لەبەرئەوەی سروشی خواوەندی لە ڕووی کاریگەرییەوە لە موگناتیس دەچن کە نەک هەر شاعیر، بەڵکو گوێگریش (بەتایبەتیش لاوان) دەخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە، بەڵام گرفتەکە ڕەخنەی دێتە ئاراوە کە هیچ مرۆڤێك لە توانایدا نیە بەسەر تەواوی زانست و هونەرەکاندا باڵادەست بێت و شاعیرانێکی وەکو هۆمیرۆس کە لە شیعرەکانیاندا سەبارەت بە بابەتگەلێکی جۆراوجۆری وەکو کەشتیەوانی و پزیشکی دەدوێن؛ تەنها بە لای کەسانی ڕەمەکی و بێئاگاوە گەورە دەنوێنن، لە کاتێکدا کەسانی بە ئاگا دەزانن کە ئەو زانیارییانە ڕووکەش و درۆی پەتین، کەواتە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە بە بۆچوونی ئەفلاتون شاعیران ناتوانن ببنە گەیەنەرێکی گونجاوی پەیامە خوداییەکان.

پاشان ئەوە ڕووندەکاتەوە کە خواوەندەکان، لە هەموو بوونەوەرەکان زاناترو بەهێزترن و پێویستیان بە درۆو هەڵە نیە، کە خاسیەتی بوونەوەرە ناکامڵ و نەزانەکانە. هەر بە پێی ئەم بۆچوونەی، شاعیرانێکی وەکو هۆمیرۆس کە لایەنە خراپ و چەپەڵەکانی سروشتی خواوەندەکان و کەسە

نزیکەکانیان دەخەنەڕوو، خەتەرناکن و دەبێ لە کۆمارە ئایدیالیستیەکەی ئەفلاتون دەربکرێن.

ئەفلاتون لە درێژەی باسەکانیدا لەسەر شێوەی لاساییکردنەوەی کەسانی جۆراوجۆرو شێوازی گێڕانەوەی چیرۆک دەدوێت. لاساییکردنەوەی کەسانی چەپەڵ لە کاری ئەدەبیدا بە شتێکی خەتەرناک ئەژمێرێت، لەبەرئەوە دەڵێ لەوەدەمەدا کە پارێزەرانی کۆمار سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەمجۆرە کارانەن بە دەنگی بەرزەوە، حەز بە لاساییکردنەوەی ئەو کەسە خراپانە بکەن و گیروگرفت بۆ کۆمەڵگا دروستبکەن. هەڵبەت بەلای ئەفلاتونەوە؛ شانۆنامە گومڕاکەرترین جۆری ئەدەبییە.

هەروەها ئەفلاتون بڕوای وایە کە لاساییکردنەوەی شتە جیاوازەکان لە شیعردا تەنها بەیەک شێوە کاریگەریی خراپ ناکاتە سەر زەینی خوێنەر، ئەمەش دەکەوێتە سەر ئەو شتەی بابەتی لاساییکردنەوەکەیە، بەڵام بە سەرنجدان لە تیۆرەی ئایدیاکان، دەبینین کە لە سروشتی هەر شتێکدا ئایدیایەک هەیە کە خواوەندی گەورە خالقێتی. تەواوی شتەکانی ناو سروشت کۆپیەکی ساختەی ئەو ئایدیا سەرەکیانەن کە خولقێنەرانی وەکو دارتاشان و سەنعەتکاران بە ڕەچاوکردنی ئایدیای زاڵ بەسەر بیروڕای گشتی و بە پێی پێویست خولقاندوویانن. شاعیران و نووسەران لاسایی ئەم کۆپیە ساختانە دەکەنەوەو دەرەنجامیش، بابەتەکانیان دەبێتە وێنەی سێیەمی ڕاستی و بە دەربڕینێکی دیکە، دەبێتە درۆی پەتی و هیچ بەهایەکیان نابێت.

هەروەها ئەو لە درێژەی باسەکانیدا ئاماژە بۆ یەکێك لە گەورەترین زیانەکانی ئەدەب دەکات کە ئەویش بەهێزکردنی بەشێکە لە هێزە زەینیەکانی مرۆڤ کە بەرامبەر بە لۆژیک دەوەستێتەوە. ئەم بەشەش هەستەکانی وەکو: بەزەیی، خەم، ترس، خۆشی و.. لەخۆدەگرێت و بەسەردا زاڵبوونیان دەبێتە

هێزی ئەوەی خەڵکانی بە ئاینەکەی پاسەوانانی ئایندەی کۆمارەکەی ئەفلاتون، پاش ماوەیەک لە کاریگەریی ئەو هەستانە ڕزگاریان بێت و بە گوێرەی لۆجیک و بە پێی بەڵگەنامەکانی ڕژێم ڕەفتار بکەن.

جگە لەمانە، ئەفلاتون زۆر بایەخ بە ئەرکی ئەخلاقی گرنگی سەرەکی بە مانا دەدات. ئەو تەنها ڕێ بە بوونی شیعرێک دەدات لە کۆمەڵگادا کە بە مەبەستی ڕێنوێنی و ماندانی خەڵک بۆ گوێڕایەڵی لە بەرامبەر بالادەستەکانی کۆماری ئەفلاتون، لەو پێوەندییەدا هەروەها لە ڕوانینی ئەوەوە ئاڵە باوەڕانی ئاینییەکە بۆ کاری هونەری، کەسانی شارەزان لە بەرامبەر ئەخلاقییە دروستەکانی کۆمەڵگادا، لەبەرئەوە دەبێ سپاردنی ئەم ئەرکە بە خەڵکانی دەسەڵات، ئەنجامی بە ئازادی کارپێکی هونەر پێش سەرکەوتنی هەوام دەشکێنێتەوە.

گەرچی تیۆرەکانی ئەفلاتون سەبارەت بە ئەدەب نیازو مەبەستدارن، بەڵام ناکرێ ئەو ڕۆڵە گەورەیەی ئەو ببینین، وەك دامەزرێنەری ڕەخنەی ئەدەبی فەرامۆش بکەین. گەر ئەو بۆچوونە دژەکانی خۆیشی سەبارەت بە ئەدەب نەخستایەتە ڕوو، لەوانە بوو ڕەخنەگرانی دوای ئەو لە ڕێی وەڵامەکانیانەوە درێژەیان بەم نەریتە گەورەیە نەدایە.

## سەرچاوە


*David Daiches. Critical Approaches To Literatre. 1st ed. London: Longman 1956*

*Hazard Adams. ed. Critical Theory Since Plato. New York: Harcourt Brace Javanovich, Inc, 1971.*

*Richard Datton. An Introduction To Literary Criticism. 3rd ed. Essex: york press. 1986.*

## ئەرستۆ

**ف: ارسطو**

**ع: ارسطو** *Aristotle*

*ئەرستۆ (394-322پ.ز)ی فەیلەسووفی سەدەی چوارەمی پێش زایین، لە شاکارەکەی خۆیدا Poetics لە ماهیەتی ئەدەبو بەشە پێکهێنەرەکانی کۆڵییەوەو بەمجۆرە توانیی لە ڕێی سەلماندنی ڕاستیو گرنگیی ئەدەبەوە،بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆچوونەکانی ئەفلاتوونی مامۆستای ڕەتبکاتەوە.*

ئەرستۆ لە سەرەتادا جۆرە ئەدەبییەکانی سەردەمی خۆی دەژمێرێت کە بریتین لە : شیعری داستانی، تراژیدیاو کۆمیدیاو شیعری لیریکی. بە بڕوای ئەرستۆ توخمی سەرەکیی پێکهێنەری تەواوی جۆرە ئەدەبییەکان،لاساییکرنەوەیە، بەلام ئەم جۆرانە لە فۆرمو ماناو چۆنێتیی لاساییکردنەوەدا لەیەك جیاوازن. بە پێچەوانەی ئەفلاتوونەوە، ئەرستۆ لەو بڕوایەدایە کە لاساییکردنەوە بە پێداویستییەکی سروشتی دەژمێردرێ لە مرۆڤداو ئەو چێژەی لێیەوە پەیدادەبێت، هاوشانە لەگەڵ فێربوونی کۆمەڵێك مەسەلەدا. لەم ڕەوتەدا چۆنێتیی لاساییکردنەوە یان شێوەی خستنە ڕووی ماناش بایەخی زۆری خۆی هەیە. پاشان باس لە جیاوازییەکانی نێوان تراژیدیاو کۆمێدیا دەکات.

بە بڕوای ئەو خەڵکی دەکرێن بە دوو دەستەوە، بەرزو نزم. ئەو شاعیرانەی کە دەرکێکی قووڵتریان بۆ مەسەلەکان هەیە، تراژیدیا دەنووسن، کە پاڵەوانەکانی کەسانی بەرزی نێو کۆمەڵن. لە لایەکی ترەوە، ئەو شاعیرانەش کە مەیلیان بەلای شتە لاوەکیو کەمبایەخەکاندا هەیە، لە کۆمێدیادا خەڵکی نزم دەخەنەڕوو. بەداخەوە ئەو بەشەی کارەکانی ئەرستۆ کە تایبەتە بە کۆمێدیا، نەماوەتەوە، یان دەشێ هیچکاتێ بواری خۆ تەرخانکردنی بۆ ئەو کارە نەبوویێت، بەلام لە ژێر کاریگەریی بۆچوونەکەی ئەودا تاماوەیەکی زۆر کۆمێدیا بە جۆرێکی نزمتری ئەدەب لەقەڵەم دەدرا. ئەرستۆ لە ڕێی پێناسەکردنی تراژیدیاوە بەوەی کە لاسایی کردنەوەیەکی کاملۆ بەرزی کردنەوەی مرۆڤەکانە، وەلامی ئەو لێدوانانەی ئەرستۆ ئەداتەوە کە تیایاندا باس لە کاریگەریی خراپی هونەر لەسەر مرۆڤ دەکات. بە بڕوای ئەرستۆ بینینی تراژیدیا هەستی ترسو بەزەیی لە مرۆڤدا دەبزوێنێت (دەترسێت لەبەرئەوەی کە دەشێ ڕووداوێکی وەکو ئەوەی بەسەر پاڵەوانەکەدا هاتوە بەسەر ئەمیشدا بێت. لە کاتێکدا بینەران لە پایەدا لە پاڵەوانی تراژیدیا نزمتریشن، بەزەییش لەبەرئەوەی کە پاڵەوانی تراژیدیاکە شایانی ئەو سزایانە نیە کە خواوەندەکان بەسەریاندا سەپاندوە). ئەم هەستانە بە ئامرازی پاکژکردنەوەی دەروونو خاڵیکردنەوەی ئەو هەستانەی بینەر دەژمێررێن. بەم پێیە بە پێچەوانەی تیۆرەکەی ئەفلاتوونەوە، ئەدەب نابێتە هۆی کەڵەکەبوونی ئەو هەستانە.

لە درێژەی لێکۆڵینەوەکەیدا لە تراژیدیا، ئەرستۆ بەشە پێکهێنەرەکانی تراژیدیا بە پێی گرنگییان ڕیزدەکات. ئەم بەشانە بریتین لە: کردار، کەسێتی، هزر، گوتار، دیمەنو ئاواز. لەم ڕیزبەندییەدا کردار بە پلەی یەکەم دێ، لەبەرئەوەی بەبۆچوونی ئەرستۆ تراژیدیا پیشاندەری ژیانو کردەوەی مرۆڤەکانە. سەرەنجام تراژیدیا بێ وازی(کردار) نابێت، لەکاتێکدا بێ کەسێتی تراژیدیا دەخولقێت. کردار دەبێ خاوەنی سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتایی بێتو بەشەکانی چیرۆکەکە تەواوی چیرۆکەکە بەرەو پێشەوە ببەن، بە جۆرێك ئەگەر بەشێکی چیرۆکەکەمان لابرد دەبینین کار دەکاتە سەر هەموو چیرۆکەکە، هەرئەمەشە کە پێی دەوترێ یەکەی کردار.

لە وەلامیدا بۆ لێدوانەکانی ئەفلاتون لەسەر ئەدەب، بەوەی گوایە لاساییکردنەوەی دەستی

سینیەمی ڕاستیە، ئەرستۆ باسی شیاوی ئەستەمو نەگەری نەشیاوی هێنایە گۆڕێ. بە بڕوای ئەرستۆ کاری شاعیر لاسایکردنەوەی پەتی شتەکانی ناو سروشت نیە. ئەو ناچارە کە بابەتەکە وەها پیشان بدات کە خاڵە سەرەکییەکانو ڕاستیە جیهانیە شاراوەکانی تیا بەرجەستە بێتو دەرەنجام ڕوانینێکی والاتریش سەبارەت بە بابەتەکە بێتە ئاراوە. ئەو دونیایەی کە شاعیر دەیخولقێنێت، دونیایەکی نەشیاوەو جیاواز لە دونیای واقیعی یاسای تاوەکیی خۆی هەیەو ڕووداوە جۆراو جۆرەکان تیایدا شیاون.

شایانی باسە کە ئەم دونیایە لەسەر بناغەی جیهانە واقیعییەکەش بیناکراوە، بەلام مێژوونووسێك لەگەڵ ئەدیبێکدا لەوەدا جیاوازن کە یەکەمیان ڕووداوەکان خۆیان چۆنن هەرواو بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك تۆماریان دەکات. لێرەوە دەتوانین بڵێین کە ئەرستۆ *شیاوی ئەستەمی* پێ لە *نەگەری نەشیاو* باشترە. هونەر وەکو ئامرازی پەیبردنە بە ڕاستیو شتێك نیە دژی ڕاستی بێت. لەمەشدا ماناو شێوە زۆر گرنگن. بە واتایەکی دی، گواستنەوەی مانا بەبێ سوود وەرگرتنی هونەرمەندانە لە شێوە نابێتە هونەر.

تیۆرەکانی ئەرستۆ لەم بارەیەوەو لەزۆر بارەی ترەوە بوونە سەرچاوەیەك بۆ ڕەخنەنووسانی دواتر، بەلام هێندەی پەیوەندیی بەسێ یەکەکەوە هەبێت کە هەندێ کەس بە هەڵە دەیخەنە پاڵ ئەرستۆ، لە سەردەمی ئەلیزابیسدا کۆمەڵێك دژەبۆچوون هاتە گۆڕێ. شایانی باسە کە ئەرستۆ نەهاتوە تا دەستوورو یاسایەکی نەگۆڕ بۆ ئەدەب دابنێت، بەڵکو تیۆرەکانی ئەو لەوە دەکۆڵێتەوە کە هەبوە، واتە بەشە پێکهێنەرەکانی ئەدەب.


سەرچاوەکان

1-David Daiches.critical Approaches to literature.1st ed. London. 1956.

2-Hazard Adams-ed. Critical Theory Since Plato. New York: Harcourt Brace. Jovanovich Inc. 1971.

3-Richard Dutton. An introduction to Literary Criticism. 3rd ed. Essex: York Press, 1986.


## ئەفسانەو ئەفسانەناسی

**ف: اسطوره و اسطوره شناسی**

**ع: الأساطیر و علم الأساطیر**

*Myth and Mythology*

لە یۆنانی کۆندا وشەی **mythos** (**myth** بە مانای ئەفسانە دێو لەوەوە وەرگیراوە) بە هەر بەسەرهاتو حیکایەتێکیان دەوت، چ واقیعی بووبایە یان خەیاڵی. بەلام ئێستا ئەفسانە بەو چیرۆکو حیکایەتە کۆنو خەیاڵیانە دەوترێ کە سەروەختێ خەڵك بە ڕاستیان زانیون. ئەم چیرۆکانە بە زۆری بیانوو هێنانەوەو وەلامێك بوون بۆ پرسیارە بێشومارەکانی خەڵکی کۆن سەبارەت بە چۆنێتیی پەیدابوونی دونیاو یاساکانی سروشت. ئەو حیکایەتە ئەفسانەییانە لە ڕاستیدا هەوڵێك بوون بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە، بە شێوەیەکی پەسەندو قەناعەتپێکەر. بەشێکی زۆری ئەفسانەکان دابو نەریتە جۆراو جۆرەکانو ڕێو ڕەسمە پیرۆزەکان دەخەنە ڕوو، بەلام بە فۆرمی جیاجیا. ئەمڕۆ زۆر لە کۆمەڵناسان لەو بڕوایەدان کە ئەو دابو نەریتانە سەرچاوەی پەیدابوونی ئەفسانەبوونو زۆریش هەن کە ڕای پێچەوانەیان هەیە.

لە ڕاستیدا دەتوانین ئەفسانە بە ئاینێکی مردوو بزانین کە چیدی پەیڕەویکارانی نیەو تەنها شاعیران نەبێ، کاتێ وێنەی جوانو بەرزی شیعری خۆیان

دەخولقێنن، پەنای بۆ دەبەن، ئەمە لە کاتێکدا خۆشیان وەکو ئاینێك باوەڕیان پێی نەماوە. هۆمیرۆس و ئەسخیلیۆس و سۆفۆکلیس لەم شاعیرانەن. هەروەها حیکایەتەکانی جۆپیتەرو ڤینۆس و پرمیثوس لەو جۆرەن. جاری وایە بە هەندێ چیرۆکی سەیرو سەمەرەی خەیاڵی تریش دەڵێن "ئەفسانە"، وەکو چیرۆکە ناواقعیەکانی ئەفلاتون کە ئامرازێك بوون بۆ خستنەڕوو و ڕوونکردنەوەی بۆچوونە فەلسەفیەکانی.

شلینگ و شلیگل- کە دوو نووسەری ڕۆمانتیکی ئەڵمانیا بوون- لەو بڕوایەدا بوون کە داهێنانی کاری بەرزی ئەدەبی پێویستی بەوەیە کە شاعیرە تازەکان ئەفسانەی تازە بخولقێنن. ئەفسانەی وەها کە گونجێنەری کاری ئەدەبی بن و ئاوێنەیەك بن لەو ڕوانینانەی لە ئەفسانەی کۆندا هەن لەگەڵ زانستە سروشتیەکان و فەلسەفەی ئەمڕۆدا. هاوکات لەگەڵ کۆمەڵێك حیکایەتی کۆندا. گەلێ لە نووسەرانی سەدەی بیستەم ئەفسانەی وەهایان داهێناوە کە بۆتە مایەی تۆکمەیی کارەکانیان. لەو کارانەش: یۆلیسیس و بێداریی فینیگانەکانی جەیمس جۆیس، زڕخاکی ئیلیەت، ئۆنێل لە *شانۆنامەی ماتەمینی شایانی ئەلیکترایە* و زۆر نموونەی دی.

ئەمڕۆ ئەفسانە و ئەفسانەناسی لە تۆژینەوەی ڕەخنەیی ئەدەبی هاوچەرخدا پایەیەکی تایبەتیی هەیە. گەلێ نووسەری وەکو ڕۆبرت گریڤز و نۆرپ‌روب فرای هەن کە جۆرو بونیادە ئەدەبیەکان بە نموونەگەلێك دەزانن کە لە بنەڕەتدا دووپات کردنەوەیەکی هەمەچەشنی حیکایەتە ئەفسانەییەکانن. بە پێی بۆچوونی فرای، جۆرە ئەدەبیەکانی هەنووکە، هەمان شێوە زەقەکانی ئەفسانەن. ئەو دەڵێت چوار جۆر گێڕانەوەی سەرەکیمان هەیە: کۆمێدی، ڕۆمانسی، شیننامە و کینایە، کە هەر یەکێکیان نوێنەری وەرزێك لە وەرزەکانی ساڵە: کۆمیدیا-بەهار، ڕۆمانسی- هاوین، شیننامە- پاییز، کینایە- زستان.

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە شێوەی جۆراوجۆری چیرۆکی ئەفسانەیی هەیە، کە سەرەکیترینیان بریتین لە:

*1*-ئەو ئەفسانانەی کە پەیوەندییان بە سەرهەڵدانی جیهانەوە هەیە و هەوڵدەدەن پاساوی بۆ بهێننەوە و وێنەیەکی مەعقولی پەیدابوونی دونیا پیشانبدەن.

*2*-ئەو ئەفسانانەی کە پەیوەستن بە کۆتایی جیهان و فەوتانیەوە و هەوڵدەدەن بە شێوازی جیاواز وێنەیەکی کاملترو ڕوونتری بە دەستەوە بدەن.

*3*-ئەو ئەفسانانەی کە پەیوەندیان بە زەمەن و ئەبەدییەتەوە هەیە لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا.

*4*-ئەو ئەفسانانەی پەیوەستن بە زیندوو بوونەوە و لە دایکبوونەوەی وجود کە لە ڕاستیدا سووڕی یەکبەدوایەکی ژیان و مەرگ پیشاندەدەن.

*5*-ئەو ئەفسانانەی بوونەوەرە سەیرو سەمەرەکان و خواوەندە خەیاڵیەکان دەخەنە ڕوو.

*6*-ئەو ئەفسانانەی حاڵ و باری پادشاو مرۆڤە گەورەکان دەخەنەڕوو.

## *بەشداریکردنی بابەتیانە یان هاوکێشەی بابەتی*

**ف: اشتراك عینی** *Objective Correlative*

ع: المشاركة الموضوعية (أو المعادل الموضوعي)

هاوکێشەی بابەتی، زاراوەیەکی ڕەخنەی ئەدەبییە و بە تایبەتیش لە ڕێبازی ڕەخنەنووسە نوێیەکاندا دەیبینینەوە. بۆ یەکەمین جار تی. ئێس. ئیلیەت لە وتاری هاملێت و کێشەکانی (*1919*)دا بەکاریهێنا. لە ڕوانگەی ئیلیەتەوە کاری شاعیر دۆزینەوەی بەراوردو یەکەیە لە ئەزموونە ناتەباکانداو، دروستکردنی پەیوەندیە لە نێوانیاندا.

ئـەم کـارەش لای ئیلیـەت، واتـە دۆزینـەوەی هاوکێشەیەکی بابەتیانە. ئەو دەڵێت:

*"تاقە شێوەی دەربڕینی هەستەکان بە زمانی هونەری، دۆزینەوەی هاوکێشەی بابەتییە، واتە (دۆزینەوەی) زنجیرەیەك شت و هەلومەرج و زنجیرەیەك ڕووداو کە (لەپاڵ یەکدا) بتوانن دەربڕی ئەو هەستە تایبەتییە بن، بەو شێوەیەی کە چۆن ڕاستی بابەتی، کە دەبێ بگۆڕێ بۆ ئەزموونێکی هەستی، پیشان دەدرێ، ئاوەها ئەو هەستە یەکسەر بوروژێنرێ".*

بـە دەربڕینێکـی دی تاقـە ڕێگـای دەربڕینـی هەڵچوون لە فۆرمی هونەریدا، دۆزینەوەی زنجیرەیـەك شت و هەڵوێست و ڕووداوە کـە دەتوانن ببنـە ڕەمزی بزواندنی هەسـت یـان وەبـیر هێنانـەوەی شـتێکی تایبـەت، بـە جۆرێـك کـە ئەگـەر ئـەو فاکتـەرە دەرەکیانـە، کـە دەبوایـە بچنـە بـواری ئـەزموونی هەستیەوە، گوزارشتیان لێ بکرێ، ئەو هەستە یان وەبیرهاتنـەوە تایبەتیـە یەکسـەر دەبـزوێ. لێرەدایە کە یەکێك لە چەکە سەرەکیە شـاعیرانەکانی ئیلیەت خۆی دەخاتە ڕوو.

سـوود وەرگرتـن لـە هاوکێشـەی بابـەتی، لـەو دەربڕینانەن کە مانای ڕواڵـەتی خۆیـان تێدەپـەڕێنن. ئەمانـە بـە هارمۆنیـەتی وروژێنەریانـەوە بـۆ یـاد "لـە زەینـی ئێمـەدا دەنگدانـەوەی دووبـارە دروستدەکەنەوە" و کاریگەریی جیاواز جێدەهێڵن. لـە ڕاستیدا، بنەماکـە ئەوەیـە کـە شـاعیر لـە ڕێـی ڕاسـتەوخۆوە نـا؛ بـەڵکو بـە هـۆی دۆزینـەوەی هاوکێشـەیەکەوە بـۆ هەسـت و هەڵچوونەکانی خۆی، گوزارشتیان لێدەکات.

ئیلیـەت لـە وتـاری هـاملێتدا، جگـە لـەوەی نمایشنامەی هـاملێت بـە شکسـتێکی هونـەری لـە قەڵـەمدەدات (ئەمـەش بـەوە هـۆی مقۆمقـۆی زۆر) دەڵێـت: *"کاراکتـەری هـاملێت لـە ژێر کاریگـەریی هەستێکی فرەو لە وەسف نەهاتوە، بۆیە ئەو هەستە بەسـەر ڕاسـتیە بینراوەکـاندا زاڵـە"*. بـەم ئەنجامگیرییـەی ئیلیـەت، هاوکێشـەی بابـەتی لـە نمایشنامەی (ماکبێس)دا وەدی دێت.

ئەو دیمەنانەی *لەیدی ماکبێس* بەدەم خەوەوە قسە دەکات و ئەو قسانەی مـاکبێس کـە لـەکاتی بیستنی هـەواڵی مـەرگی هاوسـەرەکەیدا دەیانکـات، نموونەگەلێکن لە هاوکێشـەی بابـەتی، واتـە تـەبایی وشەو دیاردەکان لەگەڵ حاڵـەتی دەروونـی مـاکبێس و لەیدی ماکبێسدا.

**نموونە:**

لەیدی ماکبێس: هێشتا لێرەدا پەڵەیەك هەیە.

پاك بەرەوە ئەی پەڵە شوومەکە! پـاك بـەرەوە، لەگەڵ تۆمە!

یـەك، دوو، کەواتـە کـاتی ئـەنجامدانێتی. دۆزەخ تاریکـە! ئـۆف خوایـە! سـەربازوترس؟ چ پێویست دەکات بترسین لەوەی کەسێك پێمان بزانێ، لە کاتێکا کەس ناتوانێ لە ئێمە بپرسێتەوە؟ لەگەڵ ئەمەشدا چ کەسێ بە بیریدا دەهات ئەو هەموو خوێنە لە لەشی ئەو پیرەمێردەدا هەبێت؟

**"پەردەی پێنجەم، دیمەنی یەکەم"**

ماکبێس: (دوای بیستنی هەواڵی مەرگی شاژن)

ناچـار دوای ئـەوە دەمـردو بـۆ هـەواڵێکی لـەمجۆرە، وەختێـك دەبێـت. سبەینێ و سبەینێ و سبەینێ، بـە هـەنگاونانی بچووکـەوە لـەم ڕۆژەوە بـۆ ڕۆژێکی دی دەخزێـت، تـا دوا قسـەی نووسراوی نـاو دەفتەری ڕۆژگار دەگات، هەموو دوێنێکـانی ئێمـەش، ڕێـی خۆڵاویـی مـەرگین بـۆ دەبەنگـەکان ڕوون کردۆتەوە. بمرە.. بمرە ئەی مۆمی چکۆلـە! ژیان چ نیـە سێبەرێك نـەبێت کـە ئـەڕوات، ئەکتـەرێکی

بەسزمانە کە سەعاتێک لە تەمەن لەسەر تەختەی شانۆ دەبزوێ‌و دەلەنگێ‌و پاشان خاموش ئەبێت، ژیان حیکاتێکە شێتێک ئەیگێڕێتەوە، حیکایەتێکی پڕ هەراوزەنای بێمانا.

"پەردەی پێنجەم، دیمەنی پێنجەم"

ئەم تیۆرەیە جێی مقۆمقۆو بیروڕای جیاوازی گەلێ لە ڕەخنەنووسان بوە.

## سەرچاوەکان


گورین، ویلفرد. ال. *راهنمای رویکردهای نقد ادبی* (ترجمەی زهرا میهنخواه)، انتشارات اطلاعات، *1370*.

برد بروک، ا م. سی: تی. اس. الیوت (ترجمەی تقی هنرمند شجاعی)، مرکز نشر سم، *1372*.

داد، سیما: *فرهنگ اصطلاحات ادبی*، انتشارات مروارید، *1371*.

شکسپیر، ویلیام. مکبث (ترجمەی فرنگیس شادمان)، بنگاه ترجمەو نشر کتاب، *1340*.

# وێستگەکانی سەردەم



- ئۆپێرای یولیوس سیزەر
- فریدریش نیچە
- جولیان گرین
- سێ پرسیار لە گادامێر
- کۆمەڵگەی مەدەنیی ئەمریکی
- گەشتی شاعیرێک بۆ خۆرهەڵات
- ئایا سەردەمی بانگەواز بەسەرچوو؟!
- تەکنیکی ڕەخنەگر لە 13 تێزدا
- ڤی. ئێس. نایپول و خەڵاتی نۆبڵی 2001

عبد الإله بلقزيز

نهاية الداعية

الممكن والممتنع في أدوار المثقفين









# ئۆپێرای یولیوس سێسەر

## لەسەر شانۆی دڕۆتنینگهۆڵم

■ نووسینی: دانا رەئووف

ئۆپێرای: یولیوس سێسەر *Julius Cesar*

نووسینی: گیۆرگ فریدریش هیندل

*George Friedrich Handel*

لیبرێتۆ: نیکۆلا هایم *Nicola Haym*

ڕیژی: داڤید ڕادۆك *David Radok*

کۆریۆ گراف: هۆکان مایەر

*Hakan Mayer*

لەسەر شانۆی: دڕۆتنینگهۆڵم

*Drottningholms teatern*

(ئۆپێرای پادشـــایەتی) و (ئۆپێرای گەل) لە ستۆکهۆڵم لە وەرزی هـــاویندا چالاکیـــەکانیان دەوەستێن، بەڵام لەبری ئەم دوو ئۆپێرا گرنگە، ساڵانە لەم وەرزەدا فیستیڤاڵێکی گرنگی ئۆپێرالی[1] لە کۆشکی شانۆی دڕۆتنینگهۆڵم لە

یـــەکێك لـــە ڕازاوەتریـــن باخچـــە شـــاهانیەکانی ستۆکهۆڵمدا دەکرێتەوە.

یەکێك لە پـرۆژە ئۆپێرالیـە گەورەکانی فیستیڤاڵی هاوینـەی ئەمساڵی شانۆی دڕۆتنینگهۆڵم بـە شاکارێکی درامـی کۆمپۆسـیتۆری گەورە گیۆرگ فریدریـش هێنـدل[2] (1685–1759) کرایەوە.

ئۆپـــێرای (یولیـــوس سێسـەر)[3]ی سـەدەی (بـارۆك)[4] بووە یەکێك لـە گرنگترین ڕووداوە هونەرییـەکانی هـاوینی کۆشـك و شانۆ دێرینـە بارۆکیـە مەزنەکـەی (دڕۆتنینگهۆڵم)[5].

ڕووداوەکانی ئۆپێرای یولیوس سێسـەر لـە میسـر ڕوودەدەن و ئاوێتەیـەکی ڕاسـتەوخۆی ڕووداوە ڕامیاریەکانی نێوان ئیمپراتۆریەتی (ڕۆم) و (میسر)ە لـە سـاڵی (50) بەر لەدایکبوونی مەسیحدا.

هینـدل ئـەم ئۆپێرایـەی لـە سـاڵی 1724دا لـــە لـــەندەن نووسـیوە. یولیـوس سێسـەر دادەنرێت بە یەکێك لە دیـارترین و بـــەربڵاوترین و خۆشەویســـترین شـاکارە مۆسـیقیەکانی هینـدل. ئەمـــەش بـــەڕای زۆریـــەی مێژوونووس و ڕەخنەگرە مۆسیقیە جیهانیـەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو شـێوازە جیـاوازو تایبەتـــەی

(هێندل) له نووسینی ئۆپێراکەدا. بۆ نموونە مۆسیقایەکی ئێجگار بەچێژو مەزن، ئاوازێکی بەرزی گۆرانی ئۆپێرالی تاک[6] و زەمینەیەکی مێژوویی دەوڵەمەند. هێندل وەك بلیمەتێکی گەورە توانیویەتی مۆسیقاکەی لە چوارچێوەی ئەو ڕووداو و سنورە مێژووییە دیاریکراوەدا خۆشەویستی، ئارەزوو، ژان و ئازار، حەزی سێکس و ئیرەیی کۆبکاتەوە.

هێندل لەم ئۆپێرایەدا بەرجەستەی دوو ڕووداوی مێژوویی دەکات. بابەتێکی خۆشەویستی، ئاوێتەی کۆمەڵێ هێڵی رامیاری ئاڵۆز دەبێت. خۆشەویستی و گەمەی ڕامیاری و پیلانی دوژمنکاری بە کۆمەڵێ پلان و گەمەی خۆشەویستی و ئارەزوودا پێکدا دەچن.

هێندل چیرۆکێکی تایبەتی خۆی سەبارەت بە هەردوو کاراکتەری کیلۆپاتراو یۆلیوس سێسەر دەنووسێت. جۆرێکی تایبەتی لە ئۆپێرا، یان سەرگوزشتەیەکی ئۆپێرالی. لەم سەرگوزشتەیەدا گۆرانی خۆشەویستی لە ئاستێکی بەرزدا ڕووبەڕووی جەنگ، کوشتن، تۆڵەسەندنەوە و دڵشکاندن دەبێتەوە. لەم نمایشەدا دوو هونەرمەندی گەورەی ئەمریکی


Photo: Bo Liungblom

**دوو ڕۆڵە سەرەکیەکەی ئەم ئۆپێرایە بەرجەستە دەکەن: *Lawrence Zazzo* لە ڕۆڵی یولیوس سێسەر، *Laura Claycomb* لە ڕۆڵی کیلۆپاترا.**

**هەر لەم ئۆپێرا تایبەتیەدا هونەری شانۆ دەبێتە گەمەیەکی هونەری و دەروازەیەکی گرنگ بۆ**


Photo: Bo Liungblom

**گەشەکردنی دیدێکی نوێ لە شانۆی جیهانیدا. تەکنیکی (شانۆ لەناو شانۆدا) بۆ یەکەمجار لەم ئۆپێرایەدا دەبێتە ئامرازێکی گرنگی هونەری گشتگری بەرز. گەمەیەکی خۆشەویستی لەنێوان کیلۆپاتراو یولیوس سێسەردا دەبێتە نمایشێکی نهێنی پڕ لە**


Photo: Bo Liungblom

ئاوازی ناو خودی ئۆپێراکە. بەمەش ئۆپێراکە دەبێتە گەمەیەکی شانۆیی بەرجەستەکراو.

- *ڕووداوەکانی ئۆپێرای یولیوس سێسەر:*

سەرەتای پەردەی یەکەمی ئۆپێراکە وڵاتی میسرە لە ساڵی (*50*)ی بەر لەدایکبوونی مەسیحدا. سێسەر بە سەرکەوتوویی لە جەنگ گەڕاوەتەوەو توانیویەتی زۆر ئازایانە بەسەر (پۆمپیۆس)دا سەربکەوێت. لە ئاهەنگگێڕانی سەرکەوتنی ئەو جەنگەدا، (ئەشیلا) کە سەرکردەیەکی سوپای میسرییەکانە، دەگاتە کۆشك و دیاری و ڕاسپاردەیەکی (تۆلۆمیۆس) پێشکەش بە سێسەر دەکات. دیاریەکە دەبێتە ڕووداوێکی کتوپڕو چاوەڕواننەکراو. تۆلۆمیۆس کەللەسەری براوی پۆمپیۆس بە دیاری دەنێرێت بۆ سێسەر.

سێسەر بەم دیارییە زۆر تووڕەو ناڕەحەت دەبێت، پەیمانی ئەوەش ئەدات کە سزای تۆلۆمیۆس بدات. (کۆرنێلیا) شیوەنێکی گەرم بۆ مێردەکەی دەکات و (سێستۆ)ی کوڕیشی سوێند دەخوات تۆڵەی مەرگی باوکی بکاتەوە.

کیلۆپاترا کە خوشکی تۆلۆمیۆسە لە کۆشکی شاهانەی

میسردا، بەهۆی یەکێك لە دەستوپێوەندە نزیکەکانیەوە (نیرلَینۆ) بەوە دەزانێت کە پۆمپیۆس بە بڕیاری تۆلۆمیۆسی برای کوژراوە. ئەم خوشك و برایە پێکەوە، واتە کیلۆپاتراو تۆلۆمیۆس، فەرمانڕەوای میسرن. کیلۆپاترا هەوڵدەدات دڵی سیسەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بەمەش جێگا بە براکەی لێژ بکاتو بەتەنها ببێتە فەرمانڕەوای هەموو میسر.

ئەشیلا هەر زوو هەموو پلانەکان بۆ تۆلۆمیۆس ئاشکرا دەکات. ئامادەیی خۆشی دەردەبڕێت کە سیسەریش بکوژێت، بەومەرجەی تۆلۆمیۆس کۆرنیلیای پێببەخشێت، بەو شێوەیەش تۆلۆمیۆس بەتەنها دەبێتە پادشای میسر.

کیلۆپاترا بۆئەوەی لە یولیوس سیسەر نزیك بێتەوە، خۆی لە بەرگی ئافرەتێکی گەلێ قەشەنگی دەوڵەمەندا دەگۆڕێت و بە بەهانەی ئەوەوەی کە تۆلۆمیۆس سەروەت و سامانەکەی تالان کردووە، دەچێتە لای سیسەر. هەر لە سەرەتاوە سیسەر بەتەواوەتی گیرۆدەی ئەو جوانیە دەبێت. سیسەر بڕیار دەدات بچێت بۆ کۆشکی تۆلۆمیۆس، تا لە نزیکەوە لە ڕووداوەکان بگات و لە هەمانکاتیشدا ئەو کۆشکە بەرزو ڕازاوەیە ببینێت. لەوێ لەپڕ کۆرنێلیا و سێستۆ دەردەکەون و بەڕووی تۆلۆمیۆسدا دەتەقنەوەو پلانەکانی سیسەریش تێکدەدەن.

پاسەوانەکانی تۆلۆمیۆس سێستۆ لە بەندیخانە توند دەکەن، بە بڕیاری تۆلۆمیۆسیش کۆرنێلیاش دەکەنە بەردەست و باخەوانی کۆشك. ئەشیلا شەیدای کۆرنێلیایەو بە هەموو شێوەیەك دەیەوێت لێی نزیك بێتەوە. بەلام کۆرنێلیا بە هیچ شێوەیەك وەلامی ناداتەوە. ئەشیلا بەم ڕووداوە زۆر خەمبار دەبێت، دایك و کوڕەکەی بەجێدەهێڵێ و نوقمی چارەنووسو پەژارەی دەردی دڵی خۆی دەبێت.

لە بەشی دووەمی ئۆپێراکەدا کیلۆپاترا، لە بەرگە ساختەکەیدا (ئافرەتە دەوڵەمەندەکە) سەمایەکی پڕ لە ئارەزوو و سێکس ئامێز بۆ سیسەر دەکات. لە هەمانکاتدا یەکێك لە پەیامبەرەکانی سیسەر دێت و ئاگاداری دەکاتەوە کە گروپێك خەریکی نەخشەی لەناوبردنی ئەون.

کیلۆپاترا خۆی بۆ سیسەر ئاشکرا دەکاتو بڕیاریشی دەداتێ بە زەبری هێز ڕووبەڕوی ئەو گروپە ببێتەوە، بەلام دوای ئەوەی بە وردی لە هەڵوێستەکە دەکۆڵێتەوە. لەبەرئەوە کیلۆپاترا وای بەباش دەزانێت کە سێسەر ڕابکات و بۆ ماوەیەك خۆی بشارێتەوە. بەلام لەشکری تۆلۆمیۆس بەتەواوەتی لەشکرەکەی کیلۆپاترا دەشکێننو کیلۆپاتراش بە دیل دەگرن. سیسەر لەسەر ڕۆخی ڕووباری (نیل)ەوە سەرلەنوێ سەربازەکانی کۆدەکاتەوە تا کیلۆپاتراو کۆرنێلیا ڕزگار بکات. سیسەر هێرش دەکاتە سەر کۆشك و پاسەوانەکانی تۆلۆمیۆس ڕاودەنێت. تۆلۆمیۆس لە دوا چرکەکانی پەلەقاژێیدا دەیەوێت هێرش بکاتە سەر ناموسی کۆرنێلیا. بەلام کۆرنێلیا دەتوانێت بەرگری لە خۆی بکات، تا لەپڕ سێستۆی کوڕی دەگاتە کۆشك و ئازایانە ڕووبەڕووی تۆلۆمیۆس دەبێتەوەو دەیکوژێت. کیلۆپاتراو سیسەریش زەماوەندی خۆشەویستی و ئازادی لەژێر ئالای ئیمپراتۆریەتی ڕۆمادا دەگێڕن.

- *شێوازەکانی بەرجەستە لە سەردەمی مێندلدا.*

لە ساڵەکانی (*1600*-*1700*)ەکاندا ئەکتەر و گۆرانیبێژە ئۆپێرالیەکان شێوازێکی زۆر تایبەتیان بە زمانی جەستە بەکارهێناوە. ئەمڕۆ ئەو زمانە جەستەییە بە (پۆزی بارۆك) دەناسرێت. ئەکتەرەکان بە

یارمەتی بەکارهێنانی ئەو شێوازی جەستەیە، تەنها جوڵەی خۆیان لە ڕێگای دەست، قۆڵ و جوڵەی دەربڕینی ئاسای چاوەوە نیشانداوە، بەڵکو هەموو جەستەو تەنانەت چۆنیەتی وەستان و ڕۆیشتن، بەرجەستەی ئەو هەست و سۆزانەی کردووە کە دەربڕێکی ڕاستەوخۆی ناوەڕۆکی تێکست و مۆسیقاکە بووە.

هەر بە یارمەتی ئەو جۆرە جوڵەو هەڵسوکەوتە بەرجەستەییە باڕۆکیە، واتە (پۆز) توانیویانە کاریگەریی لە بینەرانیش بکەن. لەبەرئەوەو لەسەر شانۆ ئەو جوڵە بەرجەستەییە هەڵوێستی ئەکتەرەکانیشی بەرامبەر بینەران لەلایەک و ئەکتەرەکانی تری سەر شانۆی لەگەڵ یەکتریدا لەلایەکی دیکەوە دیاریکردووە.

ئەمەش چەمکێکی جوڵەو بەرجەستەی شانۆیە کە لە دیدی ئەمڕۆی هونەری شانۆو ئۆپێرادا زیاتر بە هونەری ڕیژی ناودەبرێت. بەڵام دەبێت ئاماژەی ئەوەش بکەین کە ئەمجۆرە زۆر تایبەتەی تەکنیکی شانۆ شتێک نەبووە گۆرانیبێژەکان، یان ئەکتەرەکانی سەردەمی باڕۆک دایانهێنابێت، بەڵکو یەکێک بووە لە میراتە گرنگەکانی (ڕێتۆریک) واتا (هونەری وتار خوێندنەوە)ی سەردەمی گریکەکان.

هەروەها هەر لەم ڕوانگەیەشەوە وێنەو پەیکەرەکانی سەردەمی گریک مانایەکی گەورەو سەرچاوەیەکی مەزن بووە بۆ ئەکتەرو گۆرانیبێژەکانی سەردەمی باڕۆک. لە ڕێگای ئەو وێنەو پەیکەرە داتاشراوانەدا، هەڵوێستەو پۆزی جیاوازو دیاریکراویان دۆزیوەتەوە. بەتایبەتی گرنگی دۆزینەوە و فێربوونی (وەستان) لە شێوازو پۆزی جیاواز جیاوازدا. لەم وێنەو پەیکەرانەدا، ئەکتەرو گۆرانیبێژەکان گەیشتونەتە ئەو بەرئەنجامەی وەستان، هەڵوێستەو بارە جیاوازەکانی لەش هێڵی تەریبی لەخۆ نەگرێت. باڕۆکیەکان وەك هەموو جۆرە توخمێکی تری دەربڕین، توانیویانە ئەو وێنەو پەیکەرانە بە شێوەیەك بەکاربهێنن بگونجێت لەگەڵ سەردەمی خۆیاندا، واتا توانیویانە بەرجەستەی توخم و سەرچاوەکانی سەردەمی باڕۆك بکەن.

خاڵێکی تری گرنگی باڕۆکیەکان گرنگیدانێکی بێپایان بووە بە هونەری وتار خوێندنەوە (ڕێستۆریك)، لەم ڕێگایەوە هەوڵیانداوە ڕێساکانی هونەری وتار خوێندنەوە بگوێزنەوەو بەرجەستەی بکەن لە چۆنیەتی گۆرانی ئۆپێرالی و هونەری نواندندا.

بۆنەوەی وتارێکی (پۆز) ئاسا بەرجەستە بکرێت، دەبێت بە وردی تێکست و مۆسیقاکە شیبکرێتەوە. ئەمەش پرۆسەیەکی وردی بەکردەییکردنی گۆرانیە ئۆپێرالیەکان بەخشیوە. بەمەش خوێندنەوەی کۆمپۆسیتۆرەکەش (نووسەرە مۆسیقیەکە) سەبارەت بە تێکست و هەڵوێستە درامیەکە بەشێوەیەکی ئاشکراو قوڵ شیکراوەتەوە. بۆ نموونە یەکێك لە دیاریترین گۆرانیە خودیەکانی هێندل *Arians* لە بەشی سێیەمی ئۆپێرای یولیوس سێسەردا گۆرانی کاراکتەری کیلۆپاترایە. لە بەشی یەکەمی ئەم گۆرانیە ئۆپێرالیەدا کیلۆپاترا بۆ ئەو چارەنووسە توندوتیژەی خۆی دەگری، بەڵام لە بەشی دووەمی هەمان گۆرانیدا کیلۆپاترا هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوە دەکاتەوە. کیلۆپاترا ئاماژەی ئەوە دەکات کە دوای مەرگی دەگەڕێتەوەو لە ژیانی دوژمنەکانیدا دەبێتە جنۆکە. هەروەها لەم گۆرانیەدا کیلۆپاترا بە دوودڵی و ئاوازێکی غەمگین دووپاتی تەنهایی خۆی دەکاتەوە. کۆرنێلیا و سێستۆ ناتوانن یارمەتی بدەن، سێسەری خۆشەویستیش بە بڕوای ئەو

مردووە. ئەم گۆرانییە ئۆپێرالییەی کیلۆپاترا شێوازێکی وتارئامێز لەخۆدەگرێت. بەمەش هێندل توانیویەتی چەمکی هونەری ڕێتۆریکی گریکییەکان لە گۆرانییەکی بەرزی ئۆپێرالیدا بەرجەستە بکات.

ئەم مۆسیقا بەرجەستەکراوە، توانیویەتی هارمۆنی و هێڵە میلۆدییەکان پێکەوە لەگەڵ ناوەڕۆکی تێکستەکاندا بگونجێنێ. ئەمەش دەروازەیەکە بۆ خولقاندنی ئەو پۆزە فیزیکیە بەرجەستەکراوانەی ئۆپێراکە. پۆزەکانیش وەك شێوازێکی دەربڕین زنجیرەیەکی تایبەتی یەك بەدوای یەکدا پێکدەهێنێت: یەکەم دەبێت هزر، یاخود هەست و هۆش لە ڕێگای چاوەکانەوە دەربکەوێت، دوای ئەوە پۆزەکان ئامادەی دەستپێکردن بکرێن، دوابەدوای ئەو پۆزە جۆراوجۆرانە وشە-ئاواز دێت. پۆزە تەواوەکانیش لە وشە ئاوازدارەکاندا بەرجەستە دەبێت.

لەبەرئەوەی بینەران تەماشای ڕووداوەکانی ئۆپێراکەیان کردووە، دەبێت کیلۆپاترا بە بەکارهێنانێکی وردو ئاشکرای هێزی دەربڕینی سیما، بەرلەوەی دەستبکات بە گۆرانییەکان ئەوە پیشان بدات کە ئەو لەو ساتەوەختەدا هەست بەچی دەکات. یەکەم (ئەکۆرد)[7]یش هێمنە. کیلۆپاترا بە چاوەکانی پیشانی ئەدات، یان بە مانایەکی تر بە سیمایەکی دەوڵەمەندی دەربڕین ئاسا، بیر لەچی دەکاتەوە. بە قوڵی هەناسە هەڵدەمژێت و دەستەکانی بەرزدەکاتەوە، وەك خۆئامادەکردنێك بۆ وەرگرتنی پۆزی یەکەم.

- **یۆلیوس سیسەر لەلای هێندل**

ناوی یولیوس سێسەر مێژوویەکی دێرینە لەنێو زمانەکانی ڕۆژئاوادا دەژی. زۆرجار ئەو ناوە بۆتە سمبولی دەسەلات و سەرلەنوێ لە بەرگ و زەمەنێکی تردا ژیاوەتەوە. مێژووش دەبێتە دەروازەیەکی ڕاستەوخۆی زمان و وشەش لەو دەروازەیەدا دەبێتە مێژوویەکی ئاشکرای ئەو گەلانە. مێژوو سەرچاوەیەکی گرنگی کولتووری بارۆکییەکان بووە. هەر لەم ڕووەوە دیمەن و چیرۆکە بارۆکیە ئۆپێرالیەکان زیاتر لە ڕووداوی مێژوویی خۆیانەوە وەرگیراوە. بەڵام مێژوو لەو پرۆژە ئۆپێرالیانەدا سەرلەنوێ بە سەربەستی نووسراوەتەوە. هێندل بەر لە ئۆپێرای یولیوس سێسەر ئۆپێرایەکی تری نووسیوە بەناوی (فلافیۆ) فلافیۆش پادشای ناوچەی لۆمبەردێت[8] بووە لە نێوان سالانی (688–700). هەروەها لەدوای سێسەریش سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە سەر بابەتە مێژووییەکان و ئۆپێرایەکی تر سەبارەت بە تیمورلێنك دەنووسێت.

ئینگلستان زیاتر لە وڵاتانی تری ئەورووپا لە نزیکەوە ئاگاداری یولیوس سێسەر بوون. یولیوس سێسەر چەندین جار لە ئینگلستاندا دەبێتە نموونەیەکی ئەفسوناوی. کارڵی شەشەم وەك مۆدێلێك دووبارەی چۆنیەتی حوکمڕانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم لە ئینگلستاندا پەیڕەو کردووە. هەر لەم ساڵانەداو لەژێر حوکمڕانی شا کارڵی شەشەم هێندل ئۆپێرای یولیوس سێسەری لە لەندەن نووسیوە.

لە لایەکی دیکەشەوە شانۆنامەکەی شەکسپیر بە هەمان ناوەوە گرنگترین و بەهێزترین وێنەی کاراکتەری سێسەری لەسەر شانۆ بۆ بەرجەستە کردووین. بەڵام لە سەردەمی هێندلدا شەکسپیر لە دەرەوەی ئینگلستان زۆر نەناسراوە. دراما مێژووییەکەی شەکسپیر سەرچاوەکانی هێندل نەبووە بۆ ئۆپێراکەی. شەکسپیر زیاتر لە پیەسەکەیدا چارەسەری مەسەلە

پامیاریەکانی ڕۆماو مەرگی سێسەر دەکات. بەڵکو سەرچاوەو کاریگەری لیبرێتۆی ئۆپێرایەکی تر بووە لە نووسینی (گیاکۆمۆ فرانسیسکو بووسانی). ئەم ئۆپێرایە سەبارەت بە دەسەڵات و کاراکتەری سێسەر بووەو لە *17*ی مانگی دوانزەی ساڵی (*1676*)دا لە ڤێنێدیك پێشکەشکراوە. ئەم بەرهەمە لە ساڵەکانی (*1680*)کاندا لە زۆر لاوە پێشکەشکراوە. ئۆپێراکەی هێندل، مەبەست لیبرێتۆ، واتا چیرۆکی ئۆپێراکە، لە نووسینی (نیکۆلا هایم) بووە. هێندل لەگەڵ نیکۆلاهایم پێکەوە لە ئەکادیمیای پادشایەتی مۆسیقا لە لەندەن **Royal Academy of music** کاریان کردووە.

کاری نیکۆلا هایم لەو ئەکادیمیا مۆسیقیەدا ئەوە بووە هەوڵبدات ئۆپێرای ئیتالی لە لەندەن بڵاویکاتەوە. ئەمە جگە لەوەی وەك ڕیژیسۆریش کاریکردووەو هەر ئەویش زۆربەی لیبرێتۆی تێکستە ئۆپێرالیەکانی بۆ هێندل ئامادەکردووە. یولیوس سێسەری نیکۆلا هایم بە شێوازێکی جوان داڕێژراوە، خاڵە سەرەکیەکانی ڕووداوەکە زۆر بە ڕوونی و شێوازێکی ئاشکرا بەرجەستە دەکات. زۆربەی ڕەخنەگرو مێژوونووسە مۆسیقیەکان ئاماژەی ئەوەیان کردووە کە سێسەری نیکۆلا هایم لە زۆر ڕووەوە بەرزو بەپێزترە لە ئۆپێراکەی گیاکۆمۆ.

نیکۆلا هایم زیاتر بایەخی داوە بە داڕشتنی چیرۆکی عەشقی نێوان سێسەر و کیلۆپاترا، تۆڵە سەندنەوەی سێستۆس لە تۆلۆمیۆی کوژەری باوکی. ئەم دوو توخمەش، خۆشەویستی/ تۆڵە سەندنەوە، دەبێتە هاوکێشەیەکی بەهێزی تێکڕای سترۆکتور و بونیادی ئۆپێراکە.

لە ساڵەکانی (*1700*)ەکاندا کۆمپۆسێتۆرەکان زانیویانە چ گۆرانیبێژێکی ئۆپێرالی گۆرانی ڕۆڵەکان دەڵێت. لەبەرئەوە چۆنیەتی ئاستی ئاوازەکانیان پابەندە بە ئاست و توانای گۆرانیبێژەکانەوە. بەڵام وەك سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کردووە، هێندل بەشێکی زۆری بەشی یەکەمی یۆلیۆس سێسەر لە هاوینی ساڵی (*1723*)دا، بەرلەوەی بزانێت چ هونەرمەندێکی ئۆپێرالی ڕۆڵەکان بەرجەستە دەکەن نووسیوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی دواتر هێندل ناچار بێت بەشێکی زۆری مۆسیقاکەی بگۆڕێت، یان سەرلەنوێ بە شێوازێکی تر ئامادەیان بکاتەوە، دوای ئەوەی گۆرانیبێژە ئۆپێرالیەکان دەستنیشان کراون. هێندل هەندێ جار ناچار بووە چۆنیەتی بیرکردنەوەی مۆسیقاکەشی بگۆڕێت تا لەگەڵ تواناو ئاستی قورگی گۆرانیبێژە ئۆپێرالیەکاندا بگونجێت. ئەمەش سەرلەنوێ دووپاتی توانای ئەم هونەرمەندە مۆسیقیە بەرزە دەکاتەوە. نووسینی مۆسیقایەکی بەرز، لە هەمانکاتدا گونجاو لەگەڵ ئاستە جیاوازەکانی قورگ و توانای گۆرانیبێژە ئۆپێرالیەکاندا.

- *ئۆپێرا لەنێوان سەماو شانۆدا*

نمایشە ئۆپێرالیەکە لەو شانۆ کۆنە بارۆکیەی دڕۆتنینگهۆڵمدا بوو بووە پرۆژەیەکی هونەری گەورە. لەو پرۆژەیەدا ڕابردوو، یان بە واتایەکی تر مێژوو، نەك تەنها هەر زیندوو کرابووەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی هاوچەرخانە بەسترابووەوە بە ئەمڕۆوە. ئەمڕۆش بووبووە بەرهەمێکی ڕەسەن و پەیامێکی هونەری گرنگ بۆ ئایندە، بۆ نەمری و هەتاهەتایی هونەری مۆسیقاو شانۆ.

سەما، نواندن و هونەری ئۆپێرا پێکداچوونێکی گرنگی لە داڕشتەی هونەری ڕیژیدا بەرجەستە کردبوو. سەما لەڕێگای کوریۆگرافیایەکی بەسەلیقەوە بووبووە ریتمێکی بەهێز لە ڕووداوەکاندا، لە گۆرانیە ئۆپێرالیەکانداو لە تێکڕای سترەکتورە گەورەو گشتیەکەدا.

هەر لەم ڕووەوە سەما کرابووە بەشێك لە کاراکتەرەکان و هەندێ جار ڕووداوەکان دەبوونە سەمایەکی ئەفسوونی و لەو ئەفسوونەدا گۆرانیە ئۆپێرالیەکان سەرلەنوێ هاوئاهەنگ دەبوونەوە بە سەمایەکی تر. ئەمەش هەڵوێستەیەکی زۆر جیاواز و بەهێزی دیدی ڕیژی و بەرجەستەکردنی ئۆپێراکە بوو.

لە کاتێکدا کاراکتەرەکان بەبێ جوڵە لە ڕوانگەیەکی ڕێتۆریك ئاساوە گۆرانیە ئۆپێرالیەکانیان دەوت، سەمازانەکان بەرجەستەی هەست و هۆشە هەڵچووەکەی ناوەوەی کاراکتەرەکانیان دەکرد. بەمەش نمایشە ئۆپێرالیەکە بوو بووە سەما، یان نمایشێکی شانۆیی شیعر ئامێزو وێنەیی. سەمازانەکان بوونێکی بەردەوامیان لەسەر شانۆ هەبوو. لەگەڵ هەموو ڕوداوێکدا ئەوانیش فۆرمی جیاوازیان لەخۆدەگرت. فۆرمێك کە لەگەڵ خودی دیمەنەکاندا دەگونجا. یان دیمەنەکان دەبوونە وێنەیەکی سەمائامێزی پڕ لە ئاواز و گۆرانی.

ڕیژیسۆر گۆرانیەکانی بەرجەستەی ڕووداوەکان کردبوو، بەمەش هەموو ئۆپێراکە بوو بووە کۆمەڵێ وێنەی بزاوت، لەو وێنانەدا هونەری شانۆ پێکهاتەی دیدو دارشتە هونەریەکە بوو.

هەموو چرکەیەك لە ئۆپێراکەو لەسەر ئاستێکی قوڵ دەربڕی هەستی مرۆڤایەتی بوو. ڕیژیسۆر ئەو جیهانە قوڵەی ئۆپێراکەی کردبووە گەمەیەکی پڕ لە خەندە. لەو گەمەیەدا هەر هەموو کاراکتەرەکان، سەمازانەکان و ڕووداوەکان لە جوڵەیەکی ئێستاتیکای بەردەوامدا بوون. ئەمەش بووبووە هۆی خوڵقاندنی یەك بارستەی یەکگرتووی پڕ لە ژیان لەسەر شانۆ. تەنانەت قورگو چۆنیەتی گۆرانیەکان لەم ئۆپێرایەدا بووبووە بەشێك لە گەمە شانۆییەکە. لەو گەمەیەدا گۆرانیەکان تۆنێکی جیاواز و پڕ لە خەندەیان لەخۆدەگرت.

خاڵێکی تری گرنگی سەرکەوتنی ئەم نمایشە ئۆپێرالیە ئەو گۆڕانکاریە خێرایەی دیمەنەکانە، بەمەش ڕیتمی دیمەن و سەماکان دەبوونە بەشێکی گرنگی بەرجەستەکراو لە خودی ئەو گۆڕانکاریە سەمەرەو بێوێنانەدا. هەروەها لەم پڕۆژەیەدا گرنگیەکی تایبەتیش دراوە بە مەسەلەی جل و بەرگ. ئەم مەسەلەیە مۆرکێکی هونەری لەخۆگرتووە. شێوازەکانی جلوبەرگی ئەکتەرەکان سیمایەکی مێژوویی سەردەمی بارۆك لەخۆناگرێت، بەڵکو جۆریەتی بڕین و ئامادەکردنی جلوبەرگەکە تەقەلایەکی هونەرییە بە مودانکردنی شێوە جلوبەرگی سەردەمی (*1700*)ەکانی ئەوروپا. جوڵەی جەستەی کاراکتەرو سەمازانەکان لەو جلوبەرگە جیاوازەدا دەبێتە جەستەیەکی شێوە پەیکەر ئاسا. بەمەش جلوبەرگ دەبێتە تەواوکەرێکی گرنگی بە مودانکردن و دیدێکی ئەزمونگەری بۆ خوێندنەوەی نمایشەکە.

مۆسیقا، سەماو سینۆگرافیاش هەندێ جار مۆرکێکی ڕۆژهەلات ئاسا، یاخود نزیك لە کیشوەرێکی ترەوە لەخۆدەگرێت. ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕووداوەکانی ئۆپێراکە لە وڵاتی میسر ڕوودەدەن. ڕیژیسۆری ئۆپێراکە لەگەڵ کۆریۆگرافی سەمازانەکان بە وردی ڕەچاوی ئەو خاڵەیان کردبوو.

گەمەی شانۆ لەناو شانۆو چیرۆکی خۆشەویستی سێسەر و کیلۆپاترا توخمێکی گرنگی بایەخپێدان و بەشانۆکردنی ئۆپێراکە بوو. لەو گەمەی شانۆیەدا کاراکتەرەکان، گۆرانیبێژو سەمازانەکان چیرۆکی عەشق و ژانیان بۆ یەکتری و بینەران دەگێڕایەوە.

## پەراوێزەکان

1- فیستیڤالی ئۆپێرای هاوینی ساڵی (2001)ی کۆشککی شانۆی درۆتنینگهۆڵم ئەم بەرهەمە ئۆپێرالیانەی دەگرتەخۆ. ئۆپێرای سەمیرەمیس، لە نووسینی (گلوک)، میدیا، لە نووسینی (رۆدۆلف)، یولیۆس سیزەر لە نووسینی (هێندل)، کۆسی ڤان توتە لە نووسینی (موزارت).

2- گیۆرگ فریدریش هێندل لە 23ی مانگی دووی ساڵی (1685)دا لە ئەڵمانیا لەدایکبووە. هێندل لە سەرەتاوە ئامێرەکانی ئۆرگێل، سیمبالۆ، ڤیۆلین و ئۆبۆی خوێندووە. لە ساڵی (1702)ەوە وەک هونەرمەندێکی مۆسیقی لە هەرێمی ناوچەی هالێ Halle کاریکردووە. دواتر دەچێتە شاری هامبۆرگ و لەوێ وەک مامۆستاو مۆسیقاژەن لەسەر ئامێرەکانی ڤیۆلیست و سیمبالیست لە ئۆرکێسترای ئۆپێرای هامبۆرگ کاریکردووە. ساڵی (1706) هامبۆرگیش بەجێدەهێڵێ و دەچێتە ئیتالیا. هێندل تا ساڵی (1710) لە ئیتالیا دەمێنێتەوە، هەر لە ئیتالیاش هەندێ لە ئۆپێراکانی پێشکەشدەکرێت. لە ئیتالیا جگە لە کۆمپۆسێتۆر، وەک ئۆرگانیست و سیمبالیستیش کاریکردووە. هێندل لە ساڵی (1711)دا دەبێتە مامۆستای مۆسیقا لە یەکێک لە کلێسا گرنگەکانی شاری هانۆڤەر، بەهۆی ئەم کارەیەوە زیاتر بواری ئەوەی بۆ دەرەخسێ کۆمەڵێ گەشتی گرنگ بکات، یەکێک لەو گەشتانەی لە هەمان ساڵدا بۆ لەندەن دەبێت. دوای ماوەیەکی کورت لەو گەشتەی و لە ساڵی (1712)دا لە هانۆڤەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ لەندەن و تا دەمرێت لەوێ دەمێنێتەوە. تا ساڵی (1730) بە شێوەیەکی بەردەوام مۆسیقا بۆ ئۆپێرای ئیتالی لە لەندەن دەنووسێت. لە ساڵی (1719) بەدواوە دەبێتە سەرکردەی مۆسیقاو بەرپرسیارێکی گرنگی ئەکادیمیای پادشایەتی مۆسیقا لە لەندەن. لە ساڵی (1739)دا لە ڕوانگەی چیرۆکەکانی ئینجیلەوە کۆمەڵێ پرۆژەی مۆسیک درامای گەورە بۆ گۆرانیبێژ، کۆرس، کۆراڵ و ئۆرکێسترای بە ئینگلیزی نووسیوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی وەک کۆمپۆسێتۆرێکی گەورەی نەتەوایەتی ئینگلیزی ڕێزی لێبگیرێ.

3- ئۆپێرای یولیوس سیزەر بۆ یەکەمجار لە لەندەن لە 20ی مانگی دووی ساڵی (1724)داو لەسەر شانۆی King's Theatre نمایشکراوە.

4- بارۆک Baroken تەوژمێکی تایبەتە لە شێوازە جیاوازەکانی ئەدەبو هونەردا. لە ساڵەکانی (1600)کاندا لە ئیتالیا سەریهەڵداوە. تابلۆی وێنەکێشەکانی سەردەمی بارۆک زۆر گەورەو گشتگرن و فۆرمێکی دەوڵەمەند لەخۆدەگرن. وێنەکێشەکان تەکنیکی ڕووناکی و هێزی سێبەریان لە تابلۆکانیاندا بەکارهێناوە، بەو مەبەستەی مەودای تابلۆکانیان جوڵەو کاریگەرییەکی قووڵ لەخۆبگرن. لە بواری مۆسیقادا لەگەڵ دەرکەوتنی ئۆپێرا لە دەوروبەری ساڵەکانی (1600)دا دەرکەوتووە. ئۆپێراو مۆسیقای بارۆک لەسەردەستی (هێندل و باخ)دا دەگاتە ئاستی ترۆپک.

5- شانۆی درۆتنینگهۆڵم تاکە کۆنترین شانۆیە لە جیهاندا کە تاکو ئێستا چۆن دروستکراوە، وەک خۆی پارێزراوەو ماوەتەوە. ئەم شانۆیە شاژنی سوید خاتوو (لۆڤیسا ئۆلریکا) بڕیاری بنیاتنان و دروستکردنی داوە. بۆ ئەم مەبەستەش هونەرمەندی ئەندازیار (کارل فریدریك ئادڵسرەنتز) نەخشەکانی ئەم خانووبەرەیە وەک شانۆیەکی بارۆك دەکێشێ. دواتر شانۆی درۆتنینگهۆڵم لە ساڵی (1766)دا بەتەواوەتی تەواو دەبێت. ئەم کۆشکە شانۆییە بە کەرەسەیەکی زۆر ساکار دروستکراوە. بەهۆی ئامێرێکی تایبەتەوە، کە بۆ ئەم مەبەستە دروستکراوە، دیکۆرو تابلۆکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. ئەو گۆڕانکارییانەش گەمەیەکی بێهاوتای شانۆییە، ئەفسونێکە لە هیچ شانۆیەکی تری جیهانیدا وێنەی نییە. تابلۆکان، وێنەو دیکۆرەکان بە بەرچاوی بینەرانەوە، لە چاوتروکانێکدا، هەر وەک سیحر گۆڕانکاریان بەسەردا دێت. بۆ نموونە هۆڵی کۆشکێکی شاهانە دەبێتە دەریاچەیەکی گەورە، باخچەیەك دەبێتە گۆڕەپانی جەنگ و خانووبەرەیەکیش دەبێتە شاخ و داخێکی چڕ.. و بەو شێوەیە.

ئەم شانۆیە بیست مەتر قوڵە، ئەمەش تا ئێستا یەکێکە لە قووڵترین

# فریدریش نیچە

## سەدەیەك دوای مەرگی

■ نووسینی: حسێن ئەلموزانی

● و. بە دەستكارییەوە: هەورامان وریا

لە حەوتی كانوونی دووەمی ساڵی 1889 لە شاری (تورین)ی ئیتاڵی فەیلەسوف و بیرمەندی ئەڵمانی(فریدریش نیچە) بەرەو ڕووی ئەو ئەسپە ماندووەی لە ناوەڕاستیی شەقامەكەدا بە عارەبانەیەكەوە بەسترابووەوە، غاریداو دەستی كردە ملی و كەوتە ماچكردنی و بەكوڵ بۆ چارەنووسی دەگریا. بەڵام بەبێ ڕەچاوكردنی ئەوەی ئایا ئەسپەكە یاخود عەرەبانچییەكە دەركیان بەوە كردبێت كە (نیچە) چ شتێك دەردەبڕێت و گوزارشت لە چی دەكات، ئەو هەر بە فرێدراوی لە ناوەڕاستی شەقامەكەدا مایەوە.

لەوانەیە ئەو لە خۆشییەی ئازاریی دەدیا لەو كاتەدا كەپێشتبێتە دوا ئاستی، هەربۆیە ئەم فەیلەسوفە دەم بەهاوارە ئەم فەیلەسوفە زۆر تووندو قیرسیچمەیە ئەم بیرمەندە ئەنتیزامێزەو ئەم زانا زمانەوانەی زمانی ئەڵمانی چ لە پێش خۆی و لەوانەیە لە پاش خۆشی هیچ شێوازێكی وا جوان و وریابین و بەهێز و دیاری وەك ئەوەی (نیچە)ی بەخۆیەوە نەدیبێت، لەو كاتەدا برشت و هێزی لەبەر برا.

(نیچە) ئەو كەسەی كە سۆزو بەزەیەكەی گەیشتە ئەو رادەیەی وایلێبكات باوەش بە ئەسپێكی ماندوودا بكات، زۆر لە بیرمەندو نووسەران و زانایانی دەروونناسی و كۆمەڵناسی و پسپۆڕانی فەلسەفە وایدادەنێن كە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی مۆدێرنەیەو لە هەموو كەسێكیش باشتر گوزارشتی لەم سەدەیەی ئێستا كردووە.

لەو ساڵەوەی (نیچە) بەو شێوە ترسناك و تۆقێنەرە كەوت، ئیدی وەك بەكێك لە ڕیزی شێتەكان یاخود وەك نەخۆشێكی بێچارەی دەستلێشۆراو تەماشا دەكرا. پێش ئەو ڕووداوە بەماوەیەكی كەم دەستیكردبوو بە نووسینی كۆمەڵێ پەیام و نامەی سەیرو سەمەرە و ناردنیان بۆ هەوادارانی و دوژمنەكانی، بۆ

نمونە نامەیەکی نووسی بۆ قوتابیەکەی (پیتەرگاست) کە لەپاشاندا لەگەڵ ئەلیزابیسی خوشکی (نیچە)دا بەرهەمەکانیان بڵاوکردەوە. (نیچە) لەو نامەیەدا هەردوکیان بەتایبەتی خوشکەکەی بە تەحریفیەت تاوانبار دەکات: ( لەکاتێکدا توشی حاڵەتێکی کوشندەی هەستی خۆبەزل زانین و قارەمانییەتی هاتبوم پەیامێکم بۆ کۆشکی پاشایەتی ئەوروپا نووسیو تێیدا داوای ئەوەم کردووە بنەماڵەی پاشایەتی ئەڵمانیا کە بنەماڵەیەکی گێل و سەرشێت و رەگەزێکی شەڕانگێزنو دەستیانگرتووە بەسەر عەرشی فەرەنساو هەرێمی لزاس دا لەناوببرێن و تەفروتونا بکرێن). هەر لەسەرئەم ریتم و بالۆرەیە (نیچە) داوای زیندانیکردنی پاپاو لەسێدارەدانی تزاری ئەڵمانی (فیلهلم)و بسمارکی راوێژکاری دەکرد. نامەکانیشی بەناوی خوای پیت و بەرەکەتی ئەغریقی (دیونزیۆس، ئەدۆنیس، یان تەموون)ی بابلییەکانەوە ئیمزا دەکرد، یاخود بەناوی (نیچە)ی قەیسەر، یان (نیچە)ی لەخاچ دراوەوە ئیمزای دەکردن، هەروەها نامەشی بۆ بێوەژنەکەی مۆسیقاری ئەڵمانی بەناوبانگ (ریچارد ڤاگنەر) نووسی. (نیچە) پەیوەندییەکی قووڵ و لەڕادە بەدەری سۆزداری لەگەڵ ئەو بێوەژنەدا هەبوو، ئەم پەیوەندیەش بەشێوەیەکی زۆر ناخۆش و تراژیدیانە کۆتایی پێهات، ئەویش دوای ئەوەی (نیچە) هێرشێکی توندی کردە سەر (ڤاگنەر)و چەندین قسەی ناشرین و سوکی پێووت (بۆ دۆستی خۆم شاژنە ئەریاندا! زۆر مایەی سوکایەتییە من مرۆڤ بم، گەرچی ماوەیەکی درێژیشە لەنێو ئادەمیزادەکاندا دەژیم و وام لێهاتووە هەموو ئەو شتانە دەزانم کە لەوانەیە خەڵکانێکی گەورە یان خەڵکانێکی بوودەڵەو گرگن ئەنجامیبدەن، هەربۆیە لەلای هندییەکان بوزا بووم و لەلای گریکییەکانیش دیونزیۆس بووم، تەنانەت ئەسکەندەری مەکدۆنیو قەیسەری رۆم دوو نموونەی بەرجەستەی زیندووی من بوون، هەروەها گۆڕام بۆ شەکسبیرو لۆرد بیکۆن)یش. کاتێك (نیچە)ی فەیلەسوفیان گواستەوە بۆ خەستەخانەی شێتەکان لە شاری (بینا)ی ئەڵمانی بە کاربەدەستانی ئەوێی راگەیاندبوو کە هاوسەرەکەی (کۆزیما ڤاگنەر) ئەمی هێناوە بۆ خەستەخانە، ئەم ( کۆزیما ڤاگنەرە)ش هەرگیز وەڵامی نامەکانی (نیچەی) نەداوەتەوەو هیچ کاتێکیش سەری خۆی بە حەزو خۆشەویستییەکەی ئەوەوە نەیەشاندووە. بەڵام دیاردەی ئەم نامە تەلیسماویانە ئەو حاڵەتە نیشان دەدەن کە (نیچە)ی تێکەوتبوو، حاڵەتی تەنهاییەکی کوشندەو بێزاریو بێبەشییەکی گەورە لە سۆزو خۆشەویستی.

لە واقیعدا (نیچە) کەسێکی تەنهاو گۆشەگیر بوو، لە ژیانیشیدا هیچ ئافرەتێك خۆشەویستی لەگەڵ نەکردووە هەرچەندە چەند ئافرەتێك لەوانەش بەتایبەتی (لوسالۆمی) ئەو ئافرەتە شۆخە بەرەگەز روسییەی سەرەتا رۆڵێکی زۆر گەورەو بەرچاوی لە ژیانی (نیچە)داو دواتریش لە ژیانی (ریلکە و فرۆید)دا گێڕا. ئەم ئافرەتە زۆر سەرسام بوو بە (نیچە) تا ئەو ئاستەی کتێبێکی لەسەر نووسیو تێیدا باسی رێبازی فەلسەفەی (نیچە) و وەرچەرخانە فیکرییەکانی دەکات.

یەکێك لەو دیمەنە کاریگەرو دڵتەزێنانەی پاش گەڕانەوەی بۆلای دایکی (نیچە) تێیدا دەردەکەوێت ئەو دیمەنەیە کە (نیچە) تێیدا نابووتو تێکشکاوەو ئەقڵ و هەردووچاوی لەدەست داوە و، دەستیو قاچی تووشی شەلەل بوون، سمێڵیشی بەجۆرێك درێژ بووبوو دەمی داپۆشیبوو،

ئەمە لەکاتێکدا پێشتر سمێڵی کورت و ڕێکوپێک بوو. ئیدی کار گەیشتە ئەوەی تەنانەت چیتر توانای جوینی خواردنیشی نەبێت و لە (25)ی ئابی *1900*دا ژیانی لەدەست بدات. بەڵام ئەم (نیچە)یە کێیە کە لەئێستاداو لە سەرتاسەری ڕۆژئاوادا سەرلەنوێ زیندوو بوەتەوەو گرنگییەکی بەرفراوانی پێدەدرێت؟

(فردریش فیلهام نیچە) لە *15-10-1844* لەئاوایی بروکن کە سەر بە ناوچەی (ساکسن)ە لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیاو لە خێزانێکی پرۆتستانتی دیندار لەدایك بووە، باوك و باپیری (لە دایکی و باوکییەوە) لەو بەشەی ئەڵمانیا کە زۆر جار و بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕی پێی دەڵێن جێگای (بلیمەتەکان) لە کلێسادا خەریکی وەعزدان بوون.

(نیچە) پەیوەندی خزمایەتییەکی دووری لەگەڵ (ریچارد ڤاگنەر) و (فریدریش شلیگل)ی فەیلەسوفدا هەبوو، بەڵام زۆرجار حاشای لە ئەسڵی خۆی دەکردو، ئەسڵی خۆی بە ڕەگەزێکی سووك و کەم دادەنا، جارێکیان لافی ئەوەی لێداوە کەوا باوباپیرانی لە خانەدانەکانی پۆڵەندان و پێیان دەوترێت (نیتسکی)و، لە دێر زەمانەوە کۆچیان کردوە بۆ ئەڵمانیا، ڕاستی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە(نیچە) بۆ خۆی ئەمەی دروستکردوە هەر لەبەرئەوەی جارێك ڕێبوارێك بەسیماو لەشولاریدا بە پۆڵەندی زانیوە.

پاش ئەو شۆڕشە گەورەیەی لە ساڵی *1848*دا هەموو ئەڵمانیای گرتەوەو تێیدا پاشای ئەڵمانیا ناچار کرا واز لە تەخت و پلەوپایەکەی بهێنێت، باوکی (نیچە) کە هەوادارو لایەنگری پاشا بوو تووشی هەرەس و تێکشکاندن بوو، لەبەرئەوە دەستیکرد بە مانگرتن لە خواردن، دوای چەند مانگێك گیانی دەرچوو کۆچی دوایی کرد، لەو کاتەدا (نیچە)ی کوڕی هێشتا پێنج ساڵی تەمەنی پڕنەکردبووەوە. ئەم ڕووداوە کاریگەرییەکی زۆر گەورەو قوڵی لەسەر دەروونی ( نیچە)ی منداڵ بەجێهێشت کە هەرگیز نەیتوانی دەستبەرداری ببێت و خۆی لێ ڕزگار بکات، هەر بۆیە لە بەرهەمێکیدا بەناوی "*Ecce Homo*" دەنووسێت وەك ژیاننامەی خۆی وایە کەوا باوکی لە تەمەنی سی‌وشەش ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە: (ئەو مرۆڤێکی ناسك بوو، خۆش مەشرەب و لە هەمان کاتیشدا پیاوێکی کاڵفام و پەڕپوت بوو، وەك ئەوەی هەر لە سەرەتاوە خۆی بۆ نەمان و لەناوچوون ئامادە کردبێت . لە هەمان ئەو ساڵەی ئەو ژیانی تێدا لەدەستداو کۆچی دوایی کرد ژیانی منیش بەرەو دواوە ڕۆیشت تا لە تەمەنی سی و شەش ساڵیمدا گەیشتە ئەوپەڕی پلەی شکست و هەرەسهێنان).

(نیچە) ساڵانی سەرەتای ژیانی لە ناوەندێکی تەواو ژنانەدا بردووەتە سەر، ئەمە وایلێکرد کاتێ گەیشتە تەمەنی باڵق بوون ئەوەندەی لەتوانایدا هەبوو لە داپیرەو ئامۆژنەکانی و دایکی و خوشکەکەی دووریکەوێتەوە. خوشکەکەی یەکەمین کەسێك بوو پەی بە توانا و بلیمەتی ئەو ببات، هەر بۆیە کەوتە هەڵگرتن و پاراستنی شیعرو نووسینەکانی سەرەتای. دوای ئەوەی خوێندنی ئامادەیی تەواوکرد یەکڕاست چوو بۆ شاری بۆن بۆئەوەی لە زانکۆکەیدا تیۆلۆژیا و زانستی زمان بخوێنێت، ئا لەوێدا بیرو بۆچوونە فەلسەفییەکانی دەستیکرد بە پێگەیشتن و نەشونماکردن، بۆ نموونە لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا ئەمەی نووسی (چیم داوە بەسەر کاری ئەم مرۆڤە و ئیرادە نیگەرانەکەیەوە! فەرمانە ئەبەدییەکانی کە دەڵێت

"پێویستە لەوە بکۆڵینەوە پێویستە واز لەوە بێنین" چ پەیوەندییەکی بە نیچەوە هەیە و بۆچی ئەو چ کاریگەرییەکی هەیە، هەروەها لێکۆڵینەوەی تایبەتی بەشێوەی هونەرییەکی باش بڕوانەکان چونکە جیاوازن لەم دنیایە لەوانی سەرپەرشتیان و هیچ کەسێک بە ئەخلاق نادەن، لەم دنیایە هیچ شتێک پاکێتییان لێک نادات تەنها شتێک بیرکردنەوە نەبێت تا لێرەدا شتێک هەست بە کاریگەریی "شاراوەی شۆپنهاوەر" لەسەر نیچە دەکات بەجۆرێک کە ڕەگەزەکانی سروشت بەهێزی لەو هێزە ناوەکییانەی خۆیەوە کە بەدەرە لە ویستی مرۆڤە گوزارشت لە خۆی دەکات، لەو ڕەگەزانە بووەتە ڕاستییەک و ڕەمزێک لە کاتێکدا مرۆڤ بە بەراوردکردنی لەگەڵ سروشتدا بووەتە بوونەوەرێکی لاواز و داکەوتوو، لەم ڕووبەرانە وای لە (نیچە) کرد کە بڕوای وابێت ئیتر ئاگری پێچەوانە پێچ بگرێتە بەر کە بەسەرهاتی هەمووی پێوەبەستراوەتەوە بەسەر لە هونەرەکاندا دەبینرێت و ئەو بە هۆیەی لێیان ڕادەمێنێت پێش ئەوەی بیخاتە بەر زەبری گومانە بەرپەرچدانەوەکانی تا وایلێهات هیچ شتێک لەناوەوەی مرۆڤی ئەوسا دەرخرێتەوە پاش گرتنی و لەم لە ڕوانگەی دیدگایەکی جیاوازترەوە باسی لێوە دەکرێت،

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا "نیچە" هەستێکی سووکی لەئەوانیەتی پێیەوە دیارە و زاڵە بەسەریدا.

هەروەها لە جەنگی ئەڵمانیا دژ بە فەرەنسا وەک کارمەندێکی پزیشکی مەیدانی خۆی ناونووس کرد، بەڵام دوای ئەوەی تووشی حاڵەتێکی ئاڵەباری تەندروستی هات گەڕایەوە شاری بازل لە سویسرا، لەوێ دەستیکرد بە گوێگرتن لەوانەکانی فەیلەسوفی مێژوو "یاکوب بوکهارت" کە سەبارەت بە گرنگی ڕۆڵی گەورە پیاوان بوو لە دروستکردنی مێژووی جیهاندا.

لە ساڵی *1871* (نیچە) کتێبی "لەدایک بوونی تراژیدیا لە میانەی ڕۆحی مۆسیقاوە"ی تەواوکرد، لەم بەرهەمەیدا "دیۆنسیۆس"ی خوای لەززەت و خۆشی و پیت و بەرەکەت لەگەڵ "ئەپۆلۆ"ی خوای هونەر و دروستبوون یان خوای خەون وەک ئەوەی "نیچە" ناوی لێناوە، بەیەکدەگەن. "نیچە" دەیەوێت لە ڕێی تێکەڵبوونی ئۆرگانی ئەم دوو خوایەوە خودی ژیان لە ڕەگەزە عەقڵانییەکان و تەکنیکییەکان رووت بکاتەوە، یان لە دەستەمۆکردنی ئاینیی دابماڵێت کە فەیلەسوفانی گریک لەدوایدا پەیڕەوییان لێکرد تا ئەو شتەی کە ئاسمانییە بیخەنەوە بەردەستی مرۆڤەکان و گەڕبوون لە میتافیزیکا و هەموو ئەو شتانەش کە لە پشتی هەستەکانەوەیە دابماڵێ. هەربۆیە جەوهەری ژیان پەیوەندی بە ئەخلاقەوە نییە، چونکە ئەخلاق "ئیرادەیەکە بۆ سڕینەوەی ژیان، ئەو غەریزە نهێنییەیە کە لە ناوەوە ژیان تێکدەدات، ئەخلاق بچووک و یەکگرتنی ژیانەو پرانسیپێکە بۆنەوەی بوونی ژیان بە درۆ بخاتەوە "بەڵام مرۆڤی ڕاستەقینە وجودی تەواوەتی خۆی تەنها لە میانەی ئەو دیاردە جوانانەی جیهانی خەوندا دەبینێتەوە، لێرەوە هەموو مرۆڤێک لە میانەی خەون و خەیاڵەوە دەبێتە هونەرمەندێکی تەواو، ئەمەش بەراییەکی بنچینەییە بۆ هەموو هونەرە شێوەکارییەکان.

مرۆڤی فەلسەفی هەست بەوە دەکات کەوا لەژێر ئەم ڕاستییە خەوناوییە و بەرچاو و دیارەدا ڕاستییەکی ڕوونتری دیکەش هەیە، واتە ئەوەی کە دەیبینین گوزارشتە لە ئیرادەی شتەکان و لە ئیرادەی ناوەوەی خۆمان، ئەمەش بەپێی بڕوای (شۆپنهاوەر) کە (نیچە) لەم بابەتەدا پشتی پێبەستووە و هەر ئەویشە وتوویەتی توانستی خەیاڵکردنی شتەکان و خەڵک بەو پێیەی کە

وێنەیەکی ئارەمایی ئامێز و ڕاگوزەرە لەمە خۆی لە خۆیدا توانستێکی فەلسەفیە. بەڵام تەنانەت خودی ئەپۆلۆ ئەوە باش دەزانێ کەوا جوانیو هاوسەنگی لەسەر بنەمایەکی شاراوە لە ژان و ئازارو مەعریفە جێگیر بوون و ڕاوەستاون کە تەنها خودی دیۆنیزۆس دەتوانێ نهێنییەکەی ئاشکرا بکات، لێرەوە ئەو پەیوەندییە دیالەکتیکیەی نێوان لەوەی هونەرییەو ئەوەی هەست پێکراوە ئەو بنەمایەیە کە ژیانێکی مرۆڤانەی تەندروستی لەسەر بنیاد دەنرێ، ژیانێکی خۆشگوزەران و خاڵی لە هەموو خەوشێکی ئایدیۆلۆژی. هەروەها زانست نابێت تەنها ملکەچی یاساکانی زانست بێت، بەڵکو دەبێت لە ڕوانگەو دیدێکی هونەرمەندانەوە چاودێری بکرێت.

(نیچە) هەڵپەی زانایانی ئەڵمانی بەرەو زانستێکی ئەبستراکتی داماڵراو لە هەموو سۆزێکی مرۆڤانە دەداتە بەر ڕەخنە و، بە مێگەلێکی سەرگەردان کە بەشێوەیەکی چڕ سەرقاڵی مەعریفەن ناویان دەباتو پێی وایە ئەمانە هیچ ئامانجێکی پەروەردەیی بەرزیان نییە، جگە لە هەندێ سودو بەرژەوەندی زۆر دیاریکراو نەبێت.

(نیچە) کتێبە قەبەکەی (مرۆڤ دۆست، فرە مرۆڤ دۆست) بڵاوکردەوە، کۆمەڵێ لە ئامازەکانی -الومضات- یان لە نووسینە کورتەکانی یاخود ڕاستتر بڵێین هەندێ لە شەتەحاتە فیکریە توندەکانی، ئەو شەتەحاتە فیکریانەی کە لە قوڵاییاندا بەریەک دەکەون، خستبووە دووتوێی ئەم کتێبەوە، بە باوەڕی (نیچە) قەناعەتەکان، زۆر زیاتر دوژمنی سەرەکی ڕاستین تا درۆکردن. ئەو خەڵکانەی پەی بە نهێنی ناوەوەی شتەکان دەبەن و بە نێویدا شۆڕدەبنەوە لە بەرامبەریاندا زۆر کەم بەوەفادەبن، ئەوان کاتێك تیشك دەخەنە سەر ئەو قوڵاییانە: دەبینن هێشتا شتگەلێکی زۆری ناشرین لەوێدایە کە دەکرێ ببینرێن. لەبارەی سادەیی و خاکیبوونەوە دەنوسێ و دەڵێ (ئەوەی لەبەرامبەر خەڵدا سادەییو خاکی بوون دەنوێنێ ئەوە لەهەمان کاتدا لە بەرامبەر دیاردەی وەك شار دەوڵەت و کۆمەڵگاو زەمەن و هەموو بەشەریەتدا خۆی بە لووت بەرزو خۆ بەزل زان نیشان دەدات، ئائەمەشە تۆڵەسەندنەوەی ڕاستی). هەر لەم کتێبەدا (نیچە) ئاماژەیەکی جوان دەردەبڕێت و دەڵێت (باشترین ئامرازێك بۆ مرۆڤ تا ڕۆژێکی تازە لە ژیانیدا دەستپێبکات ئەوەیە لەکاتی لەخەو هەستانیدا بیر لەوە بکاتەوە کە ئایا لەتوانایدایە لانی کەم ئەمرۆ دڵی مرۆڤێك خۆشکات).

بۆ جاری دووەم ئازار بەرۆکی (نیچە) دەگرێت و باری تەندروستی تێك دەچێتەوە ئەمەش وایلێدەکات بەدەم ئازارەوە بناڵێنێ (من ئێستا لە تاریکایی مردندا دێم و دەچم، بوونم بوەتە بارێکی قورسی ترسناك، دەبوایە هەر لە زووەوە لە خۆمی داماڵم و فڕێی بدەم..)

ئەو لە کتێبی (زەردەشت ئاوا دوا)دا گەیشتە دابڕانێکی تەواوەتی لەگەڵ فیکری خۆرئاوادا، وەك (شۆبنهاوەر)ی مامۆستای ڕوویکردە فەلسەفە خۆرهەڵاتییەکان، بەتایبەتی فەلسەفەی هیندیو فارسی. لە دوانامەیدا بۆ دایکی سکاڵا دەکاتو دەڵێت (دایکە هیچ شوێنێکم نەخۆش نییە تەنها ڕۆحی ئازیزم نەبێت) بەڵام ئەم ڕۆحە ئازیزە دەستبەرداری گۆشەگیری و خۆبەدەستەوەدان نەبوو، بەڵکو بووە ڕۆحێکی داهێنەر.

**سەرچاوە**

پاشکۆی ڕۆشنبیری (الملحق الثقافی)
ڕۆژنامەی (السفیر)ی لوبنانی.

# جۆلیان گرین

## ژیان بەندیخانەیەکە بە خەوبینین بە ئازادییەوە دەیبەینە سەر..

■ ئامادەکردنی :شۆڕش محەمەد حسێن

هەواڵی مردنی نووسەری بە ڕەچەڵەك ئەمریکی و لەدایکبووی فەرەنسا "جۆلیان گرین" لە "*13*"ی ئابی ساڵی -*1998*- و لە تەمەنی "*97*" ساڵیدا ڕاگەیەندرا. ئەوەی لەم مردنەدا سەیر بوو ئەوەبوو کە کوڕەکەی "کە هەڵیگرتبۆوە" و ناوی "جان-ئەریك گرین"ە پاش تێپەڕبوونی "سێ چوار" ڕۆژ مردنەکەی باوکی ڕاگەیاندو بڵاویکردەوە.

سەرەڕای ناوبانگی گرین بەڵام دەربارەی مەراسیمی تەرم ناشتنەکەی بە تەنها ئەوە ڕاگەیەندرا کە لە "دەرەوەو لە چوارچێوەیەکی زۆر گەرمدا نێژرا" بەبێتەوەی شوێنی ئەم "دەرەوەیە" و سیماکانی دیاری بکرێت.. کە پێدەچێ ئەمە "وەسیەتی" گرین خۆی بووبێت.

"جولیان گرین" لە "*6*"ی ئەیلولی ساڵی "*1900*" لە خێزانێکی ئەمریکی خاوەن ڕەچەڵەکێکی ئینگلیزی لەدایکبووە، بەڵام شوێنی لەدایکبوونەکەی "پاریس" بوو کە دایك و باوکی بە هۆکاری کارکردنەوە لەوێ نیشتەجێ بوون، باوکیشی لە کارگەیەکی بازرگانی "هەناردەو هاوردەدا" کاریدەکرد. ئەم خێزانە لە ماڵەوەدا بۆ گفتوگۆی خۆیان زمانی ئینگلیزیان پاراستبوو کە ئەمەش یەکەم ئاماژەی ئیزدواجیەتێکی ڕۆشنبیری و زمانەوانی بوو کە چوارچێوەیەکی تێکشکاو و دوبەرەکیەکی گەورەو تیژی لە ژیانی "گرین"دا پێکهێناو لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی هاوەڵی بوو.

"جولیان گرین" پەروەردەکردنێکی پرۆتستانتی زۆر توند فێرکراو لە تەمەنی چواردە ساڵیدا واتا لە دەورویەری هەلگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی یەکەمین تراژیدیا لە ژیانیدا ڕوویدا کە مردنی "ماری هارتریدج"ی دایکی بوو، لەپاش

بەسەربردنی ماوەیەکیش لە خوێندنی قوتابخانەیەکی فەرەنسیدا باوەشی بۆ "کاسۆلیك" کردەوە.

لەپاش ئەوەی بەسەربازکردنی رەتکرایەوە بەهۆی کەمی تەمەنیەوە، بە خۆبەخش پەیوەندی بە بەشی فریاگوزاری سوپای ئەمریکاوە کردو بنکەی کارکردنی فریاگوزاریەکەشی لە ئیتالیا بوو و لەوێش هەندێ نووسەری ئەمریکی ناسی کە لە خزمەتی سەربازیدا بوون لەوانەش "ئەرنست هەمنگوای و دوس باسوس".

جێی ئاماژە بۆکردنە کە ئەم ئەزموونەی وەك فریاگوزارو برینپێچێك لە ناوچەکانی شەردا روبەرووی کردەوە لەگەڵ مەرگدا، بەتایبەت لە کاتی هەڵگیرسانی شەری خەندەقە بەناوبانگەکاندا کە بەراستی قەسابخانەیەکی راستەقینە بوو. لەپاش ئەمانەش خاڵی بانگهێشتی کرد بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ خوێندنی زمان و وێژە لە زانکۆی ویلایەتی "فرجینیا". لەگەڵ گەیشتنی بەو "ویلایەتە" گرین وتی: "لەپرتاو چاوم بەرامبەر نیشتمانی دایکم کردەوە" هەر لەوێش یەکەم چیرۆکی خۆی بلاوکردەوە کە هێشتا لە تەمەنی "20" ساڵان بوو.

پاش دوو سێ ساڵ نووسەر لە ساڵی "1922"دا گەرایەوە ئەوروپا لەپاش ئەوەی مانەوەی لە ئەمریکادا کاریگەرییەکی قوڵی لە ناواخنی دەرونیدا بەجێهێشت، لێرەشدا بە هەمان شێوە ئاماژەیەکی بەهێز لە ئاماژەکانی هەستکردنێکی تیژ بە ئینتمابوونی ئیزدواجیەت لەلای گرین بەدی دەکەین، کە بە درێژایی ژیان هاوەڵی دەکرد تەنانەت زۆرجار "گرین" بە "انفصام الشخصیە" پێناسەی دەکرد.

لەو قۆناغی لاوێتییەیدا بیری لەوە دەکردەوە ببێتە وێنەکێش پاشان فەیلەسوفی کاسۆلیکی "جاك ماریتان"ی ناسی و چەند هەوڵێکی نووسینی بلاوکردەوە لەبارەی بەرهەمەکانی "بلاك و جویس" و بووە یەکێك لە نووسەرانی فەرەنسا. لە ساڵی "1927" دوو بەرهەمی بۆ بلاوکرایەوە کە ئەو ساڵەش بوو تیایدا باوکی کۆچی دوایی کردو هەر لەو ساڵەشدا نووسەری فەرەنسی بەناوبانگ "ئەندریە-جید"ی ناسی. "جولیان گرین" بۆ ماوەیەك لە کاسۆلیك دورکەوتەوەو چووە ئەوروپا بۆ گەران و وەك هەڵهاتنێك لە جیهانی پاریسی. هەروەك چۆن چەندین جار بە سەردان چۆتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو

لەوێش تووشی گرێی دەروونی بەهێز دەبوو.

ئەم گرێ دەروونیانەش گرین بەو وتەیەی خۆی کورتی دەکردەوە کە دەیووت: "هەمیشە هەست بە دوو حاڵەتی دژ بەیەك دەکەم کە تێیدام ئەویش خۆشیو ئازارە".

دەقەکانی "گرین" بە دلخۆشیەکی زۆرەوە لەلایەن چەندین نووسەری بەناوبانگ پێشوازی کرا، لەپێش هەمووشیان "ئەندریە جید" بوو.

لە ساڵی "1938" یەکێك لە نووسەرەکان بانگهێشتی کرد بۆ "لەندەن" تاوەکو بە شیکەرەوەی دەروونی بەناوبانگ "سیگمۆند فروید"ی بناسێنێ. لەوکاتانەشدا "گرین" دەربارەی "نووسینی ئامێری -ئۆتۆماتیکی" دەدوا، هەر ئەمەش کە خستیە خانەی یەکەمین ئەو نووسەرانەی کە درکیان بە گرنگی شیکردنەوەی دەروونی دەکرد لە چنینی بەرهەمێکی ئەدەبیداو بنیاتنانی چەندین کەسێتی پتەو و بەهێز.

ئەوکاتەی جەنگی جیهانی دووەم بەرپا بوو، "گرین" زۆربەی کاتی لەو قۆناغەدا لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا بەسەربرد، لە پاشان و لەگەڵ کۆتایی جەنگدا گەرایەوە

فەرەنساو هەتا ڕۆژی مردنەکەی لەوێ مایەوە.

لە ساڵی "*1971*"دا وەك ئەندامێك لە ئەکادیمیای فەرەنسیدا هەڵبژێردراو تیایدا جێگەی نووسەری فەرەنسی "فرانسوا موریاك"ی گرتەوە.

لە ساڵی دواتریشدا پەرتوکخانەی "بلیاد" کە دەزگایەکی بەناوبانگ و دانسقەی بڵاوکردنەوەو لەچاپدانی بەرهەمەکانی نووسەرە بەناوبانگەکان بوو، سەرجەمی نوسراو و بەرهەمەکانی "گرین"ی لەچاپداو بڵاویکردەوە.

بەپێی ئامارێکی ورد نزیکەی "*60*" پەرتووکی "گرین" بڵاوکراوەتەوە کە دابەش دەکرێنە سەر: ڕۆمان و چیرۆك و شانۆو هەوڵ و یاداشتەکان، کە سەرجەمیشیان هەڵگری لایەنێکی بەدواداچوونی میتافیزیکین و گەواهی لەسەر ناخۆشی دوودڵی و کەنارگیری دەداو بە شوێن منداڵی بزرکراودا دەگەڕێ و تیایدا لە یەك ساتدا: خەون و دێوەزمەو بەزەیی و بێزاری و ناخۆشیەکانی بێبەشی "حرمان" و ئارەزووە جێبەجێنەکراو و خەفەکان دەبینینەوە. هەر ئەمانەش بوو کە ئەو ڕوانینەی دروستکردبوو کە "گرین" وەك بەندکراوێك بەتایبەت لەناو ژیانیدا دەردەخست.

لەم بارەیەوە "گرین" دەڵێ: "پەرتووکەکانم پەرتووکی "مرۆڤێکی بەندکراوە کە خەو بە ئازادییەوە دەبینێت". بەڵکو تەنانەت ژیان وەك بێ ماددەو بێ خولگەیەکی ڕاستەقینە دەردەکەوێ. "هەندێ سات وا دەردەکەوێ لەلام کە من نازیم، بەڵکو خەون بەوەوە دەبینم کە دەژیم و هەموو ژیانی ڕابووردو وەك جۆرێك لە خەون دێتە بەرچاوم کە هەموو ڕۆژێ لێی بەئاگا دێم پاشان هەموو ڕۆژێ بەردەوام دەبێ". هەروەها پێدەچێ یاداشتەکانی "جولیان گرین" زۆرترین ئەو شتانە بێت کە جێی تێرامانە چونکە "*17*" بەشی لێ چاپکراوە کە لە پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی "*30*" ساڵان دەستی داوەتە نووسینی.

"گرین" لە ساڵی "*1986*"داو لە یەکێك لە پەرتووکە یاداشت ئامێزەکانیدا دەنووسێت کە لە زۆربەی ئەو کاتانەی باسی لە ناوبانگی و ناوی خۆی کردووە هەستی بە هەژانێکی سووك کردووەو بە خودی خۆی وتووە: "ئەمە من نیم، ئەو کەسێتیە نیم، کەسێکی تر لە ناخمدا هەیە، من نایناسم و ناشتوانم بیناسم.. بێگومانم کە ئەو کەسە پەرتووکەکانم دەنوسێت.

هەروەها لە بەشی "*16*"ی یاداشتەکانیدا کە ساڵانی نێوان "*1993-1996*" لەخۆ دەگرێ، "گرین" دەربارەی هەستکردنی توندوتیژی بە ئیزدواجیەت دەنووسێ و دەڵێ: "ئەوەی زۆرتر بەلامەوە گرنگە ئەوەیە بزانم من کێم؟! لە ناواخنماندا بەشێکی نادیار دەمێنێتەوە ئەویش "کەسێکی" نزیکەو لەگەڵ کاتدا دەگەینە ناسینی، بۆچی ئەم هاوڕێ سێبەرییە "بوونی" هەیە؟!.. هەر ئەو گەڕانەی "گرین" و سەرقاڵبوونی بە دۆزینەوەی ڕاستی خودە تێکشکاوەکەی کاریگەر بوو بەسەر نووسراوەکانیدا تاوەکو لایەنێکی تراژیدی تیژ لەخۆ بگرێ.. هەر ئەمەش وای لێدەکات نزیك بێت لە نووسەرە ئەمریکیە ڕەشپێستەکان وەك نزیکبوونی لە نووسەرە فەرەنسیەکان..بەهەرحاڵ ژیانی وا دەردەکەوێ کە فراوانی و قوڵبوونەوەو بەدیهێنانی وتەکەی شاعیری گەورەی فەرەنسی "رامبۆ" بێت کە دەیوت: (من "بونەوەرێکم" لە دەرەوەی خۆم).

***سەرچاوە***

*ژمارە -*12959*-ی ڕۆژنامەی -الحیاة- ڕێکەوتی "*27*-ی ئابی -*1998*"

# سێ پرسیار لە هانس - جۆرج گادامێر

■ نووسینی: جاك دریدا
● و. لە ئینگلیزییەوە: عەتا

لەکاتی موحازەرەکەو گفتوگۆی دوای موحازەرەکەی دوێنێ ئێوارەدا، من کەوتمە ئەوەی لە خۆم بپرسم داخۆ جگە لە گفتوگۆی نەشیاوو پرسیارکردنی ڕووبەڕوو، بەدواداچوونی بابەتە ئاشکرانەکراوەکانی فیکر شتێکی تر ڕوویان دەدا. بە مەبەستی بەیادهێنانەوەی هەندێ لەو داڕشتنانەی کە گوێمان لێیان بوو، من هێشتا ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەمەوە.

ئێمە پێکەوە لێرەدا لە دەوری پرۆفیسۆر گادامێر کۆبووینەتەوە، من پێم خۆشە ئەم وشانەی ئاراستە بکەم و وەکو ڕێز چەند پرسیارێکی کەمی بخەمە بەردەم.

پرسیاری یەکەم پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئەو دوێنێ ئێوارە لەبارەی "ئیرادەی باش"ەوە لەبارەی داواکردنی ئیرادەی باشەوە بۆ ئێمەی باسکرد بە مەبەستی پەیوەستبوونی ڕەها بە ئارەزووی دەستەجەمی بوونەوە لە تێگەیشتندا. چۆن هەرکەسێك ناجولێنرێت بۆ داننان بەوەدا کە ئەم بەڵگەنەویستە بەشێوەیەکی لە ڕادەبەدەر ئاشکرایە؟؟ کە ئەمەش تەنیا یەکێك لە بەڵگەنەویستە ئەخلاقییەکان نییە. بەڵکو ئەو خاڵەیە کە لێیەوە ئەخلاق بۆ هەر کۆمەڵە قسەکەرێك دەستپێدەکات و تەنانەت دیاردەی ڕێکنەکەوتن و خراپ تێگەیشتنیش ڕێکدەخات. ئەوەش کەرامەت لە ڕوانینی کانتەوە بۆ ئیرادەی باش پێشکەش دەکات. بە مەبەستی زانینی ئەوەی کە چ شتێك لە "بوونی ئەخلاقیانە" دەکەوێتە ئەودیوی سەرجەم بەهای بازاڕو هەر نرخێکی گفتوگۆ لەسەر کراو و هەر گریمانێکی شێوە فەرمانییەوە، لەبەرئەوە دەشێ ئەم بەڵگەنەویستە بێمەرج بێت و لە دەرەوەی هەر جۆرە هەڵسەنگاندنێك بوەستێت و لەودیوی هەموو بەهایەکەوە بێت، ئەگەر بەهایەك لە گەوهەردا ئاماژەی پێوانەو بەراورد بکات.

دەشێ دوای ئەوە پرسیاری یەکەم بەمجۆرە بێت: لەگەڵ ئەوەشدا ئایا ئەم بەڵگەنەویستە

پێشتر وای دانانێت کە ئیرادە شێوەیەکە لەو بێ مەرجییەتییەو دوا پێگەبەتی و دوا بڕیارییەتی؟ وەکو کانت دەڵێت ئیرادە چییە، ئەگەر هیچ شتێك بە شێوەیەکی رەها باش نەبێت بێجگە لە ئیرادەی باش؟

ئایا ئەم بڕیاردانە ناگەڕێتەوە بۆئەوەی کە هایدگەر بەشێوەیەکی دروست ناوی بردووە بە "بڕیاردانی بوونی بوونەکان وەکو ئیرادە یان زاتییەتی ئیرادەکردن؟" ئایا ئەم ڕێگایەی قسەکردن لەوپەڕی پێویستبوونیدا سەر بە قۆناغێکی دیاریکراو نییە، واتە قۆناغی میتافیزیکای ئیرادە؟

پرسیاری دووەم هێشتا پەیوەندی هەیە بە موحازەرەکەی دوێنێ ئێوارەوە:

چی دەکرێت سەبارەت بە ئیرادەی باش ئەگەر یەکێ بیەوێت هێرمۆنتیکای دەروونشیکاری لەگەڵ هێرمۆنتیکای گشتیدا یەك پێبگرێت -یا هەلومەرج بۆ ڕای دەستەجەمی تەنانەت جێگای نارازی بوونیش بێت-؟ ئەمە هەر ئەوەیە کە دوێنێ ئێوارە پرۆفیسۆر پێشنیاری ئەنجامدانی کرد. بەڵام ئایا واتای ئیرادەی باش لە دەروونشیکاریدا چییە؟ یان تەنانەت لە گوتارێکدا کە بەدوای هێڵەکانی دەروونشیکاریدا بڕوات؟

ئایا وەکو پرۆفیسۆر گادامێر بیری لێدەکاتەوە، دەشێ بەشێوەیەکی ئاسایی ئەوە بەس بێت بۆ فراوانکردنی سیاقی ڕاڤەکردن؟ یان بە پێچەوانەی ئەوەوە -وەکو من حەز دەکەم سەرنجی لێبدەم- ئایا ئەوە پێلێنان و هەروەها بنیادنانەوەی ئەو سیاقە بە گشتی و تەنانەت چەمکی دیاری ئەو سیاقە لەخۆ ناگرێت؟ من لێرەدا ئاماژە بۆ هیچ مەزهەبێکی تایبەتی دەروونشیکاری ناکەم، بەڵکو تەنیا ئاماژە بۆ پرسیارێك دەکەم کە بەهۆی ئەگەرەکانی دەروونشیکارییەوە لەلایەن ئەو دەروونشیکارانەوە کە هەوڵی ڕاڤەکردن دەدەن بەرپەرەکانی دەکرێت. هەر ڕاڤەکردنێکی لەمجۆرەش لەوانەیە لە شێوازی ڕاڤەکردنی نیتشەوە نزیکتر بێت لەچاو ئەوەی کە لە نەریتەکانی تری هێرمۆنتیکادا هەیە کە لە شلێماخەرەوە درێژ دەبێتەوە بۆ گادامێر بە هەموو ئەو جیاوازییە ناوخۆییانەی کە هەیەو لەوانەیە کەسێك حەز لە جیاکردنەوەیان بکات (وەکو ئەوەی دوێنێ شەو باسکرا".

پرۆفیسۆر گادامێر ئەم سیاقەی ڕاڤەکردنمان وەکو ئەو سیاقە بۆ وەسف دەکات کە ناوی دەبات بە "ئەزموونی زیندوو" لە دایەلۆکی زیندودا: ئەوەش لە ئەزموونی زیندووی دایەلۆکی زیندوودایە. ئەمە یەکێك بوو لە خاڵە هەرە گرنگ و بەکلاکەرەوەکان لەناو هەموو ئەوەی کە گادامێر لەبارەی گونجاندنی پەیوەندی سیاقییەوە بۆمان دووا -کە سیستاماتیکی بێت یان نا- چونکە بێ هەموو گونجاندنێك وەکو پێویستی فۆرمی سیستاماتیکی وەرناگرێت.

بۆ من، ئەوە بە شێوەیەکی چوونیەك یەکێك بوو لە هەرە پرۆبلاماتیکەکان. هەروەها ئەمە بۆ هەموو ئەو شتانە پیادە دەکرێت ک. گادامێر سەبارەت بە پێناسەکردنی دەقێك بە ئێمەی گوت، ئەو دەقە دەقێکی ئەدەبی یان شیعری یان ئایرۆنی بێت. لێرەدا من دیسان دوا پرسیارم دێتەوە یاد کە یەکێك لە بەشدارانی گفتوگۆکە خستیەڕوو، کە دەبوو ئەوە لەگەڵ دیاریکردنی کۆمەڵە یاسایەکدا بکرایە. ئایا لەم بارەیەدا سیاقی پەیوەست چییە؟ بە قسەکردنێکی ورد "فراوانکردنی سیاقێك" چییە؟ ئایا دەشێ فراوانبوونێکی بەردەوام بێت، یان دیسانەوە بنیادنانەوەیەکی پچڕپچڕ بێت؟

هەروەها پرسیاری سێیەمیش دەبێ سەبارەت بە بنیادی گرنگی ئیرادەی باش بەرزبکرێتەوە. داخۆ فیکری بە خەیاڵدا هاتووی

دەروونشیکاری دەکرێت بە وێنە یان ئەوا، دەشێ کەسێ ئەمانگو ئێستاش پرسیار بەرۆکانەوە سەبارەت بەو مەرجە پێشوەختەی بەلگەنەویستی گوتاری راڤەکردن کە پرۆفیسۆر گادامێر ناوی دەبات بە "تێگەیشتنی تەواوی تر" و "تێگەیشتن لە یەکتری". ئەگەر کەسێک لەبارەی رێککەوتنی دەستەجەمیەوە لەسەر بیروڕایەک یان لەبارەی خراپ تێگەیشتنەوە (وەکو لە باسەکانی شلایەرماخەردا" قسە بکات، ئەوا کەسێکی (تر) پێویستی بەوەیە بپرسێت ئایا مەرجی پێشوەختە بۆ تێگەیشتن، دوور لەوەی کە ببێتە بەردەوامێتی پەیوەندی "وەکو دوێنێ ئێوارە وەسف کرا" زیاتر پچڕاندنی پەیوەندی نییە، پەیوەندییەکی دیاری پچڕاندن و وەستاندنی هەموو تێڕامانێک؟

لە کۆتاییدا، پرۆفیسۆر گادامێر بە جەختکردنەوە ئاماژەی کردووە بۆ ئەو ئەزموونەی کە ئێمە هەموومان پەی پێدەبەین بە مەبەستی وەسفکردنی ئەزموونێک کە لە خۆیدا نابێت میتافیزیکانە وەربگیرێت. بەلام ناوبەناو - لەوانەشە تەنانەت هەموو کاتێ- میتافیزیک وەکو وەسفکردنی ئەزموونی لەمجۆرەو نواندنی لەمجۆرە خۆی نیشانبدات. سەرباری ئەوەش من قەناعەتم بەوە نییە کە ئێمە هەمیشە بەراستی ئەم ئەزموونەمان هەبێت کە پرۆفیسۆر گادامێر وەسفی زانینی دەکات لە دایەلۆگێکدا کە کەسێک بەتەواوەتی تێگەیشتووە یان تاقیکردنەوەی سەرکەوتنی جێگیربوونی کردووە،

لە پێکداچوونی داوەکانی ئەم پرسیارانەو تێبینی کردنەکاندا.. من لێرەدا لە بارێکی ناسەقامگیرو شلۆقدا بەرامبەریان دەمێنمەوە، ئایا کەسێک ناتوانێ بە رێگایەکی تەواو جیاوازی بیرکردنەوە بڕوانێتە دەقەکان؟

## سەرچاوە

*Dialogue and Deconstruction - New York.*

# کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریکی

■ ن: جۆرج تەرابیشی

● و. شوان ئەحمەد

*Serge Ricard (ed),*

*Etats- Unis D'Hier*

*Etats- Unis D'Aujourdhui.*

*L'Har mattan, Paris*

*1999,*

*400 Pages,*

دوای ئەوەی بە تاقیکردنەوە ستەمکاریی دەوڵەتی عەرەبی ئاشکرا بوو، لە هەردوو فۆرمە (ڕادیکال و کۆنسێرڤاتیزم)ەکەیدا، بەشێکی زۆر لە ئێمەی ڕووناکبیرانی عەرەب ئومێدی خۆمان بە وتەزایەکی ڕزگارکەری تازەوە گرێداوە، ئەو وتەزایەش: کۆمەڵگەی مەدەنییە، بەڵام ئەو پرسیارەی دەستبەجێ ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە کە ئاخۆ لە ڕووی تیۆرییەوە ڕەوایە، دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی وەک دوو جەمسەری دژبەیەک لە بەرامبەر یەکتردا دابنێین؟ ئایا کارێکی وا لە ڕووی زانستییەوە لەگەڵ واقیعدا دەگونجێت؟ ڕوونتر بڵێین: ئایا کۆمەڵگەی مەدەنی جێگای ئازادی و ئەقڵانیەتە، لە بەرامبەر دەوڵەتدا وەک ئاوەندێک بۆ ستەمکاریی و نائەقڵانیەت؟ ڕەنگە وەڵامدانەوەی پرسیارگەلێکی لەمجۆرە لە چوارچێوەی کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا کارێکی ئاسان نەبێت، چونکە لەناو ئەو کۆمەڵگایانەدا بە هیچ شێوەیەک وتەزای کۆمەڵگەی مەدەنی گەشەی نەکردوە.

بەڵام ئاخۆ دەبێت وەڵامی کۆمەڵگەیەکی وەک کۆمەڵگەی ئەمریکی چی بێت کە لەم بوارەدا ئەزموونێکی مێژوویی تایبەتی هەیە؟

سەرەڕای گەشەی بەرچاوی کۆمەڵگەی مەدەنی و دام و دەزگاکانی لەو وڵاتەدا، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان لە ڕووی مێژووییەوە خاوەن تایبەتمەندییەکی ترییشە، ئەویش ئەوەیە ئەمریکا تاکە نەتەوەیەکە لەناو نەتەوەکانی دنیادا کە بوونی کۆمەڵگەی مەدەنی تیایدا بەر لە کۆمەڵگەی سیاسی دەکەوێت و بوون و ئامادەگی ئەوە لە پێش دروستبوونی دەوڵەتەوەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریکی زۆر

پێشکەوتووترو زۆر ئەقڵانیتر دیار نیە، هاوکات زیاد لە دەوڵەتیش بە تەنگ بەهای ئازادیو پلورالیستیو یەکسانیو دیموکراسییەوە نایەت هەر لە کۆیلایەتییەوە تا ڕەگەزپەرستی دژ بە ڕەشپێستەکان، کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریکی هەمیشە دەستپێشخەر بوە لە دژایەتیکردنی ئەو یاسا ئازادیخوازانەی دەوڵەت پێشنیاری کردوون. تەنانەت گەر ئەو دژایەتیکردنەش بەهێزی چەکداری بووبێت، وەک ئەوەی لە شەڕی ناوخۆی ئەمریکا لە نێوان باکورو باشوردا ڕوویدا، دوای دەرچوونی یاسای نەهێشتنی کۆیلایەتی. ئەو یاسایەی حکومەتەکەی "ئەبراهام لنکۆلن" لە ساڵی *1862* بڕیاری لەسەر دا.

تا ئەمڕۆکەش ئەو ڕێوشوێنە یاساییانەی حکومەتەکەی "جۆرج کەنەدی" دایناون بۆ نەهێشتنی دیاردەی ڕەگەزپەرستی لە خوێندنگەو چێشتخانەو سەرجەم شوێنە گشتیەکان، لە لایەن بەشێکی زۆری ئەمریکاییەکانەوە "*WASP*" واتە ئەوانەی دەیانەوێت ولاتە یەککگرتوەکان بە ولاتێکی سپی پێستو پرۆتستانتیو ئەنگلۆسەکسۆنی بمێنێتەوە، دژایەتی دەکرێتو سەرپێچی لێدەکەن.

ڕەنگە لێرەدا بوترێت مەسەلەی ڕەشپێستەکان لە ئەمریکا شتێکی تایبەتەو، بە تەنها بەس نیە بۆ ئەوەی بکرێتە پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی سروشتی پەیوەندیەکانی نێوان کۆمەڵگەی مەدەنیو کۆمەڵگەی سیاسیی نەتەوەیەکی وەک ئەمریکا کە خاوەن تەقلیدێکی دیموکراسی لە مێژینەیە.

کەواتە با بە پێودانگێکی دیکە بکەوینە هەڵسەنگاندن و باس لە بزاوتێک بکەین کە "بییار لیبیناس"ی مامۆستای شارستانیەتی ئەمریکی لە زانکۆی پارسیی دەیەم بە /بزاوتی میلیشیاکان/ ناوی دەبات.

وەک دەزانرێت قۆرغکردنی توندوتیژی بە شێوەیەکی شەرعی (ماکس ڤیبەر زیاتر پێی لەسەر ئەم مەسەلەیە دادەگرت) بریتیە لە یەکەمین خەسڵەتی دەوڵەتی مۆدێرن، بەلام کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریکی بەردەوام تا ئەمڕۆ لەبەر هۆکارگەلێکی مێژوویی (کە لێرەدا ناکرێت بچینە ناو وردەکاریەکانیەوە) ئامادەنین چەکەکانیان فڕێبدەن، سەرەڕای ئەوەی دەوڵەت ڕێگەی چەکهەلگرتنی نەگرتوە، بەلام کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریکی لە ئەرکێکی گرنگی دیکەدا کێبەرکێ لەگەڵ دەوڵەتدا دەکات، ئەو ئەرکەش بواری ڕێکخستنی سەربازییە. ئەمڕۆ لە ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکادا لە پاڵ سوپای نیزامی سەر بە حکومەتی فیدراڵیو هێزەکانی ئاسایشو پۆلیسی سەر بە حکومەتی ویلایەتەکان، میلیشای مەدەنیش هەن کە ڕێ بە خۆیان دەدەن بەرگی سەربازی بپۆشنو مەشق بکەنو ببنە خاوەنی چەکی قورسو لە سەربازگەکانیشدا بژین.

بۆ نمونە گەورەترین کاری ترۆرستی بە درێژایی مێژووی ئەمریکادا بێت ئەو ڕووداوە بوو کە لە *19*/ نیسانی/ *1995* لە ولایەتی (ئۆکلاهۆما) ڕوویداو، بوە هۆی کوژرانی *171* کەسو زیاتر لە *500* برینداریشی لێکەوتەوە. بەبێ تێگەیشتن لە دیاردەی میلیشیاکان لە کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریکیدا، ئەستەمە بتوانین لەو ڕووداوە تێبگەین. ئەو دوو کەسەی هەستان بە تەقاندنەوەی ئەو سەیارە بارهەلگرە لە بەردەم تەلاری حکومەتی فیدراڵی ولایەتی (ئۆکلاهۆما)، مەبەستیان تۆڵەکردنەوەی خوێنی شەهیدانی میلیشیای "داودیەکان" بوو، کە لە ڕۆژی *19*/نیسانی/ *1993* بە بۆمبی فرمێسک ڕێژو گوللەی پیاوانی ئاسایشی فیدراڵی کوژرانو سوتێنران.

"داودیەکان"؟ ئەم ناوە لە ناوی خواستراوی دامەزرێنەری بزوتنەوەکە "داود قۆرش" وەرگیراوەو خەسڵەتێکی تەوراتیانەی هەیە. تەورات ڕەگەزێکی سەرەکی پرۆتستانیەتی ئەمریکییە، تا ئێستاش سێ لەسەر چواری شوێنکەوتوانی ئەو بزوتنەوەیە (کە نیوەی ئەمریکییەکان پێکدێنن) لەو بڕوایەدان کە تەمەنی مرۆڤایەتی تەواو وەك ئەوەی تەورات باسیدەکات لە شەش هەزار ساڵێك تێناپەڕێت.

ئاین ڕەگەزێکی سەرەکی تەواوی میلیشیاکانی ئەمریکایە، خاڵی هاوبەشی نێوانیان بریتییە لە:

-تەفسیرکردنی حەرفی تەوراتو ئینجیل.

-بڕوابوون بەوەی پلانێکی نێودەوڵەتی نەك تەنها لە دژی ئەمریکا، بەڵکو لە دژی تەواوی گەردوون لە ئارەدایە.

حکومەتە فیدرالیەکانی ئەمریکاش دەستیان لەگەڵ نەخشە داڕێژەرانی ئەو پلانەدا تێکەڵکردوە، چونکە حکومەتە فیدراڵیەکانی ئەمریکا بە فەرمانی ڕێکخراوە نهێنییە جیهانیەکان (کە کۆمۆنیستەکانو جولەکە دەستیان بەسەردا گرتوە) دەجوولێنەوە.

میلیشیاکانی ئەمریکا کە زۆربەیان سەر بە ڕاستڕەوە توندڕەوەکانن‌و (هەندێکیشیان بە تایبەت لەناو ڕەشپێستەکاندا سەر بە چەپی توندڕەوەن)، سڵ لەوە ناکەن بە ئاشکرا باس لە ئایدیۆلۆژیای ڕەگەزپەرستانەو تەنانەت نازیزمانەی خۆیان بکەن.

بۆ نمونە ڕێکخراوی /نەتەوە ئازادەکان/ دروشمەکەی /صليب المعقوف/و خاڵی یەکەمی بەرنامەکەیان بریتییە لە پاککردنەوەی ئەمریکای سپی پێست لە یەهودیو ڕەش پێستەکان، ڕێکخراوێکی تری وەك *کڵێسای ئاسنامە* جیاوازیەکی زۆر دەکات لە نێوان جولەکە سەروەرەکانی نەوەی هابیل (کە دواتر بوونەتە مەسیحی) لەگەڵ جولەکە بەدەکانی نەوەی قابیلو وەچەی شەیتان، ئەمانە بەردەوام پلان لە جیهان دەگێڕنو ژمارەشیان تا دێت لە زیادبووندایە، لەبەرئەوەی تێکەڵ بە ڕەگەزە ئاست نزمو ڕەش پێستەکان دەبن.

بە بڕوای ئەمان ئەمریکا لە نیاز خراپیو ئاژاوەگێڕی ئەمانە ڕزگاری نابێت گەر ئەمانە نەنێررێنەوە بۆ ئەو جێگایەی لێیەوە هاتوون: واتە فەلەستین یان وڵاتی سامرەو یەهودی بە چەمکە تەوراتیەکەی.

بێگومان مەترسی میلیشیاکان هەر بە تەنها لە ئایدۆلۆژیاکەیاندا نیە، بەڵکو بەر لە هەر شتێ لە جموجوڵی عەمەلییاندایە. پێشتر باسمان لەوە کرد کە میلیشیا (داودیەکان) لە تەکساس مۆڵگەیەکی تایبەتی بەخۆیان دروستکردوەو چەکی ئۆتۆماتیکیو بۆمباو دۆشکەشیان تیا کۆکردۆتەوە. هێزەکانی ئاسایشی فیدراڵی دوای گەمارۆیەکی بیست ڕۆژی نەبێت نەیانتوانی بچنە ناوی. سەرەنجامی ئەم هەڵمەتەش کوژرانی *58* کەسی لێکەوتەوە، لەوانە چوار کەسیان سەر بە هێزەکانی ئاسایش بوون. میلیشیایەکی تر بەناوی (الاخوة الصامتة)وەیە کە کاریان پەلاماردانی بانکەکانە، بە مەبەستی کۆکردنەوەی پارەی پێویست بۆ کڕینی چەكو چۆڵی سەربازی.

هاوکات میلیشیای (نەتەوە ئازادەکان) دەستیاندایە تەقاندنەوەی ژمارەیەك داموو دەزگای گشتی، لەگەڵ تیرۆرکردنی چەند دادوەرێکی فیدراڵیو کارمەندانی خەزێنەی گشتی.

هەرچەندە میلیشیا مەدەنیەکان یاخود میللیەکان بە درێژایی مێژووی وڵاتە یەکگرتوەکان لە ئارەدا بوون، بەڵام تەنها لە ساڵی *1983* مەترسیان گەیشتە ئەوپەڕی. ئەویش دوای ئەوەی حکومەتەکەی "ڕۆناڵد ڕیگان" یاسای /برادی/ دەرکرد، دەرکردنی ئەو یاسایەش بۆ ئەوە بوو ئاستێك بۆ بڵاوبوونەوەی چەك

لەناو خەڵكانی مەدەنیدا دابنرێت، بە تایبەت دوای ئەو هەوڵی تیرۆركردنەی ڕووبەڕووی "ریگان" بوەوە.

لەگەڵ دەرچوونی ئەو یاسایەدا بزووتنەوەیەكی نارەزایی میللی بەرفراوان دروستبوو كە ڕاستڕەوە توندڕەوەكان و ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانی سەر بە حیزبی كۆماری لە پشتیەوە بوون. ئەم بزووتنەوەیە حكومەتی فیدراڵی بەوە تاوانبار كرد كە ئەو مافە بە هاوڵاتیان نادات تا بتوانن بەرگری لە خۆیان بكەن و داوایكرد لە هەر ولایەتێكدا بە جیا میلیشیای لۆكاڵی دروست بكرێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حكومەتی فیدراڵی، چونكە ئەو حكومەتە دەیەوێت وڵاتە یەكگرتووەكان ملكەچی دەسەڵاتێكی تۆتالیتاری نوێ بكات، ئەویش لە ژێر ناوی /سیستمی نوێی جیهانی/دا. یەكەمین میلیشیا بۆ هاوڵاتیان لە شاری *مۆنتانا* دروستبوو، كە ژمارەی ئەندامەكانی خۆی لە حەوت هەزار كەس دەدا. دوەمیان لە شاری مەشیگان بوو، ژمارەی ئەندامەكانی شەش هەزار كەس بوون. دواتر ڕێپێوانی خۆپیشاندان ولایەتەكانی تەكساس، نیوجێرسی و ئیداهۆ و سەرجەم ولایەتەكانی كەناری باشووری گرتەوە. هەر هەموویشیان لە ژێر یەك دروشمدا كۆبوونەوە: (ئەمریكا لە بەردەم هەڕەشەدایە).

هەرچەندە ئامارێكی وردو تەواو لەسەر ژمارەی ئەو میلیشیایانەو ژمارەی ئەندامەكانیان لە بەردەستدا نییە، بەلام ئەو بزووتنەوەیە توانی (وەك پاڵپشتی) پێنج ملیۆن و نیو ئیمزا لە دژی یاساكانی حكومەتی فیدراڵی كۆبكاتەوە، ئەو یاسایانەی دەیانویست چەك لە هاوڵاتیانی ئەمریكا داماڵن.

ئەلبەتە میلیشیا میللییەكان تەواوی كۆمەڵگەی مەدەنی ئەمریكی لە خۆیاندا كۆناكەنەوە، چونكە ئەم كۆمەڵگەیە هەر بە دەوڵەمەندترین كۆمەڵگە مەدەنییەكانی جیهان دەژمێردرێت لە ڕووی هەمەجۆریی و فرەڕەنگی لە دنیای تازەدا. لەگەڵ ئەوەشدا دیاردەی میلیشیا بە یەكێك لە خەسڵەتە سەرەكییەكانی ئەو كۆمەڵگەیە دادەنرێت.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە كۆمەڵگەی مەدەنی بە تەنها پەناگەی خێرو چاكە نییە، وەكو هەندێك ئەدەبیات باسی دەكەن و دەیانەوێت بیكەنە ناوەندێكی میسالی، لە بەرامبەریشدا دەوڵەت وەك ئەهریمەنێك وێنا دەكەن، چونكە دواجار دەبێت كۆمەڵگەی مەدەنی و كۆمەڵگەی سیاسی وەك دوو ڕووی یەك دراو سەیر بكەین. مشتومڕی نێوان ئەم دوانەش (نەك بێدەنگی یەكێكیان لە بەرامبەر ئەوی تریاندا) دەستنیشانی ئاستی گەشەسەندن و بەرەو پێشچوونی پرۆسەی دیموكراسی نەتەوەیەك لە نەتەوەكانی دەكات.

### سەرچاوە

ڕۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە (*13357*)، بەرواری (*1999/10/3*).

# گەشتی شاعیرێك بۆ خۆرهەڵات و

## هەڵهاتنی ڕۆماننووسێ بەرەو جیهانی منداڵێتی

■ نووسینی: حەسونە میسباحی

● و. لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

شوێنی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕۆمانی ئەو بیستانچییەی کە ماندوو نابێ‌ی نووسەری بەریتانی جۆن لۆکاریێ ولاتی کینیای ئەفریقیایە، پێدەچێ ئەم ڕۆمانە هێرش و پەلامارێك بێ بۆ سەر ڕژێمی سەرۆك دانیال ئاراب مۆی سەرۆکی ئەو ولاتە. ئەم ڕۆمانە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوەو لەلایەن خوێنەرانی ولاتەوە پێشوازییەکی باشی لێکراوەو ئێستا بە نهێنی دەست و دەست دەکات.

ئەگەرچی دەزگای سانسۆرو چاودێریی ڕەسمی تا ئێستاش ڕێگای نەگرتووە لە فرۆشتن و پروپاگەندە کردن بۆ کتێبەکە، خاوەن کتێبخانەیەك لە نایرۆبی پایتەخت وتی: (ڕۆمانی ئەو بیستانچییەی کە ماندوو نابێ، قەدەغە نیە، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتداران پێتی بگرن، ڕەنگە لەپای ئەوەدا سزایەکی توند بدرێت). ژۆرنالیستێکی کینیایش وتی: (هەندێ لە خاوەن کتێبخانەکان ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ دەسەڵاتداراندا دەکەن هەربۆیە فرۆشتن و دابەشکردنی ئەو نووسین و کتێبانە لە چەشنی ڕۆمانەکەی جۆن لۆکاریێ ڕەت دەکەنەوە کە ڕەخنە لە ڕژێمی فەرمانڕەوا ئەگرێ).

ئەو کارەکتەرەی کە لە ڕۆمانەکەدا ئاراب مۆی بەرجەستە دەکات، توندو تیژو دڵڕەقانە مامەڵە لەگەڵ ئاژاوەگێڕیدا دەکات و، بێ دەربەستیی و خەمساردییەکی نیمچە تەواویش لە ئاست گرفت و کێشە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی ولات و لە بەرامبەر نەخۆشی

(ئایدن)دا دەرئەبڕێ کە ساڵانە ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتییەکانی دەکوژرێت. لە ڕۆمانەکەدا کەسانێکی دەرکەوتوو هەن پارەوپول و سەرمایە ڕەوانەی بانکە بیانییەکان دەکەن و خەریکی کاری گەندەڵیی و بەرتیلن، دەسەڵاتی خۆیان بۆ ئامانجی دەستخستنی سەروەت و سامان و دەستکەوت بەکاردەهێنن. تەنانەت ئەو داودەرمان و پارمەتیە مرۆییانەش ئەدزن کە دەوڵەتانی دەوڵەمەند پێشکەش بە هەژارو برسیەکانی دەکەن.

کەسانی نزیک لە سەرۆکیش، بەرهەڵستکاران دەکوژن و دەستدرێژی دەکەنە سەر کیژە جوانەکان و، ڕۆژانە سەرپێچی دەکەن و بەم کارو کردەوەیەشیان سنووری یاساو ڕژێم ئەبەزێنن. لەبەرئەوەیش کە کچە ژۆرنالیست "تاساکابێل" ویستی نهێنیەکانی مەسەلەیەکی گەندەڵیی ئاشکرا بکات، دەکوژرێت و لاشەکەیشی لە بیاباندا فڕێ ئەدرێت. لە پێشەکی ڕۆمانەکەشدا (جۆن لۆکارێ) نووسیویەو ئەڵێ: (ئەفسوس دەبووایە لە ترسی گیانیان چاوپۆشیم بکردایەو ناوی ئەو کەسانەم نەبردایە کە بۆ نووسینی ڕۆمانەکەم یارمەتی زۆریان دام). جۆن لۆکارێ لە پێشەکیەکەدا باس لەوە دەکات کە مژدەبەری ئەمریکی جۆن کایزار کە سەرزەنشتی ستەمکارییەکانی نێو کینیای کردو گەندەڵیی فەرمانڕەوایانی ئاشکرا کرد، بەتایبەت گەندەڵیی ئاراب مۆی سەرۆکی کینیا، هاوینی ساڵی ڕابوردوو لە ئەنجامی تەقە لێکردن و پێکرانی سەری بە گوللەیەک گیانی لەدەستدا. تا ئێستاش پۆلیسی کینیا دەستی ڕانەگەیشتووە بە دۆزینەوەو ئاشکراکردنی ئەنجامدەرانی ئەم تاوانە چەپەڵە.

## درۆی کۆمۆنیستیی

مینۆز مۆلینا کە ساڵی *1956* لە ئەندەلوس لەدایکبووە، هەنوکە بە یەکێک لە هەڵکەوتوترین ڕۆماننووسە نوێیەکانی ئیسپانیا دادەنرێت. ناوبراو لە ڕۆمانە تازەکەیدا میگاراد پشت بە چەند گەواهیدەرێکی واقیعی دەبەستێ بۆ ئەوەی شیکارێکی قووڵ سەبارەت بە ناسنامەو تاراوگا پێشکەش بکات. مۆلینا لەبارەی ئەم ڕۆمانەیەوە ئەدوێ و دەڵێ: (خۆم دایە دەست غەریزەو جڵەوم شلکرد، کە دەستمکردە نوسین نەمدەزانی بەرەو کوێ دەڕۆم. بەڵام چیرۆکی مەنفاییەکان تەواو سەرنجی ڕاکێشام، ساڵانێکی دوورو درێژی ژیانیشم، کە تا ڕادەیەک نیوەی تەمەنم دەگرێتەوە، بەدوای ئەو بەڵگەنامانەدا گەڕاوم کە بۆ ئەم ڕۆمانە پێویست بوو، ئەگەرچی لە بیرەوەریشمدا تەواو ڕوون نەبوو). مۆلینا بڕوای وایە کە ئەدەبی ڕاستەقینە لەو پەیوەندیە توندوتۆڵەدایە کە نووسەر بە جیهانی دەرەوەوە دەیبەستێتەوە. بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەی دەڵێت: (پێویستە کایەی ئەدەب فراوان بکەین. ئێمە وا ڕاهاتووین کە ئەدەب بە خەیاڵەوە گرێبدەین، بەڵام ئەکرێ ئەدەب شتێکی دیکە بێ، چونکە دەشێت خەیاڵ خۆی لەنێو چەند هێمایەکدا بەند بکات کە ببێتە هۆی ماندووبوونمان). مۆلینا دان بەوەدا ئەنێت کە کارکردن لەسەر واقیع کارێکی هەروا ئاسان نییە، وەک هەندێک کەس پێیان وایە. هەروەها دەڵێت: (ڕۆمانەکەم بەتەنها دەربارەی جولەکەکان نیە، بەڵکو هەوڵئەدات تێڕوانینێک سەبارەت بە چەپ لە ئیسپانیاو دەربارەی کەسێک بدات کە دواجارو لە کۆتاییدا ئەگاتە دۆزینەوەی درۆی کۆمۆنیستی).

## دەقە ئەسڵیەکەی ڕۆمانی:
### (دانیشتنێک تا کۆتایی شەو)

پیاوێکی فەرەنسی بە تەمەنو پسپۆڕ لە کۆکردنەوەی

دەستنوسەکاندا، دەقی ئەسڵیی ڕۆمانی **دانیشتنێك تا کۆتایی شەو** ی بە دەستخەتی **لوی فردیناند سیلین**ی دانەری دۆزییەوە. ئەم ڕۆمانە لە پاڵ (ئۆلیسیس)ی **جێمس جۆیس** و (گەڕان بەدوای زەمەنی ونبوو)ی **مارسێل بروست** دا بە یەکێك لە مەزنترین ڕۆمانەکانی سەدەی بیستەم دائەنرێت.

سیلین ئەم ڕۆمانەی لەنێوان ساڵانی *1929* و *1931*دا نووسیوەو لە ساڵی *1932*دا بلاویۆتەوە، بەڵام وەك پێشبینی ئەکرا، خەڵاتی **کۆنگۆری** بەدەست نەهێنا، ئیدی سیلین بێئەوەی هیچ گوشارێکی ماددی پاڵی پێوە بنێ، لە *29*ی مایۆ (ئایار)ی *1943* دەستنووسی ڕۆمانەکەی خۆی فرۆشت بە تابلۆ فرۆشێك بەناوی **ڤیتیان بیێنو**، بۆ ماوەی ساڵێك **بیار بیرسیس** کە خاوەن زانیاریەکی بەرفراوانە دەربارەی دەستنووسە کۆنەکان، بەدوای کۆپی ونبووی ڕۆمانی **دانیشتنێك تا کۆتایی شەو** دا دەگەڕا بەڵام بێسود بوو. پێش ماوەیەکی کەم یەکێك لە کۆنە کتێب فرۆشەکان پەیوەندی پێوە دەکات و پێی ڕادەگەیەنێ کە کۆپی ڕاستەقینەی ڕۆمانەکەی سیلین لەلایە، ئیدی ئەویش دەسبەجێ بە مەبەستی چاوپێکەوتن ئەچێتە سەردانی.

پاش ئەوەی لەوە دڵنیابۆوە کە بۆ دواجار ئەو گەنجینەیەی دۆزییەوە کە ماوەیەکی دوورودرێژ سەرقاڵی خەریکی کردبوو، **بیار بیرسیس** کە ئێستا تەمەنی (*87*) ساڵە وتی: (من وەك پسپۆڕێك لە بواری دەستنووسە کۆنەکاندا، ئەم ڕووداوە خۆشترین بەسەرهاتە کە لە ژیانمدا بەخۆمەوە بینیومە).

پێشبینی ئەکرێ دەستنووسەکە بە بڕی *4* یان *5* ملیۆن فەرەنکی فەرەنسی بفرۆشرێ، ئەوجا ئەگەر **ماوسەرەکەی سیلین** کە تا ئێستایش لە ژیاندا ماوە، قایل بێ و ڕێگری نەکات ئەوا ئەم دەستنووسە بەم نزیکانە چاپ و بلاودەکرێتەوەو ڕۆشنایی ئەخاتە سەر ژیانی ئەم نووسەرە کە لە ژیانیدا جوێنی بە جولەکە داو، پشتگیری هیتلەری کردو، لە کۆتایی دووەمین جەنگی جیهانیشدا بەهۆی لایەنگریی نازیستەکانەوە دادگایی کرا.

## *لۆران جاسباری عاشقی خۆرهەڵات*

**شاعیرێکی گەورەی فەرەنسی** بە نەژاد هەنگاری کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن وەك پزیشك لە فەلەستین و دواتر لە تونس کاریکردووەو، ئێستا لەنێوان پاریس و سیدی بو سەعیددا دەژی کە گەڕەکێکی دڵڕفێنی تونسەو، وەك شاعیر خۆی حەزدەکا بڵێ (نیوەی تەمەنی) لەم گەڕەکەدا بەسەربردووە.

**لۆران جاسبار** ساڵی *1925* لە ناوچەی ترانسیلڤانیای خۆرهەڵات لەدایکبووە، کە دەکەوێتە نێوان دەریاو وڵاتی ڕۆمانیاوە، باوکی ئەرمینییە. لۆران لە تەمەنی منداڵێتیدا شەیداو عاشقی ئەو ڕووبارە بوو کە بە نزیك گوندەکەیاندا تێپەڕی ئەکرد. لە ماڵەوە خانەوادەکەیان بە زمانی هەنگاری و ڕۆمانی و ئەڵمانی دەدوان، باوکی سووربوو لەسەرئەوەی زمانی فەرەنسی فێری کوڕەکەی بکات. بە یاریدەی ئەو زمانەش، لۆران جاسبار هەر لە کاتێکی زووەوە شیعری فەرەنسی شاعیران رامبۆو بۆدلێرو ئەلفۆنس ڕۆدێی خاوەن **پایەمەکانی کامۆنتی**ی خوێندەوە. لە کاتی هەڵگیرسانی دووەمین جەنگی جیهاندا پەیوەندی کرد بە سوپای هەنگاریاوە، ئەمە دوای ئەوەی بڕوانامەی بەکالۆریۆس وەرئەگرێ و ڕەوانەی بەرەی ڕووسیا دەکرێت. ساڵی *1944* لە یەکێك لە سەربازگەکانی کارکردن لە ئەڵمانیا خۆی ئەبینێتەوە. لەو ماوەیەشدا ئەڵمانەکان حوکمێکی نازیستانەیان سەپاندبوو بەسەر



هەنگاریاداو ئەم وڵاتەیان وەکی پردێك بە ئاراستەی ڕووسیادا بەکاردەهێنا. بەلام ئەم لاوە ڕۆمانسیە، ئەم شەیدای شیعرە، توانی لە سەربازگە ئەلمانیەکە هەڵبێ و، پاش ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژی بەنێو جەنگەڵو هەردو چیاکاندا بڕی، لەسەر سنوری ئەڵمانیا-سویسرا توشی هێزی هاوپەیمانان بوو. ئیدی بە یاریدەی زمانی فەرەنسی توانی بچێتە نێو فەرەنساو بگاتە پاریس. لەبەرئەوەی لۆران بیستبووی کە باوکی بەهۆی ئەو زوڵم و ستەمەوە خۆی کوشتووە کە سوپای سوری ڕووس سەپاندویەتی بەسەر دانیشتوانی ناوچەکەیاندا، ئیدی بڕیاری نەگەڕانەوە ئەدات.

**لۆران جاسبار** لە پاریس پزیشکیی دەخوێنێ و، بۆ پەیداکردنی بژێوی و خەرجیەکانی خوێندنەکەشی، لە ئوتێلێکی بچوکدا بە شەو پاسەوانی دەکات‌و، لە بازاڕە گشتیەکانیشدا کاری خزمەتکردن و حەماڵیی دەکات. سەرەتا چەند تێکست و هۆنراوەیەکی بە زمانی هەنگاری نووسی، بەلام دەسبەجێ وازی لە نووسین بەو زمانە هێناو زمانی فەرەنسی هەڵبژارد: (لێم ڕوون بوو کە ئیدی من لە پاریس دەژیم و جارێکی دی هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ نیشتمان. جگە لەوە من ژنێکی فەرەنسیم کردبووە هاوسەر بۆ خۆم، لەبەرئەوە نەمدەتوانی لەسەر نووسین بە زمانی دایك بەردەوام بم. بەم چەشنە زمانی فەرەنسیم هەڵبژاردو لەوەتەی هاتنم بۆ فەرەنساش ئەو زمانە بووە زمانی ڕۆژانەو زمانی مەنفای من). دوای ئەوەی وەك پزیشکێکی نەشتەرگەر زانکۆی تەواوکرد، **لۆران جاسبار** لە خەستەخانەکانی قودس و ئەریحاو بەیت لەحم و چەند شارێکی دیکەی فەلەستینیدا بە دکتۆر دامەزرێنرا، بەمەش ئەو خەونە دێرینەی بەدیهێنا کە خولیایەکی هەمیشەیی ئەو بوو، خەونی ئاشنابوون بە خۆرهەڵات و شارستانیەتی لە مێژینی خۆرهەڵات. ئەم کارەش یاریدەی **لۆرانی** دا کە لە نزیکەوە بە کەسانی سادەو ساکار تێکەڵاو ببێ، بەتایبەت کۆچەرەکان ئەوانەی کە دواتر جوانترین تێکست و قەسیدەی لە بارەیانەوە نووسی. هاوکات ئاشنای بارودۆخی پەناهەندە فەلەستینیەکان بوو، ئەوانەی کە دوابەدوای شەڕی *1948* خاك و زەوییەکانیان لەکیس چوو بوو، **لۆران** لە بارەیانەوە ئەڵێ: (پەناهەندە فەلەستینیەکان لە ئەریحا، خەڵکانێکی باش بوون و هیچ ناحەزیی و دوژمنایەتیەکیان بەرامبەر کەسانی دیکە نەبوو. سکالانامەیان دەنووسی و ڕەوانەی نەتەوە یەککگرتووەکانیان دەکردو داوای مافەکانی خۆیانیان دەکرد. من *15* ساڵم لەو ناوچەیەدا بەسەربرد، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەشدا دووچاری هیچ جۆرە گێرمەو کێشەو ڕکەبەرایەتیەك نەبووم لەلایەن دانیشتوانی خێوەتگاکانەوە. لە ئیسرائیلیشدا کەسانێك هەبوون بڕوایان وابوو کە تەنها چارەسەرێك پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی نێوان جولەکەو عەرەبەکانە. من بۆیە وا ئەڵێم چونکە لە ئێستادا ڕەوشەکە تەواو لە بارودۆخی ئەو ڕۆژگارو سەردەمە جیاوازە، پێدەچێ هەنوکە ئاشتی نێوان فەلەستینیەکان و ئیسرائیلیەکان ئێجگار سەخت و دژوار بێ، دیارە ئەمەش بەهۆی ئەو ڕکەبەرایەتیانەوەیە کە بەهۆی شەڕو ئاشوبی بەردەوامەوە لە نێوان هەردوو میللەتدا کەڵەکە بووە). سەبارەت بە تێگەیشتنیشی لە شیعر **لۆران جاسبار** ئەڵێ: (تەنیا شتێك کە ئەشێ لەلای من ببێت بە شیعر، ئەو شتەیە کە تیایدا ژیاوم، ئەوەی پرسیارم لێدەکاو، ئەوەی کە بەرەو شتێکم دەبات وەکی

بیابان ناتوانرێ کۆتاییەکەی دەستنیشان بکرێت. لەلایەکی دیکەوە ئەوەی کە بەلای منەوە گرنگە، ئەوەیە کە بتوانم ڕێچمە کەشفکردنی ئەزموونەکانم و دۆزینەوەی چەند فۆرمێك بۆ ئەو ئەزموونانە، بە جۆرێك کە دووریی لەوەی کە ئەزمون و تاقیکردنەوە زانستیەکان پیشانمی دەدەن. من خاوەنی ئەقڵێکی زانستیم وەختێك کە شیعر دەنووسم ئەو ئەقڵە بێدەنگ دەبێ). دەربارەی جیهانی شیعریی لۆران جاسبار، تاهیر بن جەللون نووسیویەو دەڵێ: (قەناعەتێك لە ئارادا هەیە نووسینەکانی تێدەپەڕێنێ: فیزیاو میتافیزیك یەك بە یەکدیەوە بەستراون و هەرگیز لە یەکتر جودانابنەوە. بەردەوامێتیەکی سروشتیی لە ئارادا هەیە، بەڵام هەمیشە لەنێوان کەرەستەو هزر (ئەم بەشە کۆچەرەی ڕۆح)دا دیار نییە. شیعریش ئەو بایەیە کە لەنێو وشەو بزاوتەکان و لەنێو پێست و بەردا هەڵدەکات).

تاهیر بن جەللون دەربارەی جیهانی شیعریی **لۆران جاسبار** لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (لۆران جاسبار کانەکانی مادە، زەوی و خاك و بەردو مرۆڤ ناپشکنێ، بیابان هەر مەتەڵێکە بۆ خۆی).

## *(ترامواى) کلۆد سیمۆن*

وێڕای ئەوەی تەمەنی نەوەد ساڵی تێپەڕاندووە. (ساڵی *1913* لەدایکبووە) تا ئێستایش ڕۆماننووسی گەورەی فەرەنسی **کلۆد سیمۆن** کە لە ساڵی *1985*دا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی پێبەخشرا، لەسەر نووسین و بەخشش بەردەوامەو بەرەنگاری پیریی و نەخۆشی دەبێتەوە. پێدەچێ هەموو ڕۆمانەکانیشی گەشتوگوزارێك بن بەنێو یادەوەریو ڕێگا ئاڵۆزو فرە لقەکانی یادەوەریدا. ڕۆمانە تازەکەیشی **تراموای** هیچ جیاوازیەکی نییە لە ڕۆمانەکانی پێشوتری، چونکە ئەمیشیان گەشتێکە بە یادەوەریی نووسەردا کە پەیتاپەیتا لە مردن نزیك دەبێتەوە. ئێستا ئێمە لە هۆدەی خەستەخانەیەکداین، کابرایەکی بە ساڵاچووی ماندوو لەسەر قەرەوێڵەیەك ڕاکشاوە، تا دەیلەرزێنێو نەخۆشیش ئەشکەنجەی ئەدات، هێدی هێدی وەك چۆن کازیوە دڕ بە شەوەزەنگ ئەدات، ئا بەو جۆرە نەخۆشەکە بەناو ژیانی کۆن و ڕابوردووی خۆیدا دەگەڕێو تەمومژی کەڵەکەبووی سەر بەسەرهات و ڕووداو و وێنەکانی لادەبات. ئەوەتا وەکی منداڵێك خۆی دێتە بەرچاو کە سواری ترامواى دەبێت و ترامواکەش بۆ ماوەی *15* کیلۆمەتر گەشت بە گەشتیارەکانی دەکات. **کلۆد سیمۆن** لەسەر شتە وردەکان و، ڕەنگەکان و، سیماو ڕوخسارو، جوڵەی گەشتیارەکان ڕادەوەستێ، وەکی کامێرایەکی سینەمایی بە وردیی وەسفیان دەکات. **کلۆد سیمۆن** وەك نەریتێکی هەمیشەییشی بە ئاگایە لەوەی کە ئەبێ زمان پاڵەوانی سەرەکی بێت. هەربۆیە هەموو وشەیەك بە وریاییەوە هەڵدەبژێرێ، بەم پێیە هەموو برگەیەك لە برگەکانی ڕۆمانەکە ئاوازێکی تایبەتی هەیەو ڕۆمانەکەش ئەڵێی سیمفۆنیایەکە، هەروەك لەم برگەیەدا: (وەك بڵێی شتێکی پتر لە هاوین ناخوازێ لە خامۆشیی تاسێنەرو خنکێنەری هەوادا دەست لە گیانکێشان هەڵبگرێ، وەختێ ئەو پەردە ڕەهایە دەکەوێتە خوارەوە کە هیچ شنەو سروەیەك ناتوانێ بیکاتە دەرەوە، ئەوەتانێ هێدی هێدی ماندوو ئەبێ و بەردەبێتەوە، لەگەڵ خۆیشیدا گوڵە چڕەکان و، ئەو گژوگیایانەی کە خۆر بردوونی یاخود گوڵە سۆسەنی ژاکاو و ئەو مەلەوانگەیە دادەپۆشێ کە لەژێر تۆپەڵێك خۆڵەمێشی ئێجگار ورددا بۆگەنی کردووە).

***سەرچاوە***

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، لە ئەنتەرنێتەوە.

# ئایا سەردەمی بانگەواز بەسەرچوو؟!

■ خوێندنەوەی: شاهۆ سەعید

**ناوی کتێب: کۆتایی بانگەوازچی**

**ناوی نووسەر: عبدالاله بەلقەزیز**

**بڵاوکراوەی: المرکز الثقافی العربی**

**بیروت، ط1، 2000**

گوتاری (بانگەواز - الدعوة) گوتارێکی باڵادەستی کولتووری خۆرهەڵاتییە بە گشتی و کولتووری عەرەبی بە تایبەتی. ڕەنگە قسەکردن لە بانگەواز دەسبەجێ سەرنجمان بۆ مانا ئاینییەکەی ئەو وشەیە ڕاکێشێ، بەتایبەتی بانگەواز شێوازێك بووە لە شێوازەکانی خەباتی نهێنی و دواتر خەباتی ئاشکرا لە سەردەمی دەعوەی موحەمەدیدا. لە سەردەمی تازەشدا (دعوە) دیارترین چەکی بڵاوبوونەوەی فەندەمەنتالیزمی ئیسلامییەو لە ئەدەبیات و بڵاوکراوەکانیاندا جەختێکی تایبەتی لەسەر دەکرێ.




بەڵام دوور لەم مەدلولە ئاینییە، نوسەرێکی هاوچەرخی عەرەب پێی وایە کە (بانگەواز نەك هەر لە ڕابردوودا، بەڵکو لە ئێستاشدا ئالیەتێکی سەرەکی کولتووری عەرەبییەو بەشی زۆری گوتارە فیکرییەکانی ئەو کولتورە زادەی بانگەوازچییەکانە، نەك توێژەرە بێدەنگ و گۆشەگیرەکان)، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەو ڕێکەوتنە پەنهانەی نێوان ئێستاو ڕابردووە کە ڕۆشنبیرەکان ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە چەسپاندنیدا.

بانگەوازی ئاینیی لەو شوێنەوە دەستپێدەکات کە کەسی بانگەوازچی مژدەی چنگکەوتنی حەقیقەت بۆ کەسانێك بەیان دەکات کە حەقیقەتیان ونکردووە. هەرچی بانگەوازی ڕۆشنبیریشە هەڵگری هەمان گوتارە، بەڵام لەبری مژدەی حەقیقەتێکی ئاسمانی مژدەی حەقیقەتێکی سەرزەمینی دەدا بەگوێی خەڵکیدا

که هەندێ جار ناوی پێشکەوتن و ڕۆشنگەرییەو هەندێ جاریش ناوی ڕێنسانس و دیموکراسی و سۆسیالیزمە، هەندێ جاری دیکەش ناوی دادپەروەری و ناسیونالیزم و سەروەری نیشتمانی لێدەنرێ.

هاوکێشەی بانگەوازکردن هەمیشە پێویستیی بە دوو لایەن هەیە: بانگەوازچی و بانگەواز بۆکراو، هەرچی بانگەوازچییە هەولدەدا زۆرترین دلنیایی لای کەسی بانگەواز بۆکراو بچێنێ و کەمترین پرسیاری لا بوروژێنێ، هەموو نوشوستێکی بانگەوازچیش لە ڕازیکردنی زۆرترین ژمارەی بانگەواز بۆکراواندا بەکسانە بە نوشوست لە چنگکەوتنی حەقیقەتدا، واتە لە کولتووری بانگەوازدا حەقیقەت جەوهەرێك نییە لە خودی خۆیدا، بەلکو بە ڕێژەو ژمارەی ئەو کەسانە دەپێورێ کە گوێی لێدەگرن.

بە بڕوای عبدالاله بەلقەزیز هۆکاری هەلپەی زۆربەی ڕۆشنبیرەکانی ئەمڕۆی عەرەب بۆئەوەی ڕۆلی بانگەوازچی ببینن دەگەڕێتەوە بۆ دوێنێیەکی نزیك، بە دیاریکراوی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی برانەوەی جەنگی جیهانی یەکەم و دروستبوونی دەولەتە قوترییە عەرەبییەکان، ڕۆلێکیش بوو لەلایەن دەسەلاتی سیاسی تازە دامەزراوی ئەو دەولەتانەوە پشتیوانیی لێدەکرا، چونکە ڕۆشنبیری دوێنێ تەنها بانگەوازچییەك نەبوو لەپێناو جوانکردنی وێنەی خۆیدا، بەلکو ئامرازێکیش بوو بۆ ڕەوایەتی بەخشین بە دەسەلاتی سیاسی، دەسەلاتێك کە بەهۆی ڕوخانی خەلافەت و کۆتایی هاتنی ڕۆلی پیاوی ئاینی لە بانگەوازکردن بۆ دەسەلاتی ئاسمانی، پێویستی بە بانگەوازچییەك هەبوو کە ناوی (مەلا) نەبێت، بەلام هەمان ڕۆلی ئەو ببینێ لە شەرعیەت بەخشین بە دەسەلاتی سەرزەمینیدا. واتە ڕۆشنبیری بانگەوازچی ڕۆلی ئایدیۆلۆجیست و عەقلی دەولەتی پۆست کۆلۆنیالیزمی دەبینی، ئەم وەزیفەیەش پێگەیەکی بەرزی بە ڕۆشنبیر بەخشی لە پلەبەندیی کۆمەلایەتی ئەو سەردەمەدا، ئەو پلە کۆمەلایەتییە بەرزەش وێنەی ڕۆشنبیری وەك ڕاوێژکارێکی دەسەلاتی سیاسی دەردەخست.

ڕۆشنبیری دوێنێ ئیعترافی بەوە نەدەکرد کە ئەو بە پلەی یەکەم ڕۆلێکی سیاسی -ئایدیۆلۆجی- ئاینی دەبینێ نەك ڕۆلێکی مەعریفی-فیکری- ڕەخنەیی.

ڕۆشنبیری دوێنێ پەی بەو قەیرانە گەورەیەی خۆی نەدەبرد، یان ڕاستتر نەیدەویست پەی پێبەرێ، چونکە دەسەلاتی سیاسی هەمیشە پێویستی بە گوتاری بانگەوازی ئەو بوو. بەلام داخۆ ئەمڕۆ هاوکێشەکە چی بەسەرهاتووە؟!

ڕۆشنبیری ئەمڕۆ چیتر ناتوانێ ڕۆلی بانگەوازچی بگێڕێ، نەك لەبەرئەوەی شێوازی ئەو ڕوانینەی لەبیرچۆتەوە، بەلکو لەبەرئەوەی چیتر دەسەلاتی سیاسی پێویستی بەو ڕۆلەی ئەو نەماوە. دەسەلاتی سیاسی چیتر پێویستی بە ئایدیۆلۆجیا نەماوە بۆ چەسپاندنی جەبەروتی خۆی، بەلکو پێویستی بە هەندێ گەمەی تر هەیە لە دەرەوەی بازنەی ئایدیۆلۆجیا. ئەمڕۆ هاوکێشەکە پێچەوانە بۆتەوە، ئێستا ئەوە ڕۆشنبیرە هەولدەدا ئیعترافی دەسەلاتی سیاسی بباتەوە، لە کاتێکدا ئەوە دەسەلاتی سیاسی بوو کە دوێنێ لە خەمی بەدەستهێنانی شەرعیەتێکی ئایدیۆلۆجی ڕۆشنبیراندا بوو.

بەلام سەرەڕای ئەم شکستە گەورەیە.. تا ئێستاش ڕۆشنبیر سوورە لەسەر ئەوەی ڕۆلی بانگەوازچی و ڕاوێژکار ببینێ بۆ دەسەلاتی سیاسی.. تا ئێستا ڕەخنەی توندی ڕۆشنبیر لە دەسەلات لەبەرئەوە نییە کە دەسەلاتداران خراپ ڕەفتار دەکەن، بەلکو لەبەرئەوەیە کە گوێ لە ڕۆشنبیران ناگرن و

نەرجسیەتیان تێرناکەن.
ڕۆشنبیری ئەمڕۆ تا ئێستا بەخسیری وێنەیەکە کە دۆخی دوێنێ بۆی دروستکردووە، دۆخێك لەئارادا نەماوە.

ئەوەی ئەمڕۆ جڵەوی ڕۆشنبیر دەکات وەهمە نەك هۆشیاری، وەهمێك -لە ژێر کاریگەریی لەدەستدانی بەهەشتی دوێنێدا- ڕۆشنبیری توشی دۆخێکی سایکۆباتی ئەوتۆ کردووە کە ئیعتراف بە شکستی خۆی ناکا: شکستی وێنەو شکستی ڕۆڵ.

ئێستا هیچ دەرەتانێك لەبەردەم ڕۆشنبیراندا نەماوە جگە لە سەلماندنی ئەو شکستە، بەڵام لەبەرئەوەی ئیعتراف قورسترین هەڵوێستە لە دۆخێکی ڕۆشنبیری سیخناخ بە بانگەشەی حەقیقەتدا، ئەوا هەڵبژاردنی دووەم شتێك نیە جگە لە داخڵبوونی خەستەخانەیەك کە چەندین جۆر پەتای تێدایەو نەخۆشەکان لەنێو یەکتردا پەتا دەگۆڕنەوە.

یەکێك لەو پەتایانە بریتیە لە خودپەسەندی یان نەرجسیەت، کە زادەی جیاکردنەوەی ڕۆشنبیرە لە مرۆڤی ئاسایی، سەرەتای ئەو جیاکردنەوەیەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاکردنەوەی پیاوی ئاینی لە عەوامی خەڵك، یان جیاکردنەوەی باسەواد لە بێسەوادان. ڕەنگە ئەم پەتایە تەنها لەو کاتانەدا بەتەواوی خۆی ئاشکرا بکات کە دوو ڕۆشنبیر بەرامبەر یەك دەکەونە ململانێو کێشمەکێشمەوە، لەم حاڵەتەدا ڕۆشنبیری نەرجسی لەبری ئەوەی لەگەڵ بەرامبەردا بکەوێتە ڕەخنەو وتوێژەوە، دەکەوێتە خۆدواندن لە دیالۆگێکی ناوەکیدا کە کۆتایی نییە.

پەتایەکی تر چێژوەرگرتنە لە ئازاری بەرامبەر، واتە سادیەتی ڕۆشنبیری، لەم دۆخەدا ڕۆشنبیر کە دەسەڵاتی ئازاردانی جەستەیی بەرامبەری نییە، دەکەوێتە بریندارکردنی غروری ڕۆشنبیریی ئەو کەسەی کە ناکۆکە لەگەڵیدا. ڕەنگە ئەم جۆرە ڕۆشنبیرانە سەرەتا خۆیان وەك ڕەخنەگرێك، یان یاخییەك لە فیکری باو نیشانبدەن.. بەڵام لەبریەکهەڵوەشان و شیکردنەوەی ئەو فریزو وشانەی بەکاریدێنن دەیسەلمێنێ کە سەرچاوەی ڕەخنەکانیان شەڕانگێزییە نەك ڕادیکالیزمی فیکری، چونکە کاتێ ڕەخنەگری جدی دەکەوێتە قسە، سایکۆلۆجیای بەرامبەرەکەی نادوێنێ وەك ئەندامێکی خاوەن غرور لە کۆمەڵگادا.. بەڵکو فەلسەفەکەی دەدوێنێ وەك ئەندامی سیستمێکی کلتوری، کە زیاتر سیستمێکی گریمانەییە.

پەتایەکی تر، ماسۆشیەتی ڕۆشنبیرییە، کە زۆرجار تەواوکەری سادیەتە.. ڕۆشنبیری ماسۆشی ئەو کەسەیە کە زۆر دڵڕەقانە سزای بیروبۆچوون و فەلسەفەکانی دوێنێی خۆی دەدا، ئەم ڕۆشنبیرانە هەمیشە ڕابردووی خۆیان وەك گوناهێك و بارێکی قورس بەسەر شانی ئێستای ڕۆشنبیری خۆیانەوە دەبینن، کە پێیان وایە ئێستایەکی جوان و مەعریفییە.. بەڵام لەڕاستیدا ئەمڕۆش دەبێتەوە بە لەعنەت بەسەر سبەینێوە.. بەمشێوەیە سیناریۆی خۆسزادان بەردەوام دەبێت.

هەموو ئەم پەتایانەش نیشانەی هەمیشەیی پەتا سەرەکیەکەن کە بانگەوازچێتیە لەپێناو تێرکردنی نەرجسیەتداو وێناکردنی خود وەك بانگەوازچییەك، کە لە ڕاستیدا کەسایەتیەکی سادۆماسۆشی وێڵە بەدوای عەرشێکدا، کە ونی کردووەو هەرگیز نایدۆزێتەوە.

بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەم بانگەوازچیانە واز لە هاتوهاوار بێنن و بە بێدەنگی لەسەر تەختی شانۆ بکشێنەوە، تا دەرفەت برەخسێ لەبەردەم جیهانبینی مۆدێلێکی تری ڕۆشنبیردا لە سەردەمی بەسەرچوونی بانگەوازدا.

# تەكنیكی ڕەخنەگر لە 13 تێزدا

■ نووسینی: ڤاڵتەر بنیامین
● و: باران

1) لەجەنگی ئەدەبیدا ڕەخنەگر ستراتیژییە.

2) ئەوەی كە ناتوانێت لایەنگر نەبێتو بەلایەكدا نەیشكێنێتەوە، دەبێت بێدەنگ بێت.

3) ڕەخنەگر هیچ پەیوەندییەكی بە ڕاڤەكارانی سەردەمە ڕۆشنبیرییەكانی ڕابردووەوە نییە.

4) دەبێ ڕەخنەگر بە زمانی هونەردۆست "سنعەت" بدوێت، چونكە ئەو دەستەواژانەی لە كۆنفرانسەكاندا بەكاردەهێنرێن لە دروشم زیاتر نین. لە دروشمیشدا تەنها قریشكەی جەنگ دەبیسترێت.

5) دەبێ قوربانی بە بابەتیبوون بدرێت لە پێناوی لایەنگیریدا، ئەمە لە حاڵەتێكدا گەر ئەو مەسەلەیەی بەرگری لێدەكرێت شایەنی ئەوە بێت.

6) ڕەخنە كارێكی ئەخلاقییە. كاتێك گۆتە لە هەڵسەنگاندنی هۆڵدەرلینو كلاسیت، بتهۆفنو ژان پۆڵدا هەڵەی كرد، بەرپرسیاری یەكەم لەو هەڵەیە ئاكاری گۆتە بوو، نەوەك زیرەكیو دانایییە هونەرییەكەی.

7) بەلای ڕەخنەگرەوە هاوڕێكانی پاشخانی باڵان نەوەك جەماوەر، یاخود لانیكەم نەوەكانی داهاتوو.

8)نەوەكانی داهاتوو یا لەبیردەچنەوە، یا هەڵدێن. ڕەخنەگر تەنها لەبەردەم نوسەر (دانەر) دا دەمێنێتەوە.

9) گفتوگۆ مانای تێكشكانی كتێبێك بە هەندێ ڕستەی خۆی. ئەوەی دەتوانێت تێكشكێنەر بێت، هەر ئەوە كە دەتوانێت ڕەخنەگر بێت.

10) گفتوگۆی ڕاستەقینە بەهەمان ئەو خۆشەویستییەوە لە كتێبێك دەكۆڵێتەوە كە ئادەمیخۆرەكان بۆ قوتدانی كۆرپەیەكی ساوای ئامادە دەكەن.

11) حەماسی هونەریی شتێكی نامۆیە بە ڕەخنەگر، چونكە كاری هونەریی بەدەست ئەوەوە شمشێرێكی پرشنگدارە لە جەنگی ئەقڵەكاندا.

12) بەكورتی، دروستكردنی ڕەخنەگر توانای دارشتنی دروشمە بەبێ خیانەتكردن لە بیروڕاكان. چونكە دروشمەكانی ڕەخنەیەكی كەموكورت بیروڕاكان دەگۆڕێت بۆ تەنها مۆدەیەكو هیچی دیكە.

13) دەبێ جەماوەر بەردەوام بیسەلمێنێت كە هەڵەیەو لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەوە بكات كە ڕەخنەگر بەناوی ئەوەوە دەدوێت.

**تێبینی: ئەم بابەتە لە گۆڤاری "فرادیس"ەوە وەرگیراوەو، "أ. ك. الجنابی" وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی.**

# ڤی. ئێس. نایپول و خەڵاتی نۆبڵی 2001

● سەردەم

ئەکادیمیای سویدی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ئەمساڵ (*2001*)ی دا بە نووسەری ئینگلیز (ڤی. ئێس. نایپول)و رایگەیاند کە هۆی بەخشینی ئەم خەڵاتە بە نایپول ئەوەیە کە ئەم نووسەرە توانیویەتی زمانو دیالێکتە ناوخۆییەکان بەجۆرێك تەوزیف بکات کە هانی خوێنەران دەدات تا بە روونی رووداوەکانی رابردوو ببینن. بڕی خەڵاتەکەش یەك ملیۆن دۆلارە.

ڤی. ئێس. نایپول لە ساڵی **1932**دا لە دوورگەی ترینیداد لە دەریای کاریبی هاتۆتە دنیاوەو ساڵی **1950** دەچێت بۆ بەریتانیاو، لە ساڵی **1957**ەوە دەست بە بڵاوکردنەوەی چیرۆكو رۆمانەکانی دەکات.

یەکێك لە رۆمانە بەناوبانگەکانی رۆمانی (خانوویەك بۆ مستەر بیسواس)ە کە لە ساڵی **1961**دا بەچاپی گەیاندووە. پاشان لە ساڵی **1971**دا خەڵاتی بۆکەر دەدرێ بە کتێبێکی کە رۆمانێك و چوار چیرۆکی گرتۆتە خۆو ناوی "لە دەوڵەتێکی ئازاددا"یە. هەندێك هەن کە نایپول بە میراتگری رۆماننوسی ئینگلیز جۆزیف کۆنراد دەزانن کە لە کارەکانیدا وەسفی ئەو ئیمپراتۆریەتانە دەکات کە بەرەو نەمان دەچن. هەروەها ئەکادیمیای سویدی دەڵێت کە نایپول کۆمەڵێك



یادەوەری و وردو درشتی رووداوەکانی رابردووی بەجۆرێك لەیاد ماوە کە خەڵکی دی بیریان چووەتەوە.

تەوەری رووداوەکانی نایپول سنووری دوورگەکانی ترینیداد تێدەپەڕێنێت، ئەو دورگانەی بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی هەندێ لە کارەکانی دەژمێردرێن. هەروەها بابەتەکانی مۆرکێکی جیهانیان بەخۆوە گرتووە. گەرچی کاتێ ئەکادیمیای سویدی بەخشینی خەڵاتەکەی بە نایپول راگەیاند، کاردانەوەیەکی سەیر لە رۆژنامە عەرەبیەکاندا بەدی کراو، هەندێ لە نووسەرانی ئەو رۆژنامانە گومانیان لە رەوایەتی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ کرد بە نایپولو، ئەوەیان خستە روو کە نەدەبوو ئەکادیمیای سویدی لەم دۆخە ناسکەدا ئەو خەڵاتە بدات بە نووسەرێك کە (بە بۆچوونی نووسەرە عەرەبەکان) قورسایی بۆ عەرەبو ئیسلام دانانێت. هەر بۆ نموونە رۆژنامەی "ئەلشەرق ئەلئەوسەت" کە لە لەندەن دەردەچێت لە لاپەڕەی یەکەمیدا بەم شێوەیە گوزارشتی لە رووداوەکە کرد: "خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب بۆ نووسەرێك کە خەڵکی ترینیدادەو دژی ئیسلامە" هەر لەو هەواڵەدا هاتووە کە "بەر لە دە رۆژ نایپول ئیسلامی بەوە مەحکوم کرد کە لە ئیمپریالیزم خراپترە، لەبەرئەوەی گرنگی بە خودی تاکە کەس نادات و ئەفەرۆزی دەکات".

شایانی باسە کە ژمارەیەکی کەم لە کتێبەکانی نایپول کراون بە عەرەبیو فارسی (هەڵبەت پێویست بەوە ناکات کە بڵێین وەکو زۆربەی زۆری نووسەرە گەورەکانی دونیا هیچی نەکراوە بە کوردی). دواجاریش دەپرسین ئاخۆ وەکو هەندێ لە نوسەرە عەرەبەکان دەڵێن بە تەنها هۆیەکی سیاسی لە پشت بەخشینی نۆبڵی ئەمساڵەوە هەیە بە نایپول؛ یان ئەم نووسەرەش وەکو هەر داهێنەرێکی گەورە خاوەنی کۆمەڵێك نهێنیو تایبەتمەندییەو لەبەرئەوەی کارەکانی تەرجەمە نەکراون نەتوانراوە پەی بەو جوانییانەی ببرێ؟

# Sardam

**Foreign culture magazine**

No. 17 OCT. 2001 VOL. 3

Concessionaire:
**Sherko Bekas**

Editor-in – chief :
**Raoof Begard**

Editing Director :
**Azad Berzinji**

Editorial Staff :
**Rebeen Hardi**
**Shwan Ahmed**
**SHAHO SA'EED**

Art production work :
**Kadir Meerkhan**



Sardam Printing & Publishing House